# گوڵبژێرێك

## له وتاره‌كانی شه‌هید

# مامۆستا عبدالله قه‌سری

به‌شی دووه‌م

چاپی یه‌كه‌م

كۆكردنه‌وه‌ی

**بوخاری عبدالله**

پێداچوونه‌وه‌ی

**م.حسن بابكر**



2010ز-1431ك

# گوڵبژێرێک لە وتارەکانی شەهید

# ماموٚستا عبداللە قەسرێ

بەشی دووەم

ئامادەکردنی: بوخاری عبد الله

پێداچوونەوەی: م. حسن بابکر

هەولێر – ٢٠١٠

**ناوی کتێب: گوڵبژێرێك لە وتارەکانی شەهید مامۆستا عبداللە قەسری**

- ئامادەکردنی: بوخاری عبد اللە
- پێداچوونەوەی: م. حەسەن بابکر
- نەخشەسازی ناودوە: شاخەوان عزیز
- بەرگ: ڕێبوار
- بەشی دووەم
- چاپی یەکەم _٢٠١٠

شوێنی بڵاوکردنەوە: (( کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی ))

لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی: ١٦٨ ی ساڵی ٢٠١٠

بڵاوکراوەی کتێبخانەی

**حاجی قادری کۆیی**

بۆ فرۆشتن و چاپکردن و بڵاوکردنەوە

هەولێر – کوردستان – عراق

( ٠٦٦ ٢٢ ٢٣ ٨٦٨ - ☎ / ٠٧٥٠ ١١٨ ١٩ ١٩ – / ٠٧٥٠ ٤٦٧ ١٣ ٩٤ )

## بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا ﴾ الاحزاب/٢٣.

## پێشکەشە

- به گیانی شەهید مامۆستا عبداللە قەسرێ و هاوەڵانی.
- بە دایکی بەسۆزم.
- بە سەرجەم بانگەوازکارانی ڕێگای خوا (سبحانه وتعالى).
- بە خوێنەرانی بەڕێز و سەنگین.

# پێشەکیی ئامادەکار

زۆر سوپاس و ستاییش بۆ خوای بەرزو میهرەبان کە بە یارمەتیی و ڕێنوێنی پڕ لە لوتفی ئەو توانیمان ئەم بەشی دووەمەش بەچاپ بگەیەنین لە (گوڵبژێرێك لە وتارەکانی شەهید مامۆستا عەبدولاٚی قەسریٚ).

ئەم کارو پرۆژەیەمان بریتی یە لە نوسینەوەو خستنەسەرکاغەزی بەشێکی زۆری وتارەکانی باوکی شەهیدم کە لەشێوەی (گوڵبژاردن) و زنجیرەچاپ دەیخەینە بەردەستی خوێنەرانی ئازیزەوە، بۆیە بە پشتیوانی خوا هەوڵدەدەین ئەم بەرگەی بەردەستتان بەرگی تر بەدوای خۆیەوە بهێنی إن شاءالله، لەگەڵ ئاماژەش بەوەی کە وتارەکانی ئەم گوڵبژێرە دەقاودەق نەقلی سەرکاغەز نەکراون بەڵکو مامۆستا حەسەن بابەکر بەدەستکارییەوە پێداچونەوەی بۆکردوون و دواتر لەشێوەی دەقی نوسراو دا دارێژراونەتەوە.

وە لەڕاستیدا پێوستە لەناخمەوە بڵێم "سوپاس" بۆ ئەو هەموو هاندان و دڵپەرۆشی و دڵسۆزییەی کە دایکی ئازیزم نواندی لە ئاقار نەنجامدانی ئەم کارەمدا، وە دوعا خوازیشم خوای میهرەبان تەمەن درێژی بکات و لە دونیاو دوارۆژی دا سەرکەوتوو بیٚ.

نیدی بەو ئومێدەین کە ئەم کتێبە ببێتە توێشوویەکی قیامەتیی بەنرخ بۆ هەمووماں و خوێنەرانیشی بەئەندازەی پێویست لێی بەهرەمەند بن.

بوخاری
٢٠٠٩\١٢\١٩
هەولێر

# پێشەکی مامۆستا عەلی باپیر

الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على رسول الله محمد وآله أجمعين من الصَّحبِ والازواج والقرابة والتابعين لهم بإحسان الى يوم الدين.

یەکێك لە یاساکان (سُنَن)ی خوا کە لە ژیانی بەشەردا دایناون ئەوەیە، کە هەر کاتێك مرۆڤ بوو بە بەندە (عَبدْ)یەکی بۆ خوا صوڵحاوو خۆی بە ئیمان و کردەوەی چاك رازاندەوە، خوای بەبەزەیی و کاربەجێ لەلای خەڵکی ئاسمان و زەوی خۆشەویستی دەکات و رێزو حورمەتی بۆ پەیدا دەکات، وەك فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ الرَّحْمَنُ وُدًّا﴾ ٩٦- مريم، واتە: بێگومان ئەو کەسانەی ئیمانیان هێناوە و کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن؛ خوای خاوەن بەزەیی خۆشەویستییان بۆ دەرەخسێنێ.

پێغەمبەری خواش ﷺ لەو بارەوە فەرموویەتی: (إنَّ اللهَ تَعالى إذا أَحَبَّ عَبداً دَعا جِبريل فَقال: إنّي أُحِبُّ فلاناً فأحببهُ فيُحِبُّهُ جِبريلُ ثُمَّ يُنادي في السَّماء فَيَقول: إنَّ اللهَ يُحِبُّ فلاناً فأحِبّوهُ فَيُحِبهُ أهلُ السَّماء ثُمَّ يوضَعُ لَهُ القُبولُ في الارض) متفق عليه عن أبي هريرة.

واتە: بێگومان هەر کات خوا بەندەیەکی خۆشویست بانگی جوبرائیل دەکات و پێی دەفەرموێ کە من فلانە کەسم خۆش دەوێ تۆش خۆشت بوێ، جوبرائیلیش خۆشی دەوێ، پاشان جوبرائیل لە ئاسمانێ بانگ دەکات کە: خوا فلانەکەسی خۆش دەوێ ئێوەش خۆشتان بوێ، ئیدی خەڵکی ئاسمانیش (کە فریشتەکانن) خۆشیان دەوێ، پاشان خۆشەویستی و قبوڵکرانی بۆ دەخرێتە سەرزەویش...

هەروەها (عبداللە ی کوڕی عەبباس) خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ گوتوویەتی: (إن للحسنة نوراً في القلب وضياءً في الوجه وقوة في البدن وسعة في الرزق ومحبةً في قلوب الخَلق)، واتە: بەڕاستی چاکەکردن مایەی رووناکی نێو دڵ و گەشیی ڕوو و هێزی جەستە و فراوانیی بژێو و خۆشویسترانە لە دڵی خەڵکیدا، جا من پێموایە کە

برای خۆشەویستمان (مامۆستا عبداللە) قەسریێ ی شەهید -ان شاء الله تعالى- هەرچەندە بەس خوا پەنهانزانە و بە بەندەکانی ئاشنایە، یەکێك بوو لەو جۆرە بەندانەی خوا کە خوای بەخشەر قبووڵ و خۆشەویستی و ڕێز و حورمەتی بۆ خستبووە دڵ و دەروونی خەڵکییەوە و لەهەر کوێیەك بووبێ خەڵکی دەوروبەری خۆشیان ویستوە و حەزیان بە تێکەڵیی و نزیکی کردوە، هەر بۆیەش کاتێك کە خۆی و چوار پێشمەرگە حیمایەکەی بەناهەق کوژران و هەواڵەکە بەنێو خەڵکی کوردستاندا بڵاوبۆوە مەگەر چۆن دەنا هەرماڵێك ئاشنایەتییان بەو مامۆستا دیندار و دڵسۆزە بووبێ تازیەیان بۆ گرت و بۆی خەمبار و دڵتەنگ بوون.

ئینجا دیارە هۆکارێکی گرنگی لەسەر ئاستێکی فراوان ناسران و خۆشویسترانی (مامۆستا عبداللە)ش بریتی بوو لە وتارەکانی کە هەفتانە لە مزگەوتی مەڵبەندی رانیە راستەوخۆ پێشکەشی خەڵکێکی زۆری (ڕانیە)و دەوروبەری دەکردن و، پاشان لەڕێی کەناڵەکانی راگەیاندنەوە بە زۆربەی شار و شارۆچکە و گوندەکانی کوردستاندا پەخش دەبوون، هەر بۆیەش کاتێك هاوسەر و کوڕەکانی مامۆستا راوێژیان پێکردم و بیرۆکەی کۆکردنەوەی گوڵبژێرێکی وتارەکانییان خستەڕوو، پشتگیریم کردن و ڕێنماییشم کردن کە چۆن چۆنی بەو کارە هەڵسن.

جا خوێنەری بەڕێز!

ئەم کتێبەی بەردەستت گوڵبژێرێکی وتارەکانی (مامۆستا عبداللە)ی قەسرێیە کە کاکە (بوخاری) کوڕی ژیرانە و چالاکانە لە کاسێتەوە هێناونیە سەر کاغەز و تایپی کردوون و ئایەت و فەرموودەکانیشی (تخريج) کردوون و، برای بەڕێزیشم (مامۆستا حسن بابکر) کاتێکی باشی تەرخان کردوە بۆ چاوپێداگێڕانەوە و وردە دەستکارییەکی هەندێك وشەو رستەش کە جیاوازی نێوان شێوازی ئاخاوتن و نووسینیش دەیخوازێ، هەر چەندە مۆرکی شێوازی ئاخاوتن و وتاردان هەر ماوەتەوە و دەستکاریی نێوەڕۆکی وتارەکانیش نەکراوە.

خوا پاداشتی ماموٚستا حسن بابکر و کاکە بوخاریش بداتەوە و ئەم بەرهەمەش بکاتە مایەی بەرچاوڕوونی زیاتری مسوڵمانان، تاکو (ماموٚستا عبداللە)ش لەم ڕێیەشەوە خێر و پاداشتێکی دیکەی بۆ بچێ وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (إذا ماتَ الانسان انقَطَعَ عَمَلُهُ إلا مِن ثَلاث: صَدَقَة جارية أَو عِلمٌ يُنتَفَعُ بِهِ أو وَلَدٌ صَالِحٌ يَدعُو لَهُ) رواه مسلم.

واتە: مرۆڤ کە مرد کردەوەی (چاکی) دەبڕێ مەگەر لە سێ ڕێیانەوە: خێرێکی درێژخایەن و بەردەوام، یان زانیارییەك کە کەڵکی لێوەربگیرێ، یان منداڵێکی چاك کە بۆی دەپاڕێتەوە.

جا ئومێدم وایە ماموٚستا عبداللە لەهەر کام لەم سێ ڕێیەوە خێر و پاداشتی بۆ بچێ، چونکە: ١- (کۆمەڵی ئیسلامی) کە ماموٚستا مەلا عبداللە یەکێك بوو لە مشوورخۆرانی ماندوو و دڵسۆزی، پڕۆژە و خێرێکی بەردەوامە و، ٢- وتارەکانیشی سوپاس بۆ خوا شتێکی زۆر چاك و بەسوودیان تێدایە و هەتا ئێستا لە تەلفزیۆن و ڕادیۆیەکانی کۆمەڵی ئیسلامییەوە سوودی باشیان لێ بینراوە و لەمەودواش ئەم گوڵبژێرەیان بەشێوەی کتێبیش دەکەونە بەردەستی خوێنەران، ٣- وە لە خوا بەزیادبێ منداڵەکانیشی خواناس و باشن و هیوای چاکتربوون و گەشەکردن و بەرەوپێشچوونیشیان لێ دەکرێ، کە بێگومان دایکیان خوا پاداشتی بداتەوە، لەو بارەوە کاریگەریی زۆری هەیە.

خواش بە کەرەم و بەزەیی بێ سنووری خۆی پلەوپایەی ئەو برا دڵسۆز و خۆشەویستەمان بەرزتربکاتەوە و دامەزراویی و ڕاوەستاویی زیاتریش بە هەموو لایەکمان ببەخشێ و سەرەنجامان خێر بکات.

**عەلی باپیر**

## بسم الله الرحمن الرحيم

* ئەم بەشی دووەمی (گوڵبژێرێك لـە وتارەکـانی شـەهید مامۆسـتا عبـداللە قەسریّ) کە ١٤ چواردە وتاری لەخۆ گرتـوە، بەهـەمان شـێوەی بەشـی یەکـەم تەنیا وتارەکانی یەکەمی ڕۆژانی جومعەن، کە ناوبراو لەچەند کاتێکی جیاوازدا پێشکەشی کردوون.

* بە مەبەستی ڕێکخـستنی زیـاترو گواسـتنەوەی لـە مەیـدانی وتـاردەوە بـۆ ڕووپەڕی کتێب، بە پێویست زانراوە لە هێندێك شـوێنان کـە شـێوازی نووسـین دەیخوازیّ دەستکاری هێندێك وشەو بڕگە بکریّ.

* بەهۆی لێزانی مامۆستاو چێژی تایبەتی وتارەکانی، کە بەشی یەکەم کەوتـە بازاڕەوە لە ماوەیەکی کورتدا لە کتێبخانەکان تەواو بـوو، بـەو ئومێـدەی ئـەم بەشی دووەمـەش بەرەکەتـدارو جێـی سـودی خـەڵکی بـیّ و بـۆ مامۆسـتای شەهیدیش مایەی گرانتر بوونی تا تەرازووی خێرەکانی بیّ لە قیامەتدا.

**حسن بابکر**

## کوشتنی بەناهەق

تێبینی/ ئەم وتارە دواهەمین وتاری ماموّستای شەهیدە کە لە بەرواری ٢٠٠٣/٢/٢٨ز پێشکەشی کردووە، واتە چوار رِۆژ بەر لە شەهید بوونی.

### بسم الله الرحمن الرحيم

إنَّ الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونستهديه، ونعوذ بالله مِن شرور أنفُسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضِلَّ له ومن يضلل فلا هادي له، ونشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له ونشهد أنَّ سيدنا ونبينا محمداً عبده ورسوله، هذا الرسول الذي بلَّغ الرسالة وأدى الأمانة ونصح الأمة وجاهد في الله حق جهاده وتركنا على الحجة البيضاء، ليلها كنهارها، لايزيغ عنها إلا هالك، صلواة اللهِ وسلامه عليه وعلى أله وأصحابه، ومن تبعه الى يوم الدين ...، أما بعد يا عبادالله أوصيكم ونفسي أولاً بتقوى الله وطاعته، فإنّ اللهَ مع الذين اتقوا والذين هم محسنون، قال الله سبحانه وتعالى في كتابه الحكيم، بسم الله الرحمن الرحيم: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ (١) النساء.

سوپاس وستایش بۆخوای پەروەردگار، درودو سەلام و بارانی رِەحمەت بباریّ بۆسەرگیانی پاکی پێغەمبەرمان محمد ﷺ وە بۆسەرگیانی شوێنکەوتوانی لەئومەتەکەی هەتا رِۆژی قیامەت.

خۆشەویستەکان..ئیماندارانی بەڕێز:

یەکێك لەو گوناهە گەورانەی کەئینسانی مسوڵمان پێی دەچێتە جەهەننەم و پێی تاوانبارو گوناهبار دەبێت لای خوای پەروەردگار، بریتی یە لە(کوشتنی بەناهەق)، دیارە گوناهی گەورە زۆرن، (کوشتنی بەناهەق) یەکێکە لەوگوناهە گەورانە کەئینسان بامسوڵمانیش بێ، با نوێژکەرو ڕۆژووگریش بێ، با ئەهلی جومعەو جەماعەتیش بێ، باحەجی ماڵی خواشی کردبێ، بەڵام بەهۆی ئەوگوناهەوە دەچێتە جەهەننەم!!!.

بەڵێ، زۆرن ئەوانەی کە سوود لە نوێژو ڕۆژووەکانیان نابینن!، سوود لە عیبادەتەکەیان وەرناگرن!، زۆرن ئەوانەی کە ماندوبوونیان بە هەدەر دەڕوات، چونکە وەك پێویست ئەنجامی نادەن و لەگوناهیان ناگێڕنەوە، وە لە ئەنجامی ئەو گوناهە گەورەیەدا لەڕۆژی قیامەت خەجاڵەتی بەردەستی خوادەبن(جل جلاله)!. شەرمەزاری مەحکەمەی ئیلاهی ڕۆژی قیامەت دەبن، لەبەرئەوە پێویستە ئێمەی مسوڵمان بزانین و لە دینەکەی خۆمان شارەزابین، بزانین کوشتنی بەناهەق چەندە گەورەیە و تاوانەکەی چی یە؟!، حوکمەکەی لە ئیسلامدا چی یە؟، چ کاتێك ئینسان دەبێتە قاتیل؟، چەند جۆری هەیە قاتیل؟، بابزانین و وریابین و وشیاربین بۆئەوەی لێمان تێکنەچێ و نەکەوینە ئەو تاوانەوە!، شەرمەزاری مەحکەمەی پەروەردگار نەبین و، ماندوبوونی دونیامان بەهەدەر بڕوات!، خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلاَّ خَطَئًا﴾ (٩٢) النساء، واتە: بۆ هیچ مسوڵمانێك نییە هیچ مسوڵمانێك بکوژێ تەنها بەهەڵە نەبێ، کەواتە حەڵاڵ نییە هیچ مسوڵمانێك بەنیازی کوشتن چ بە گوللە بێ، وە چ بە هەرشتێکی تر نیازی کوشتنی ئیماندارێك بکات تەنها بە هەڵە نەبێ!، - ئەوە کە دوایی دێمەسەری چۆنە بەهەڵە- ،پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (إنَّ اللهَ وضَعَ عَن أُمَّتي الخَطَأ

والنِّسيان وما استُكرِهُوا عَلَيهِ)[١] فەرمووی: خوای گەورە گوناهی سێ شتانی لەسەر ئوممەتەکەی من لابردووە، لە سێ شتان لێیان ناگرێ و عەفووی کردوون: یەکەمیان: (الخَطَأ) واتە شتێك بەهەڵە بیکات، لەدەستی دەربچێت، ئاگای لێ نەبێ...، ئەوە بەهەڵەیە!، دووەم: (والنِّسيان) لەبیری بچێ، لەبیر چوونەوە هەیە لە گوناهو هەڵەدا، لە توشبوونی حەرامدا، ئەوە کە نەزانی حەرامە یان لەبیری چوبۆوە، سێ هەم: (وما استُكرِهُوا عَلَيهِ) شتێك به زۆر پێت بکەن!، تۆبزی و جەبریت لێ بکەن، ئەوکاتەش خوای پەروەردگار لێتناگرێ ئەگەر دەستەلاتی نەکردنیت نەبوو، رزگاربوونت نەبوو.

بەڵێ خۆشەویستەکانم، سێ شت خوای پەروەردگار لێتناگرێ، ئەوەش عەدالەتی خوای پەروەردگارە! کەخوای گەورە ئەگەر تۆ شتێکت بەهەڵە کرد، حەرامێکت بەهەڵەخوارد، کەسێك بەهەڵە توشی ئازاربوو بەدەستی تۆ، لێت ناگرێ! بەهەڵە یان بەلەبیرچوونەوە یان ئەگەربەزۆرپێتبکرێ، ئینجا باتێمەی مسوڵمان لەژێرسێبەری ئایەتێکی قورئانی پیرۆزدا کەمێك بەوردی تەماشاکەین بزانین تاوانی کوشتنی بەناهەق چەندە وە کوشتنی بەناهەق چۆنە وە کێن ئەوانەی کەدەبنە قاتیل ی بەناهەق؟، خوای پەروەردگار(جل جلاله) دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا﴾ (٩٣) النساء، با بەوردی تەماشای تەفسیری ئەوئایەتە پیرۆزە بکەین، ئایەتێکە کەهەموو ئینسانێکی مسوڵمان دەبێ دڵی بلەرزێ، دەبێ بترسێ، دەبێ باش تەماشای بکات، دەبێ گوێی دڵەکانی بۆبکاتەوە، بزانێ و تێی بگا، بزانێ مەبەستی خوای پەروەردگار لەوئایەتەدا چی یە؟ بۆئەوەی بەهەڵەدانەچین، تەماشابکە سەرەتا بەکورتی تەفسیری ئایەتەکە دەکەین، پاشان چەند خاڵێك وچەند دەرسێك لەو ئایەتە وەردەگرین:

[١] سنن ابن ماجة، كتاب الطلاق، باب: طلاق المكره والناس، رقم الحديث ٢٠٤٥

دەفەرموێ: هەرکەسێك، جا مسوڵمان بێ یان نا مسوڵمان بێ! ئەو مسوڵمانە پارێزکار(مُتقي) بێ یان تەنها ئیمانێکی رووتی هەبێ، پیاو بێ یان ئافرەت، هەرکەسێك ئیماندارێك بەناهەق — بە ئەنقەست- بکوژێ و دەستی لە کوشتنی مسوڵمانێکدا هەبێت: (فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ) عیقابەکەی جەهەننەمە!!، (خَالِدًا فِيهَا) تێیدا دەمێنێتەوە لەو جەهەننەمەدا، (وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ) وە خوا غەزەبی خۆیشی بەسەردا دەبارێنێ و لێی توڕەدەبێ!، (وَلَعَنَهُ) لەعنەتیشی لێ دەکات، دووری دەکاتەوە لەڕەحمەتی خۆی، (وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا) وە سزایەك و عەزابێکی زۆر گەورەشی بۆ ئامادە دەکات لە جەهەننەمدا، ئەوە تەفسیری ئایەتەکە بەکورتی، با تەماشا بکەین!:

لێرەدا ئەگەر بە وردی تەماشابکەین خۆشەویستەکانم، لەچەند وشەیەکدا دەرسی زۆر گەورە وەردەگرین:

یەکەمیان: دەفەرموێ: {وَمَن}هەرکەسێ!.

کەواتە ئەگەر کچی پێغەمبەریش ﷺ ئەو تاوانە بکات ئەو حوکمە دەیگرێتەوە، بۆیە نالێین کوڕی پێغەمبەر ﷺ، چونکە کوڕی گەورەی نەبووە!، ڕۆژێکیان پێغەمبەرﷺ بە فاتیمەی کچی فەرموو: پشت بەمن مەبەستە بۆ ڕۆژی قیامەت و بۆخۆت کاربکە!، من لە هانات نایێم لە ڕۆژی قیامەت ئەگەر کردەوەی باشت نەبووبێ!، فەرمووی: (لو أنَّ فاطمَةَ بنت مُحَمَّدٍ سَرَقَت لَقَطَعَ مُحَمَّدٌ يَدَهَا)[٢] ئەگەر فاتیمەی کچی پێغەمبەر ﷺ کە خۆشەویستی پێغەمبەر بووە ﷺ دزی بکات پێغەمبەر دەستی دەبڕێ!، دیفاع لە حەرام ناکات با لە کچی خۆیشی دا بێت!، لەبەرئەوە هەرکەسێك بێت، خوای گەورە لێرە بە نەزانراو(نکرة) ی هێناوە (مَن: هەرکەسێك)، پاشان دەفەرموێ: (يَقْتُل) بکوژێ، بێ بە سەبەبی کوشتنی ئیماندارێك (مُؤْمِنًا)، تەماشابکە:

[٢] صحيح البخاري، كتاب الأنبياء، باب: حديث الغار، رقم الحديث ٣٢٨٨

نەیفەرموو(مُؤْمِنًا مُتَّقِياً) ئیمانداڕێکی بە تەقوا!، نەیفەرموو: (عالِماً) زانایەك! یان نەیفەرموو: (مُجاهِداً)!، فەرمووی: (مُؤْمِنًا) هەر ئیماندارێك بێ، جا ئیمان قابیلی بەرزی و نزمی یە، دەکرێ بڵێین کەسێکی ئیماندار ئیمانی زۆر بەهێزە کەسێکیش ئیمانی زۆر لاوازە کە تەنها ئیمانی هەیەو کردەوەی نییە!، یانی دروست نی یە و حەرامە هیچ مسوڵمانێك نیازی کوشتنی ئیماندارێکی هەبێ با ئیمانیشی لاواز بێ!!.

مادام پێی بگوترێ (ئیماندار)، باوەڕی بەخوا هەیە، باوەڕی بە ڕۆژی قیامەت هەیە، باوەڕی بە پێغەمبەران هەیە(علیهم الصلوات والسلام) باوەڕی بە کتێبە ئاسمانیەکان هەیە، باوەڕی بە زیندووبوونەوەو بەهەشت و جەهەننەم هەیە، باوەڕی بە قەزاو قەدەر هەیە، ئیماندارە، ئەگەر عیبادەتی زۆریشی نەبێ مادام ئیماندارە نابێ بیکوژی!.

ئەوجارە لە دەرسی سێهەم سەرنجبدە: (مُتَعَمِّداً) واتە بە ئەنقەست بیکوژێ، زانایان دەفەرموون: سێ جۆرە کوشتن هەیە، هەندێکیان دەفەرموون دوو جۆری هەیە، ئەوانەی کە ئەفەرموون دوو جۆری هەیە: دەفەرموون کوشتنی بە ئەنقەست هەیە، کە کەسێك بە مەبەستی کوشتن و بەشتێك کە پێی دەکوژرێ نیازی کوشتنی کەسێکی هەبێ، جا چ بە سیلاح لێی بدات، بە شمشێر لێی بدات، بە چەقۆ لێی بدات، بە ئاگر بیسوتێنێ، یان بەردێکی گەورەی لێبدات، ئەوە بەشتێکی وا کە غالیب وایە بەوشتە ئەو ئینسانە دەمرێ ئەوە پێی دەگوترێ (قَتلُ العَمد) کە بە ئەنقەست و بەنیازی کوشتن لێی داوە، وە بەشتێك کە پێی دەکوژرێ، ئەوە بە نانقەستە!، وە ئەفەرموون (خَطَأ) هەیە، ئەویش ئەوەیە تۆ بەنیازی خۆت شتێکت کردۆتە هەدەفی خۆت جا ئەگەر گوللەبێ، ئەگەر تیرێك بێ، یان بەردێك بێ یان چەقۆیەك بێ دەیهاوێژی بەلام لەپشتەوە نازانی کەسێك لەوێیە (پیاوێك یان ئافرەتێك لەوێیە) یەکسەر لەنیشانەکەی

خۆت ڕەتدەدەی دەچیٚ لەپشتەوە ئینسانێك دەكوژێ و تۆش ئاگات لیٚ نیە كـە ئەو ئینسـانە لەوێیە!، تۆ لەوت نەگرتبوو بەلاٚم بەو كەوت، ئەوە پێی دەگوترێت (هەڵە)، دیارە وەكو باسمانكرد خوای پەروەردگار ئەو ئینسانە ناكات بە قاتیـلی بە ئانقەست بەلاٚم دەبیٚ كـەفارەت بـدات وەهـەم خـوێنیش بـدات!، زانایـان هەندێكیان فەرمووویانە: جۆرێكی تریش هەیـە ئـەویش پێـی دەگـوترێ (عَمـدُ الخَطَأ) یان (شبه عَمْـد) ئەوەیان كە كەسێك بـە گۆچـانێك یـان بەبـەردێك، بـە دارێك، یان بەدەست یان بـە هەرشـتێك كـە عادەتـەن كەسـی پێنـاكوژرێ لـە ئینسانێك بدات بەلاٚم ئەو ئینسانە بمرێ، ئەوەش هەیە، بـەلاٚم دیـارە هەنـدێك دەفەرمون تەنها دووە، یان بەئەنقەستە یان بەهەڵەیە، جاهەرچۆنێك بێت ئێمـە باسی كوشتنی بەئەنقەست دەكەین، كەسێك مـسوڵمانێك بەئانقەست بكـوژێ و كوشتنـەكەی پیٚ حـەلاٚل بـیٚ ئـەوكات كـەفارەتی لەسـەرنی یـە بەڵكوعـەزابی جەهەننەمی بۆ ئامادەكراوە! چونكە بەو حەلاٚلكردنەی پێی كـافر بـووە، بۆیـە خوای پەروەردگار فەرموی: (فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا)، جـا تەماشـابكەن ئـەو ئینسانەی كەمسوڵمانێك دەكوژێ جەزای چی یـە، خـوای پـەروەردگار بـەپێنج دەرەجە عقوبەی ئەوجۆرە قەتڵەی داناوە كە زۆر گەورەیە!:

یەكـەمیان: دەفـەرموێ (فَجَـزَآؤُهُ جَهَـنَّمُ) شـوێنەكەی جەهەننەمـە، چ جەهەننەمێك؟ (ذاتُ لَهَبْ) جەهەننەمێك كە بلێسەدارە!، جەهەننەمێك كەلـەو ڕۆژەوە خوا خەڵقی كردوە دەسوتیٚ وگەرم دەبیٚ!!، جەهەننەمێك كـە نـاوی دیٚ لەدونیا ئینسانی مسوڵمان لێی دەترسیٚ!، نابیٚ ئینسان ئەوەنـدە بـیٚ ئاگـابیٚ، ئەوەندە نەفام بـیٚ، بەئاسـانی خـۆی توشـی ئـەو جەهەننەمـە بكـات بـەهۆی قەتڵێكەوە!، (فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ) عقوبەی ئەوئینسانە كەقەتڵی بەئەنقەستی كـردووە جەهەننەمە!، جا نەك هەرجەهەننـەم، بـەڵكو دووەمیـان: تێیـدا دەمێنێتـەوە بەئەبەدی، واتا وەختێك ئەوئینسانە كەسێك دەكوژێ و بەحەلاٚلی بزانیٚ و پێـی

وابێ دروستە ئەو مسوڵمانە بکوژێ، ئەوە پێی کافر دەبێ!!، چونکە بەحەلاڵی زانیوە، هەرکەسێك کوشتنی مسوڵمانێك بەحەلاڵ بزانێ پێی کافر دەبێ و لەدین دەچێتە دەرێ و هیچ پەیوەندی بەدینی محمدﷺ نامێنێ، وەپێشی دەچێتە جەهەننەم، {خَالِدًا فِيهَا} تێیدا دەمێنێتەوە بەئەبەدی مادام بەحەلاڵی بزانێ، سێیەمیان دەفەرموێ: {وَغَضِبَ اللّهُ عَلَيْهِ}، -پاش ئەوەی کە دەچێتە جەهەننەم، پاش ئەوەی کەتێیدا دەمێنێتەوە- خوای پەروەردگار غەزەبی خۆی بەسەردا دەبارێنێ، ئینسانێکیش خوا لێی توڕەببێ عەزابی دەدا بەجەهەننەم بەئاگرێك کەخۆی دروستی کردووە، دیارە خوای پەروەردگار عقوبەی قەتلی ئاوا داناوە بۆئەوەی ئینسان خۆی لێ دوورکاتەوەو لێی بترسێ پێش ئەوەی کە توشی ببێ و حیساب بۆ ڕۆژی قیامەت و پاشەڕۆژی خۆی بکات. ئینجا دەفەرموێ: (وَلَعَنَهُ) لەعنەتیشی لێدەکات، لەعنەت لێ کردن یانی دەرکردن لە ڕەحمی خوا، چۆن خوای پەروەردگار شەیتانی دەرکردووە کاتی خۆی کە سەجدەی بۆ ئادەم نەبردووە تاواش ئەو ئینسانە دەردەکات لە ژێر ڕەحمەتی خۆی و دووری دەکاتەوە لە ڕەحمەتی خۆی و بەچاوی ڕەحمەت تەماشای ناکات!، لە مەحکەمەی ڕۆژی قیامەتدا غەزەبی خۆی لێ دەگرێ و لەعنەتی لێدەکات، ئینجا دەفەرموێ: (وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا) وە عەزابێکی گەورەی بۆ ئامادەکردووە!، تەماشاکەن: کەسێك کەسێکی ئیماندار بە ئەنقەست بکوژێ پاشەڕۆژی چۆنە (جەهەننەم) و تێیدا دەمێنێتەوە! پاشان خوا غەزەبی خۆی لێدەگرێ! پاشان لەعنەتی لێدەکات! پاشانیش عەزابێکی بە ئێشی لە جەهەننەم بۆ ئامادەکردووە.

خۆشەویستەکانم، بۆچی سزای قەتڵ ئەوەندە گەورەیە!!، چونکە ئینسان مەخلوقێکی بەڕێزە لای خوای پەروەردگار، خوا ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِّمَّنْ

خَلَقْنَا تَفْضِيلاً﴾ (٧٠) الإسراء، واتە: ئێمە ڕێزمان لە نەوەی ئادەم گرتووەو لە وشکایی و دەریادا هەڵمانگرتوون و لە شتە پاك و چاکەکان ڕۆزیمان داون و بەسەر هەموو مەخلوقاتی تر بەرزمان کردۆتەوەو ڕێزمان لێناوە، خۆشەویستەکانم: دیارە خوای پەروەردگار کەڕێزی لە عەبدی خۆی ناوە ڕازی نابێ بە نەنقەست و بە زوڵم، بە دوژمنکاری، بە ناهەق ..، ئەو مسوڵمانە یا ئەو عەبدەی خوا بکوژرێ، بۆیە هەرکەسێ بەوکارە هەستێ ئەوە جەهەننەم و ئەو زنجیرە عەزابەی کە باسکردن بۆی ئامادەکراوە.

بەڵێ دیارە پێغەمبەریشﷺ دەفەرموێ: (لَقَتلُ مُؤمِنٍ أعظَمُ عِندَ اللهِ مِن زَوالِ الدُّنيا)[٣] واتە: کوشتنی مسوڵمان لای خوای پەروەردگار گەورەترە لە تێکچوونی هەموو دونیا!، یانی کوشتنی مسوڵمانێك بەناهەق لای خوای پەروەردگار لەوە گەورەترە کە دونیا تێك بچێ، ئەگەر کەسێك کەعبە بڕوخێنێ، کەعبەی پیرۆز کە قیبلەی هەموو مسوڵمانانە ئەهوەنترە لەوەی کە مسوڵمانێك بە ناهەق بکوژێ، یان نیازی کوشتنی هەبێ یان دەستی تێداهەبێ، چونکە ئەو مسوڵمانە خوا ڕێزی لێناوە، هەموو کەون لەخزمەتی ئینساندا دروست کراوە، ئەو ئینسانە بکوژی بەناهەق بەتایبەت کە خواپەرستە، عەبدی خوایەو دەیەوێ خوا لێی ڕازی بێ، ئیمانی لەدڵدایە، تۆ بەناهەق بیکوژی، خوای پەروەردگار لێت قەبوڵ ناکات لەدونیاو لەقیامەتیش!.

بەڵێ خوای پەروەردگار (جل جلاله) فەرمویەتی: ﴿وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَا أُولِي الأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ (١٧٩) البقرة، واتە: لەتۆڵەدا ژیان هەیە، خوای پەروەردگار تۆڵەی داناوە، ئەگەر مسوڵمانێك مسوڵمانێك بەناهەق بکوژێ، دەبێ ئەو بکوژە بکوژرێتەوە، لەبەرئەوە مسوڵمانێکی بەئەنقەست کوشتوە.

[٣] سنن البيهقي الكبرى، كتاب النفقات، باب: تحريم القتل من السُّنة. رقم الحديث ١٥٦٤٧

بۆئەوەی خەڵك تەمبێ ببێ و تەوبە بکات و پەشیمان بێتەوە، وازبێنێ لەو کارە دڕندانەیە، ئیسلام نایەوێ خوێنی خەڵك بەفیڕۆ بڕوا، قورئـان نایـەوێ خـوێنی خەڵك بڕێژێ، بەڵکو تۆڵە(قصاص) ی داناوە.

بۆیە دەفەرموێ: {وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَـاةٌ} لەتۆڵەدا ژیان هەیە، چـونکە ئەگەر کەسـێك کەسێکی بەناهەق کوشت تۆڵەی لێکرایەوە، ئەو کاتە خەڵکی تر واناکا، ژیان بەردەوام دەبێ!، بەلاّم کەسێك کەسێك بکوژێ و کەس پێـی نـەڵێ هەڵەت کردووە، کەس تۆڵەی لێ نەسـتێنێ ئـەوە هـەموو خـەڵك فێـر دەبـێ و خەڵکی تر دەستی دەکرێتەوە، خەڵکی تر ڕێی بۆخۆش دەکرێ، ئەو کاتـە ژیـان تێکدەچێ!، بەلاّم ئەگەر تۆڵە هەبێ خەڵکی تر عیبرەتی لێ وەردەگـرێ، تەوبـە دەکا، ئەو کارە خراپە ناکا، کە دەبێتە مایـەی تێکـدانی شـیرازەی میللـەت و کۆمەڵگا، بۆیە دەفەرموێ: ﴿يَا أُولِيْ الأَلْبَـابِ﴾ ئەی خـاوەن عـەقلان، چـونکە ئەوەی عاقڵ بێ ئەو حەقیقەتە تێدەگا، وە هەموو کەسێك دەکوژرێتەوە، تەنها باوك نەبێ کـە کـوڕی خـۆی بکـوژێ ناکوژرێتـەوە، ئەگـەرنا هـەمو کەسـێك دەکوژرێتەوە.

خۆشەویستەکانم، جا مادام ئەوکردارە ئەوەندە مەترسیدارە، بابزانین ئینسان چۆن دەبێ بەقاتیل؟، بۆ ئەوەی خوانەخواستە ڕۆژێك لە ڕۆژان توشی ئـەو بـەلاّ گەورە نەبین!، بەڵکو لـەخوا بپاڕێینـەوە خـوا بمـان پـارێزێ لـەو بەلاّیـە، لـەو موصیبەتە، یاڕەبی خوایە بمانپارێزی ، یاڕەبی خوایە بمانپارێزی لە هەموو ئـەو بیرە خراپانە، ئەو پیلان(تخطيط) ە خراپانەی کـە بـە مێـشکمان دابـێ ڕۆژێـك لەڕۆژان شەیتان فێڵێمان لێبکات بۆ کوشتنی مسوڵمانێك بەناهەق.

خۆشەویستەکانم، ئەگەر ئینسان ڕاستەوخۆ بە ئەنقەست کەسێك بکوژێ یان خۆی بکوژێ، ئەوە قاتیلە، خـوای پـەروەردگار (جـل جلالـه) دەفـەرموێ: ﴿وَلاَ تَقْتُلُواْ أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾ (٢٩) النـسـاء. ئەفـەرموێ: خۆتـان

مەكوژن یان یەكتری مەكوژن ئەی مسوڵمانینە، خوا بەڕەحمە بەرامبەر بـەئێوە؛ ﴿وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ عُدْوَانًا وَظُلْمًا فَسَوْفَ نُصْلِيهِ نَارًا وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّـهِ يَسِيرًا﴾ (٣٠) النساء، واتە: كەسێك بە زوڵم شتێكی وا بكا، ئەوە خـوای پـەروەردگار (جل جلاله) دەیبا بۆ جەهەننەم!، (فَسَوْفَ نُصْلِيهِ نَـارًا) خـوای پـەروەردگار(جـل جلاله) دەفەرموێ دەیبەین بۆ ناو ئاگر، جا كەسێك بكوژێ بە سیلاح بـێ یـان ژەهری بۆ لەناو بكات یان لەشاخی فڕێی داتە خـوارەوە یـان بـە سـەیارە لێـی بدات، مادام بە ئەنقەست بێ، هەرچۆنێك بێت قاتیلە!.

وە لە هەمان كاتدا ئینسان ئەگەر خۆی بكوژێ قاتیلە، بەداخەوە لە وڵاتی ئێمەدا ئەو دیاردە(ظـاهرة)یە بەتایبەتی لـەناو ئافرەتانـدا هەیـە، لـە وڵاتـانی ئەوروپی لەناو پیاواندا هەیە زیاتر وەك لە ئافرەتان، بەڵام لە وڵاتی ئێمە زیـاتر لەناو ئافرەتاندا هەیە، كەسێك كە لە وڵاتـانی ئـەوروپی و ڕۆژئـاوادا لـەژیانی خۆی بێزار دەبێ، دەچێ لەسەر جسرێكی گەورە خۆی (انتحار)دەكاو خۆی فـڕێ دەداتە خوارەوە یان لە سەر بینایـەكی گـەورە خـۆی فـڕێ دەداتـە خـوارەوە!، لەبەرئەوەی باوەڕی بـەدوای مردنـێ تـی یـە، بـەڵام سـەیر ئەوەیـە ئینـسانی مسوڵمان باوەڕی بەدوای مردن و بەهەشـت و جەهەننـەم و مەحكەمـەی ڕۆژی قیامەت هەیە، خـۆی دەكـوژێ!، كـە دەزانـێ بـەو خۆكوشـتنە خـۆی توشـی جەهەننەم دەكات.

بەڵێ، پێغەمبەرﷺ فەرموی: (مَن قَتَلَ نَفسَهُ بِشيء في الدُنيا عُذِّبَ بِهِ يَومِ القيامَـةِ)[٤] واتە: هەركەسێك لەدونیا خۆی بە شتێك بكوژێ، ئـەوە لەقیامەتـدا بەو شتەی عەزاب دەدرێت، هەركەسێك لەدونیادا، پیاو بێ یان ئافرەت، مادام عەقڵی هەبێ و شێت نەبێ، مادام باڵغ بێ و منداڵ نەبێ، مـادام كەسـێك بـێ هەست و نەست و شعوری هەبێ، خۆی بكـوژێ بـە شـتێك لـەدونیا، بـەردەوام

[٤] مسند المستخرج على صحيح مسلم، كتاب الأيمان، باب: من قتل نفسه بحديدة، رقم الحديث ٢٩٦

لەجەهەننەم لەقیامەت بەوشتە عەزاب دەدرێ و عەزاب دەخوا، جا ئەگەر بە سیلاح خۆی کوشتبێ، بە سیلاح بەردەوام لەجەهەننەمدا خۆی دەکوژێتەوە، ئەگەر بەئاگر خۆی سوتاندبێ، ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا بەردەوام بەو ئاگرە خۆی دەسوتێنێ، وە ئەگەر خۆی لە شاخێکدا فڕێدابێتە خوارەوە، خۆی کوشتبێ، بەردەوام خۆی لە بەرزایی فڕێ ئەداتە خوارەوە لە جەهەننەم، ئەگەر خۆی بە کارەباوە کردبێ یان خۆی خنکاندبێ یان بە ژەهر خۆی کوشتبێ بەهەر جۆرێك بەچەقۆ خۆی کوشتبێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەو شتە بەردەوام لە جەهەننەمدا خۆی دەکوژێتەوە.

جا حەیفە ئینسانی مسوڵمان شەیتان فێڵی لێبکات، ئەو بەهەشتە بەرینەونەو نازو نیعمەتە لەدەست خۆی بدات و خۆی توشی ئەو جەهەننەمە بکات کە نەزانێ خۆی بکوژێ دەچێتە جەهەننەم، بانوێژیش بکاو با ڕۆژووش بگرێ، با زەکاتیش بدا، با حەجی ماڵی خوای کردبێ، مادام خۆی کوشت ئەوە دەچێتە جەهەننەم!، پێغەمبەر ﷺ لە فەرمودەیەکدا[٥] ڕیوایەت دەکات لەخوای پەروەردگار (جل جلاله) کە یەکێك لە مسوڵمانان بریندار دەبێ، بەلاّم لەخۆی بێزار دەبێ، لەبرینەکەی خۆی بێزار دەبێ، ئازاری زۆر دەبێ، ئەو ئینسانە چەقۆیەکەی لەبرینەکەی خۆی وەردەدا بۆئەوەی کە زوو بمرێ، خوای پەروەردگار (جل جلاله) فەرموی: عەبدی من پەلەی کرد، ڕانەوەستا لەسەر فەرمانی من، (حَرَّمْتُ عَلَيهِ الجَنَّة) فەرموی: بەهەشتم لەسەر حەرام کرد!، لەبەرئەوەی خۆی کوشتووە و بە ڕەوای زانیوە، با مسوڵمانیش بێ، بەلاّم خۆکوشتن ئاوایە ئەنجام و بەرهەمەکەی!.

---

[٥] صحيح البخاري، كتاب الجنائز، باب: ماجاء في قاتل النفس، رقم الحديث ١٢٩٨

جا مەگەر کەسێك، ئافرەتێك، کە خۆی سوتاندووە یان خۆی کوشتووە نەیزانیبێ حەرامەو گوناهو تاوانە، ئەوە ئەگەر تۆبە بکا ان شاءالله خوای پەروەردگار (جل جلاله) عەفوی دەکا، ئەمما ئەگەر بزانێ حەرامە، وە کە گوێت لێدەبێ دەزانی حەرامە دەبێ خۆتی لێ بپارێزی، وە واجبی ئێمەی مسوڵمانە ئەوەی کە من لێرە دەیڵێم کە قسەی پێغەمبەرە ﷺ دەبێ هەموتان بەو خەڵکە بڵێن کە گوێیان لێ نیە، کەنایزانن، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (بَلِّغُوا عَنِّي وَلَو آيَة) واتە: قسەی من بە خەڵکی بگەیەنن ئەگەر ئایەتێکیش بێ، مەڵێن ئێمە مەلا نین، شتێك کەدەزانی حەرامەو گوێت لێ بووەو حەقە، کەسێك رایگەیاندووە تۆش رای بگەیەنە، خێرت دەگاتێ، وە ئەگەر رای نەگەیەنی کەمتەرخەمی، وە لێرەشدا ئەوە پێویستە بڵێم کە هەموو ئەو کەسانەی هۆکارن لەخۆسوتاندنی ئافرەت یان خۆکوشتنی ئافرەت یان هەر پیاوێك، ئەوانیش بەئەندازەیەك لەو قەتڵەدا بەشدار دەبن!، جا ئەگەر مامۆستایەکی ئایینیە، کاتی خۆی ئەو کچەی بەزۆر مارە کردووە لەپیاوێك، ئەگەر پیاوێکەو کچەکەی خۆی بەزۆر داوە بە کەسێك و کچەکە پێی رازی نەبووەو بەزۆر لێی مارە کردووە، یان ئەگەر برایەك بەزۆر خوشکەکەی خۆی مارە کردووە لە پیاوێك کەپێی رازی نەبووە، دوایی خۆی سوتاندووە، ئەوە ئەو باوکە، ئەو برایە، ئەو مامۆستایە، وە ئەو شاهیدانە، کەئەزانن و ئاگایان لێیە، ئەو کچە، ئەو ئافرەتە، بە ناهەق، بەزۆر مارە دەکرێ لەو پیاوە، جێگای خۆی نیە ئەو شاهیدانەش بەشدار دەبن لەو قەتڵە!، چونکە سەبەبن!، دەبێ ئاگادارین ئەو شتە زۆر گەورەیە، ئەو مامۆستایەی کە مارەی دەکات دەبێ بزانێ موشکیلەی تێدانیە، ئەو پیاوە کە کچەکەی خۆی ئەداتێ، هەواو ئارەزووی خۆی ئەوێ: هەواو ئارەزووی کورەکەی ئەوێ کە کچی بۆدێنێ و ئافرەتێکی بۆدێنێ، بەڵکو دەبێ مەبەستی رەزابونی کچەکەش بێ، شوێنی باش

بۆکچەکەش ئامادە بکا، هەروەکو چۆن بۆ کورەکەی شوێنی باشی دەوێ، لەبەرئەوە باوك، دایك، برا، خزم و کەس، شاهیدەکان، مامۆستا، ئەگەر قصوریان هەبێ، لە بەشوداتی ئافرەتەکە وەختێك کە خۆی دەسوتێنی، ئەوانیش دەبنە سەبەب لەو قەتڵە!، یان ئەو ماڵەی کە ئەو پیاوە، ئەو نافرەتە تێیدا دەژی دەبنە سەبەب لە خۆسوتاندنی یان خۆکوشتنی ئەو پیاوە یان ئەو ئافرەتە، یان ئەگەر هەر پیاوێك خۆی بکوژێ یان خۆی بسوتێنێ، لە رقی کەسانێك کە نارەحەتی بکەن.

جا خۆشەویستەکانم، یەکەم: با لەوە وریابین، نەخۆمان بکوژین، نە خەڵکیش بەناهەق بکوژین، چونکە بەهەشتمان لێ حەرام دەبێ وە توشی جەهەننەم دەبین!، دووەم: وە ئەگەر ئینسان لەگەڵ کۆمەڵێکدا بوو بەیەکەوە هەوڵیاندا کەسێك بکوژن، هەموویان بەشداربوون لەکوشتنی کەسێکدا ئەوە هەموویان لە گوناهەکەدا بەشدارن، چونکە ئیمامی عومەر خودا لێی رازی بێ، بریاری دا حەوت کەس یان پێنج کەس لە ئەهلی صەنعا بکوژرێنەوە لەبەرئەوەی هەموویان یەك مسوڵمانیان بەناهەق کوشتبوو!، جا ئەگەر سەد کەسیش بێ وەکو عبداللەی کوری ئیمامی عەبباس (ابن عباس) صەحابەو فەقیهی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئەگەر کۆمەڵێك مسوڵمان یەك کەسیان کوشت، ئەوا دەبێ هەموویان بکوژرێنەوە با سەد کەسیش بن!، لەبەرئەوەی یەك کەسیان بە ناهەق کوشتووە.

بەڵێ خۆشەویستەکانم...سێیەم: ئەوە کە ئینسان بەشدار بێ لە بریاردان بۆ کوشتنی کەسێك، بۆخۆی بەشدار نابێ لە کوشتنەکەی، بەڵام لە بریارەکەی بەشدار دەبێ، زۆرجار صوڵحی عەشائیری دەکرێ، دەگوترێ: دەبێ فلانە کەس بکوژرێتەوە، کۆمەڵێك ریش سپی و پیاو ماقوڵ کۆدەبنەوە، بریار ئەدەن دەبێ فلانە کەس بکوژرێ، پێی وایە ئەگەر بۆ خۆی گوللەی لێنەدات نابێتە قاتیل!، لەو دیوەخانەی بریاری لێداوە، ئەو دەبێ بە شەریکی گوناهی قاتلەکە!!، چونکە

ئەو بڕیاری داوە!، هەموو ئەوانەی بڕیار ئەدەن بۆ قەتڵی کەسێکی مسوڵمان، هەموو ئەوانەی کە بەشدار دەبن، قاتیلن!!، چوارەمیشیان: کەسێك کە کوشتنی مسوڵمان بە ڕەوا بزانێ، بە هەقی بزانێ، با لێشی دوور بێ، پێی حەلاڵ بێ و پێی ڕەوا بێ، کەسێك کەسێك دەکوژێ، مسوڵمانێك دەکوژێ، پێی وابێ کە شتێکی باشی کردووە، لە دڵی خۆیدا پێی دڵخۆش بێ و تەئییدی بکا، کە لەماڵی خۆشی دانیشتوەو ئاگاشی لێ نییە، مادام تەئییدی دەکا بەحەلاڵی بزانێ، ئەوەش بەڕاستی بەشێك لەو قەتڵە، بەشێك لەو موحاسەبەیە وەردەگرێ کە خوای پەروەردگار (جل جلاله) بۆی ئامادە دەکات لە ڕۆژی قیامەت.

بەڵێ خۆشەویستەکانم... جا مادام وابێ، با ئێمە وشیار بین و ئاگامان لەخۆمان بێت، توشی ئەو هەڵانە نەبین!، ئەگەر کەسێك پێمان دەکا!، یان بۆخۆمان شەیتان فێڵێمان لێ دەکات، لە بەرامبەر هەر مسوڵمانێکدا کە ئەگەر کێشەو گرفتێکیشمان هاتە پێشێ، ئەوەمان ئاگا لێبێ!!.

لە کۆتاییدا دەڵێم: تەنها لەچەند حاڵێکدا دروستە ئینسانی مسوڵمان بکوژرێتەوە، حاڵی یەکەمیان: وەکو پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (لا يَحلُّ قَتلُ امرِءٍ مُسلِمٍ الّا بإحدى ثَلاث)[٦] فەرموی: مسوڵمان کوشتنی حەلاڵ نیە تەنها لەو سێ حاڵەتانەدا نەبێت، یەکەمیان: (كُفرٍ بَعدَ ايمان) واتە: کەسێك لە دوای ئیمان کافر بوو، وەك زانایان دەڵێن: ئەوە کاتێك کە ئیمام یان خەلیفە بەبەرژەوەندی بزانێ بڕیاری شەرعی بۆ ئەدا، دووەمیان: کەسێك زینا بکا، دوای ئەوەی کە ژنی هێناوە، دوای ئەوەی کە ئافرەتێکی مارە بڕیوەو لەلای ماوەتەوە، واتە: ئەو پیاوە کە ژنی هێناوە لەگەڵ ئەو ژنە دابووە، ژنی بەحەلاڵی مارە کردووە، جا ئەگەر منداڵی هەبێت یان نەبێت، گرنگ ئەوەیە مادام

---

[٦] تلخيص الحبير، جزء ٤، صفحة ١٤، كتاب الجراح، رقم الحديث ١٦٧٧، الشافعي وأحمد والترمذي و ابن ماجة والحاكم من حديث أبي أمامة بن سهل...الخ.

نیکاحی حەلاڵی لە ئافرەتێك بووەو لەگەڵ ئافرەتەکەی دابووە، پاشان زینا لەگەڵ ئافرەتێك بکا، ئەوە دەبێ بکوژرێتەوەو ڕەجم بکرێ.

سێ یەمیشیان فەرمووی: ( وَقَتلِ نَفسٍ بِغَيرِ حَقّ) واتە: کەسێك مسوڵمانێك بکوژێ بەناهەق، بە زوڵم، ئەوەش دەبێ بکوژرێتەوە، (قصاص) ی بۆدانراوە لە دونیا وە لە قیامەتیشدا ئەوەی کە باسکرد!، بەلاّم زانایان فەرموویانە: کەسێکیش دەبێ بکوژرێ کە دەیەوێ ماڵت لێ داگیر بکات یان دەستدرێژی بۆسەر ناموست بکات یان دەیەوێ بتکوژێ، تۆ دیفاع لە خۆت دەکەی ئەو دەکوژی با مسوڵمانیش بێ!، بەلاّم مادام ئینزارت دایێ، مادام خۆت پاراست لەکوشتنەکەی، مادام ئەو وازی لێ نەهێنای و تۆ ئەوت کوشت، ئەوە ئەو کاتە ئەوەش حاڵەتێکی تایبەتە، کە هەموو زانایان فەرمویانە هەقی دیفاع لەخۆکردنت هەیە.

کۆتایی وتارەکەم بە فەرمودەیەکی پێغەمبەر دێنم (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: (مَن أعانَ عَلى قَتلِ مُسلِمٍ وَلَو بِشَطرِ كَلِمَةٍ لَقيَ اللهَ وَهوَ مَكتُوبٌ بَينَ عَينَيهِ آيسٌ مِن رَحمَةِ الله)[٧] ئەفەرموێ: هەر کەسێك هاوکاری کەسێك یان کۆمەڵێك بکات بۆ کوشتنی مسوڵمانێك بە ناهەق، با بەنیوە کەلیمەیەکیش بێ، نافەرموێ(بِكَلِمَةٍ)، ئەفەرموێ: بە بەشە کەلیمەیەکیش بێ، بەشداری بکا لەکوشتنی مسوڵمانێك بەناهەق، ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا دێت لەنێوچەوانی نوسراوە (آيسٌ مِن رَحمَةِ الله) واتە: نائومێدو بێبەشە لەڕەحمەتی خوای پەروەردگار(جل جلاله)! ، دەردەکرێ لەژێر ڕەحمەتی خوای پەروەردگار (جل جلاله)! وە هەرکەسێکیش ڕەحمەتی خوای پەروەردگاری لەگەڵدا نەبێت ناچێتە بەهەشت، جا ئەو کەسەی کەبەشدار دەبێ لەکوشتنی کەسێکدا بەهەشتی لێ حەرام دەکرێ، وە جەهەننەمی بۆ خۆی مسۆگەر کردووە!، جا با وشیار بین ئێمەی مسوڵمان نە

[٧] سنن ابن ماجة، كتاب الديات، باب: التغليظ في قتل مسلم ظلما، رقم الحديث ٢٦٢٠

شەیتان فێڵێمان لیٚ بکا وە نەشوێنکەوتوانی شەیتانیش فێڵێمان لیٚ بکەن، ئێمە مسوڵمانین، قورئانمان هەیە، سوونەتی پێغەمبەرمان هەیە (علیه الصلاة والسلام)، با قەبری خۆمان بۆ کەس پڕ ئاگر نەکەین!، وە هەرکاتێك کێشەیەك یان ململانێیەك، وەزعێکمان هاتەپێشەوە، دەبیٚ قورئان بێنینە بەر چاوی خۆمان!، خوا ئەفەرمویٚ: ﴿فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ﴾ (٥٩) النساء، ئەگەر کێشەیەکتان لەنێواندا دروست بوو، ئەگەر وەزعێك هاتە پێشەوە چارەسەرەکە بگێڕنەوە بۆلای خواو پێغەمبەر واتا قورئان و سوننەت، بزانن قورئان چ بڕیارتان بۆئەدا، نەوەك خوا نەخواستە توشی بەلایەك بن دوایی لەسەری قەرزدار ببنەوە، وەکو ئیمامی ئەحمەدیش خودای لێی ڕازی بیٚ فەرموی: (كُن مَعَ الحَق وَلا تَكُن مَعَ الخَلق) ئەگەر هەرکەسێك داوای لێکردن بۆ کوشتنی مسولمانێك، بزانە هەقە یان نا هەقە، ئەگەر هەق بوو، ئەوە بڵیٚ پشتگیریت دەکەم و زۆر پێم باشە!، ئەگەر ناهەقیش بوو، بەهیچ شێوەیەك بەقسەی مەکە، مەڵیٚ ئەوە فڵانە کەسەو جا چۆن دەبیٚ لەقسەی دەرچم!، هەروەکو برایەك قسەیەکی بۆ گێڕامەوە کە کەسێك یەکێك لە برا گەورەکانی تەکلیفیان لێکردووە بۆ کوشتنی مسوڵمانێك، ئەو مسوڵمانەش پێی گوتووە بەوکەسنە ئایا قسەی خوات لەلا گەورەترە(جل جلاله) یان قسەی برا گەورەکەت!، ئەویش گوتویەتی قسەی خوام لەلا گەورەترە(جل جلاله)، ئەویش وتی باشە ئەوە برا گەورەکەت پێت دەڵیٚ برۆ فلانە کەسی بکوژە، کە دەشزانی ناهەقە، دەشزانی زوڵمە، وە خودای پەروەردگاریش(جل جلاله) کوشتنی ئەو ئیمانداره‌ی لیٚ حەرام کردووی، لێرە خوا ئەفەرمویٚ مەچۆ. ئەتۆش دەڵێی براگەورەکەم دەڵیٚ بیکوژە، بەقسەی کامەیان دەکەی؟ بەقسەی خوا دەکەی (جل جلاله) یان بەقسەی برا گەورەکەت؟!، ئەویش لە وەڵامدا گوتوویەتی: جا برا گەورەمەو ناتوانم لەقسەی دەرچم!، مەجبورم بەقسەی بکەم!. ئەوە وەڵامی کەسێکە کە ئیمانی زۆر لاوازە، ئەوە کەسێکە کە

بەشەیتان ناوێرێ، بەنەفسی خۆی ناوێرێ، کە جەهەننەم بۆ خۆی مسۆگەر دەکا، کە بیر لە عاقیبەتی خۆی ناکاتەوە.

جا با ئێمە وشیار بین، ئەو کەسەی کە دەکوژرێ بە ناهەق، لە ڕۆژی قیامەت بەجلی خوێناوی لە مەیدانی مەحشەر ڕاوەستاوە، ئەو دڵۆپە خوێنانەی لەلاشەی دێنە خوارێ، ئەو ئینسانە قاتیلەش دێت لەگەڵ ئەو کوژراوە بەڕیز ڕادەوەستێ، ئەو کوژراوە هاوار دەکا دەڵێ پەروەردگارا ئەوە قاتیلمە، کە لەتەنیشتم ڕاوەستاوە، هیچ شتێك لەخوا ون نابێ، با وشیار بین، خۆمان خەجاڵەتی بەر دەستی خوای پەروەرگار(جل جلالە) وە مەحکەمەی (رَبُّ العالَمين) نەکەین لە ڕۆژی قیامەت.

یا ڕەببی خوایە لەو تاوانە گەورەیە بمانپارێزی، ئێمەش و هەموو مسوڵمانان (یا رَبَّ العالَمين)، یا ڕەببی خوایە خەجاڵەتی بەر مەحکەمەی خۆتمان نەکەی لە ڕۆژی قیامەت، یا ڕەببی خوایە ئیمانمان سەلامەت بکەی، یا ڕەببی خوایە بمانکەی بەشوێنکەوتووی ڕاستەقینەی پێغەمبەرەکەت ﷺ ، یا ڕەببی خوایە خۆشەویستی خۆت و پێغەمبەرەکەت و قورئانەکەت لە دڵماندا بچەسپێنی، یا ڕەببی خوایە ئیمانمان زیاتر بکەی، برایەتیمان زیاتر بکەی، خێرو خۆشیمان بەسەردا بباڕێنی، بەسەر خۆمان و بەسەر وڵاتەکەماندا، بەسەر میللەتەکەماندا، خوایە بەسەر هەموو مسوڵمانانی دونیا، خوایە حاڵی هەموو مسوڵمانانی دونیا چاکتر بکەی، ئێمەو هەموو مسوڵمانانی دونیا لە ناخۆشی و ناڕەحەتیەکان بپارێزی (یا رَبَّ العالَمين)، یاڕەببی خوایە شیفای نەخۆشیەکانمان بێنی، خوایە لە مردووەکانمان خۆش بی، خوایە ڕەحم بە ماڵ و منداڵمان بکەی، خوایە دوعای پیرەکانمان قبوڵ بکەی. خوایە هیدایەتی گەنجەکانمان بدەی، خوایە هەرکەسێك خێرو خۆشی دەوێ بۆ مسوڵمانان خوایە تەوفیقی بدەی، وە هەرکەسێ کە ناخۆشی و ناڕەحەتی دەوێ بۆ مسوڵمانان خوایە تەوفیقی نەدەی، خوایە ئەو فێڵ و مەکرو پیلانانەی بەسەر خۆیدا بشکێنیەوە، أمین.

أقولُ قَولي هذا وَأستَغفِرُ الله لي وَلَكُم وَلِسائِرِ المُسلِمين فأستَغفِروهُ انهُ كان غَفّارا،

اعوُذُ بِاللهِ مِنَ الشَيطانَ الرَجيم

(رَبَّنا أتِنا في الدُّنيا حَسَنَةَ وَفي ألاخِرَةِ حَسَنَةَ وَقنا عَذابَ النار)

أمين.

## برایەتیی مسوڵمانان

### بسم الله الرحمن الرحيم

إنَّ الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونستهديه، ونعوذ بالله من شرور أنفُسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضلَّ له ومن يضلل فلا هادي له، ونشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له ونشهد أنَّ سيدنا ونبينا محمداً عبده ورسوله، هذا الرسول الذي بلَّغ الرسالة وأدى الأمانة ونصح الأمة وجاهد في الله حق جهاده وتركنا على المحجة البيضاء، ليلها كنهارها، لايزيغ عنها إلا هالك، صلواة اللهِ وسلامه عليه وعلى أله وأصحابه، ومن تبعه الى يوم الدين ...، أما بعد يا عبادالله أوصيكم ونفسي أولاً بتقوى الله وطاعته، فإنّ اللهَ مع الذين اتقوا والذين هم محسنون، قال الله سبحانه وتعالى في كتابه الحكيم، بسم الله الرحمن الرحيم: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ (١) النساء.

سوپاس و ستاییشی بێ پایان و نەبڕاوە بۆخوای گەورە (جل جلالە)، وە درووودو سەلام و بارانی ڕەحمەت بۆ سەر گیانی پاکی پێغەمبەرمان محمد ﷺ.

مسوڵمانانی بەڕێز، سەلام و ڕەحمەتی خوای پەروەردگارتان لەسەربێت لەم ڕۆژە پیرۆزەدا و، بەتایبەت لەو کاتە پیرۆزەدا.

بەڕێزان: خوای پەروەردگار (جل جلالە) نازو نیعمەتەکانی خۆی زۆر بەسەر ئێمەدا ڕشتوون، یەکێك لەو نیعمەتە گەورانە بریتی یە لەنیعمەتی ئیمان، وە پاشان نیعمەتی برایەتی کە بەهۆی ئیمانەوە دروست دەبێت، هەڵبەتە ئینسانی مسوڵمان چ پیاو بێت چ ژن، هەموو هەوڵ و تەقەلاّیەکی بۆ ئەوەیە خوای گەورە لەخۆی ڕازی بکات، وە بەهەشتی بەرین وەدەست بێنێت، یەکێکیش لەو مەرجانەی کە ئینسان بەهەشت و ڕەزابوونی خوای گەورەی پێ وەدەست

دەهێنێت بریتی یە لە برایەتی و یەکتر خۆشویستن لەبەر خاتری خوا، بەتایبەت لەبارودۆخێکی وەکو ئەمڕۆی دونیا، کە مسوڵمانان لەهەر کوێیەك هەن پێویستیان بەیەکتری هەیە!، پێویستیان بەدوعای خێری یەکتری هەیە، پێویستیان بە پاڵپشتی کردنی یەکتری هەیە، پێویستیان بە مەشوەرەت و ڕاو هەڵوێستی یەکتری هەیە، لەهەموو دونیا، وە بەتایبەتی تر لەکوردستانی خۆماندا لە ڕۆژگارێکی وەکو ئەمڕۆ کە هەموو جیهان پێیدا تێدەپەڕێ، کوردستانی ئێمەش لەناو ئابلۆقەی ئەو موعانات و کێشەو ململانێیەی جیهاندایە، کە پێویستە ئێمەی مسوڵمانیش: یەکەم، شوکری خوای پەروەردگار (جل جلاله) بکەین کە ئەو ئازادی و بەخششەی خۆی بەئێمە بەخشیوە، کە چەند ساڵە تێیدا دەژین بە ئارامی، ئێمە ئەمڕۆ پێویستیمان بەوە هەیە دوای سوپاس و شوکری خوای پەروەردگار (جل جلاله) خۆشمان وەکو میللەتی کورد هەموو تێکرا ئاگامان لە برایەتیی یەکتری بێت، وە ئاگامان لە وەزعی دونیا بێت، وە بتوانین یەکریزو یەك هەڵوێست بین بەرامبەر بە هەڕەشەکانی کوفری جیهانی، کە دەست و بازوی خوێناوی خۆیان لێ هەڵکردووە بەرامبەر بە مسوڵمانان؛ وە بەرامبەر بە میللەتە لاوازو بێ دەسەڵاتەکان بەگشتی.

جا لە بارودۆخێکی وەکو ئێستای کوردستان و عێراق و دەوروبەر، وە جیهان بەگشتی، ئێمەی میللەتی کوردی مسوڵمانی کوردستان، پێویستیمان بە برایەتی و دروستکردنی ئارامی و ئاشتی زیاترە لە هەموو کاتێك.

## برایەتی چۆن دروست دەبێت؟:

بەڕێزان، ئایا برایەتی بە پارە دروست دەبێت؟، ئایا برایەتی بەترس و چاو لێ سوورکردنەوەو تۆقاندن دروست دەبێت؟، ئایا برایەتی ڕاستەقینە کامەیە؟، ئەو برایەتییەی کە مەسڵەحەتی دونیا دروستی دەکات؟، ئەو برایەتییەی کە بەهێزی ماددە دروست دەبێت؟، یان بە هێزی ئیمان؟!، ئێمەی مسوڵمان

لەڕوانگەی قورئانی پیرۆزو سـوننەتی پێغەمبـەرمان محمـد ﷺ، لـە دەلاقـەی ئیسلامەوە تەماشای دروستبونی برایەتی دەکەین، دەڵێین، برایەتی لەدوو خاڵان دروست دەبێت:

**یەکەمیان:** ئیمان، **دووەمیشیان:** یەکترخۆشویستن، ئەوەش لـەژێر سـێبەری فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەرمان ﷺ، کە فەرمووی: (لا تَدخُلُوا الجنَّةَ حتَّى تُؤمِنُوا وَلا تُؤمِنُوا حَتَّى تَحابُّوا أَوَلا ادلُّكُم عَلى شَئٍ اذا فَعَلتُمُوهُ تحابَبتُم أَفـشُوا السَّلامَ بَينَكُم)[8]، فەرموی: ئەی ئوممەتەکەم ئێوە ناچـنە بەهەشـت هـەتا ئیمـان نەهێنن، وە ئیمانتان نابێت هەتا یەکترتان خۆش نەوێت!، ئایا شتێکتان پێبڵێم ئەگەر جێبەجێتان کرد یەکتریتان خۆشبوێ؟، فـەرمووی، سـەلام زۆر لەیـەکتری بکەن!، بۆیە پێویستە بزانین سەلام کردن و هاتوچۆی یەکتری کردن و پتـەوبونی پەیوەندی کۆمەڵایەتی مایەی بەهێزی ئیمانە، ئینجا با بزانین یەکتر خۆشویستن بەچی دروست دەبێت؟:

جارێ پێشەکی دەبێ ئەوە بزانین کە تەنها ئیمانداران برای یەکن، وەکـو خـوای پەروەردگار (جل جلاله) فەرموی: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾ (١٠) الحجـرات، واتـە: تەنها ئیمانداران برای ڕاسـتەقینەی یـەکترین، ئـەوە ئایـەتی قورئانـە، لـە دونیـا ئەوانەی کە بەگیان و بەدڵ، بەماڵ و بە ڕوح، خۆ فیـدایی یـەکتری دەکـەن تـەنها بەهۆی ئیمانەوەیە!، تەنها برایەتی ئیمانییە، هەرئـەوانیش لەقیامـەتـدا بەکـەڵکی یەکتری دێن، ئەوانن کە لەقیامەتدا تەنها برایەتییەکەیان بەکەڵکیان دێت، ئەوانـە ئیماندارانن، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿الْأَخِلَّاءُ يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا الْمُتَّقِينَ﴾ (٦٧) الزخرف، واتە: هاوڕێیان و برادەرانـی دونیـا، هـەموویان لەقیامەت لەڕۆژی مەحشەر لەگەڵ یەکتری دا دوژمنن، تەنها پارێزکـاران نـەبێت، تەنها لەخواترسان و تەقواداران بـرای یـەکن لـەڕۆژی قیامـەت، ئەوانـەی لـەخوا

---

[8] صحيح المسلم، كتاب الأيمان، باب: بيان أنه لا يدخل الجنة إلا المؤمنون، رقم الحديث ٥٤

ترساون، وە پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: (المؤمنُ للمؤمنِ كالبُنيانِ يَشدُّ بَعضَهُ بَعضاً)[9] واتە: ئیماندار بۆ ئیماندار وەکو خشتی دیوار وایە یەکتری دەبەستنەوە، (وَشَبَّكَ بينَ أصابِعهِ) پەنجەکانی لەناو یەکتری نا و فەرموی: ئاوا ئیمانداران یەکتری دەبەستنەوە!، نەیفەرموو نیشانەکان یەکتری دەبەستنەوە، نەیفەرمو عەرەبەکان یەکتری دەبەستنەوە، نەیفەرمو فلانە بنەماڵەو تیرەو هۆزە، فلانە عەشیرەت، فەرموی ئیمانداران!، جا کە دەشڵێین ئیمانداران مەبەست لە پیاوان و ئافرەتانە(برایان و خوشکان)!، چونکە ﴿والمُؤْمِنُونَ والمُؤْمِناتُ بَعضُهُمْ اولياءُ بَعضْ﴾ (٧١) التوبة، واتە: ئیمانداران پیاوان و ئافرەتانیان دۆست و پاڵپشتی یەکترین، تەواوکەری یەکن، ئەو برایەتیی و خوشکایەتییە لەنێوان ئیمانداران، لەنێوان پیاوان و ئافرەتانی ئیماندار دا چۆن دروست دەبێت؟.

ئیمان واتە بڕوابوون بەهەموو فەقەڕەکانی ئیسلام، بەهەموو بەشە وردو درشتەکانی ئیسلام، هەرچی لەقورئان هاتووە، لە (ب)یی (بِسمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحِيم) هەتا (س)ی (منَ الجَنَّةِ والنَّاس)، باوەڕمان پێی هەیە، وەکو ئیماندار، وەکو مسوڵمان، بەهەموو فەقەڕەو بەشەکانی، وە بەهەموو بەندەکانی ئیسلام کە سەرچاوەکەی قورئانی پیرۆزە، خوای گەورە (جل جلاله) ڕێزی لەئێمە ناوە بەوەی کە ئەو قورئانە پیرۆزەی بۆ ئێمە ناردوە، خودایەکی داناو زاناو بەدەسەڵات، خوایەکی گەورەو دەوڵەمەند (جل جلاله)، بۆ عەبدێکی نەفامی بێ دەسەڵات و بچوکی فەقیر، پەیام(رسالة)ی هیدایەتی بۆ ناردوە، ئەوە گەورەترین ڕێزە کە خوای گەورە لەبەنی ئادەمی ناوە!: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ﴾ الإسراء، واتە: بەڕاستی ئێمە ڕێزمان لەبەنی ئادەم ناوە.

باوەڕمان بەهەموو وشەکانی قورئان هەیە وەکو یەك، لەبەرئەوە خوای پەروەردگار (جل جلاله) کە بڕیارێکی دا ئێمەی تێدا سەرپشك(مُخَوَّلْ) ناکات،

---

[9] صحيح البخاري، كتاب الصلاة، باب: تشبيك الأصابعفي المسجد وغيره، رقم الحديث ٤٦٧

ئەگەر لە مەسڵەحەتمان بو جێبەجێی بکەین، ئەگەر لە مەسڵەحەتیشمان نەبو نەء!، ئایا ئیسلام بەپێی ژیان دەڕوا یان ژیان بەپێی ئیسلام؟، ئایا دەکرێ بۆ بەرژەوەندی خۆمان دەستکاری فەقەرەیەکی دین بکەین؟، بۆ بەرژەوەندی دونیامان مەسلحەتی کارەکەمان، مەسڵەحەتی ئیش و کارو وەزیفەکەمان دەستکاری بەندێکی ئیسلام بکەین؟، یان وەکو خۆی دەبێت جێبەجێ بکرێت؟، خوای پەروەردگار (جل جلاله) دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُّبِينًا﴾ (٣٦) الأحزاب، واتە: هیچ ئیماندارێك پیاو بێت یان ژن، بۆی نیە ئەگەر خوای گەورە یان پێغەمبەرەکەی محمدﷺ بڕیارێکیان دا دەستکاری ئەو بڕیارە بکەن، تێیدا سەرپشك(مُخَيَّر) نین، سەربەخۆ نین، بڕیار بڕیاری خواو پێغەمبەرە ﷺ، کەس بۆی نیە دەستکاری بڕیاری خوا بکات، کەس بۆی نیە دەستکاری بڕیاری پێغەمبەر ﷺ بکات.

وەختێك خودای ئێمە (جل جلاله) پێمان دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَجَسَّسُوا﴾ (١٢) الحجرات، واتە، جاسوسی مەکەن، دەڵێین: بەسەرچاوان!، ملکەچین!، وەختێك پێمان دەفەرموێ: ﴿اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِّنَ الظَّنِّ﴾ (١٢) الحجرات، واتە، خۆتان لەزۆر گومان بپارێزن، دەبێ بڵێین بەسەرچاو!، وەختێك پێمان دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَقْرَبُواْ الزِّنَى﴾ (٣٢) الإسراء، واتە: نزیکی زینا مەکەونەوە، دەبێ بڵێین بەسەرچاوان، وەختێك پێمان دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَقْرَبُواْ مَالَ الْيَتِيمِ﴾ (٣٤) الإسراء، واتە، نزیکی ماڵی هەتیوان مەکەونەوە چونکە ئاگرە، دەبێ بڵێین بەسەرچاوان، خوایە ئێمە نازانین تۆ باشتر دەزانی!، وەختێك پێمان دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ﴾ (٣٦) الإسراء، واتە: وەدوای شتێك مەکەوە کە زانیاریت دەربارەی نییە، دەبێ بڵێین بەسەرچاوان، وەختێك پێمان دەفەرموێ: ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا﴾ (٣٨) المائدة، واتە: دز پیاو بێت یان ئافرەت دەستی ببڕن، دەبێ بڵێین: بەسەرچاوان، وەختێك پێمان

دەفەرموێ: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ﴾ (٢) النــــور، واتە، زیناکەر پیاو بێت یان ئافرەت، مادام کوڕو کچ بن، سەد جەڵدیان لێدەن، دەبێ بڵێین بەسەرچاو!، نابێ ڕەحمان پێیاندا بێتەوە، خـوای پـەروەردگار (جـل جلاله) دەفەرموێ: ﴿وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ (٢) النــــور، واتە: بـا خـەڵكیش ئامـادەی عەزابەکـەیان بـێ و ببینـێ چـونکە ئـەوە پاداشـتی کردەوەکەیانە، وەختێك خوای گەورە (جل جلاله) پێمان دەفەرموێ: ﴿لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِّن قَوْمٍ﴾ (١١) الحجرات، واتە: با هەندێکتان گاڵتە بەهەندێکی تر نەکـەن لەپیاوان، دەبێ بڵێین بەسەرچاو، وەختێـك خـوای گـەورە (جـل جلالـه) پێمـان دەفەرموێ: ﴿وَلَا نِسَاء مِّن نِّسَاء﴾ (١١) الحجرات، با ئافرەتانیش هەنـدێکیان گاڵتە بەهەندێك ئافرەتانی تر نەکەن کە مسوڵمانن، دەبـێ بڵـێین بەسەرچـاوان، ئێمە نازانین، چونکە خوای گەورە (جل جلاله) دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ (٢١٦) البقرة، واتە: خوا دەیزانێ و ئێوە نایزانن، دەڵـێین بەسەرچـاو خوایە، خوا دەیزانێ ئێمە نایزانین، وەختێك پێمان دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَنتُمُ الْفُقَرَاء إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ﴾ (١٥) فـاطر، ئـەی خەڵكینـە ئێوە هەژارن، پێویستیتان بەخوا هەیە، خوا دەوڵەمەنـدە کەپێویـستی بـەهیچ نیەو بێ نیازو جێی نیاز(صمد)ە، دەبێ بڵێین: بەسەرچاوان ئەی (رَبُّ العـالَمينْ)، ئەتۆ دەوڵەمەندی و ئێمە فەقیرین، ئەتۆ گەورەی و ئێمە بچوکین، ئەتۆ خالقی و ئێمە مەخلوقین، ئەتۆ ژێنەرو مرێنەری، ئێمەین دەمرین و دەژین بە بڕیاری تۆ ﴿أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ﴾ (٥٤) الأعـراف، بڕیارو دروستکردن هەمووی بەدەسـتی تۆیە یا (رَبُّ العالَمينْ)، بۆمان نیە دەستکاری دینی خوا بکەین.

ئایا ئیسلام بەپێی ژیان یان ژیـان بـەپێی ئیسلام؟، ئیـسلام لەگـەڵ ژیـان بگـونجێنین، لەگــەڵ مەســڵەحەتی خۆمــان بگــونجێنین یــان خۆمــان و مەسڵەحەتەکەمان لەگەڵ دینی ئیسلام بگونجێنین؟، ئایا خۆمـان زانـاترین یـان خوا (جل جلاله)؟.

خوای گەورە (جل جلالە) دەفەرمویٚ: ﴿وَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَى أَن تُحِبُّواْ شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ وَاللّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ (٢١٦) البقرة، ﴿فَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا﴾ (١٩) النساء، واتە: زۆر شت هەیە ئێوە پێتان ناخۆشە بەلاٚم خێرە بۆ ئێوە وە بە پێچەوانەشەوە، جا خوا(جل جلالە) دەفەرمویٚ: خوا دەزانیٚ و ئێوە نایزانن!، بۆیە دەبیٚ بلێین (رَبُّ العالَمِينْ) ئێمە بیٚ دەسەلاٚتین و تۆ بەدەسەلاٚت، ئێمە نەفامین، نەزانین، ئەو عیلمەی کە تۆ بەئێمەت داوە هەرنەوەندەمان هەیە، ئەو عیلمەش زۆر کەمە!، ﴿وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ (٨٥) الإسراء، بۆیە دەبێت ئەو ئیمانەمان هەبێت، دەبیٚ ئەو ئیسلامەتیەمان هەبێت، ئایا دەکریٚ برایەکی مسوڵمان لەبەرئەوەی قازانجی زیاتر لە معامەلەکەیدا دەکات بلیٚ خوایەگیان ئەو ئایەتەی هەڵگرە لەقورئان؟، یان بەو ئایەتە لێم مەگرە؟، ئایا دەکریٚ برایەکی مسوڵمان بلیٚ (رَبُّ العالَمِينْ) لەبەرئەوەی کە پارەم نیە، موچەم نیە لێم گەڕیٚ با لەگەڵ زوڵم و ستەمدا تێکەڵ بم بەس موچەیەکم بەدەست بکەویٚ بۆ ماڵ و منداڵم؟، ئایا دەکریٚ ئینسان بلیٚ خوایە ئەو ئایەتە با لەقورئاندا لەسەر من نەبێت کە ئەمڕۆ پێویستیم بەپارەیە خۆم توشی حەرام دەکەم؟، موعامەلەکەم توشی حەرام دەکەم؟، ئایا دەکریٚ بلێم خوایەگیان من لەبەرئەوەی نەفسم پێی خۆشە مەشروباتی بخۆمەوە لێم مەگرە؟، ئەو ئایەتە با ئەو ماوەیە موحاسەبەی لەسەر نەبێت؟، یان ئەو ئایەتە با لەقورئاندا نەبێت؟، دەکریٚ خوشکێکی مسوڵمان بلیٚ خوایە لەبەرئەوەی پێم خۆشە بچمە دەرەوە ناو پیاوان و لەگەڵ پیاوان گەشتوگوزارو سەیران بکەم خوایە لێم مەگرە؟، یان خوایەگیان نوێژ دەکەم و ڕۆژو دەگرم بەلاٚم سەرم ڕوتەو لەچك لەسەر ناکەم؟، یان دەکریٚ لەبەرئەوەی بازارو سەیران و گەشتوگوزاری زۆر پێخۆشە بلیٚ خوایەگیان لێم مەگرە بیٚ پرسی مێردەکەم دەچمە دەرەوە؟، یان لێم مەگرە لەبەردەرگا دادەنیشم؟.

مادام خوای گەورە حەرامی کردوە حەرامە، حەرام ئەوەیە کە خوا حەرامی کردوە، وە حەڵاڵیش ئەوەیە کە خوا حەلاڵی کردوە، ئیمانمان بەهەموو فەقەرەیەکی دینی ئیسلام هەیە، جا بائێمەی مسوڵمانیش ئیقتیدا بە پێغەمبەر محمدﷺ بکەین، یا هەموو پێغەمبەران بکەین بە سەرمەشقی خۆمان، شوێنکەوتوانیان بکەین بەنمونە بۆخۆمان، گوێ بگرن لەنمونەیەکی قورئانی پیرۆز کە خوای گەورە (جل جلالە) بۆ هەموو ئیمانداران دەیهێنێتەوە: خێزانی فیرعەون، ئەو فیرعەونەی کەخۆی بە پەروەردگاری سەرزەوی دەزانی!، بە قەومەکەی دەگوت: ﴿فَقَالَ أَنَا رَبُّكُمُ الْأَعْلَى﴾ (٢٤) النازعات، ئەمن پەروەردگاری هەرە بەرزی ئێوەم، بم پەرستن!، خێزانەکەی لەبەرئەوەی ئیماندار بوو و ئیمانەکەی ئەوەندە بەخوای پەروەردگار پتەو بوو داوای دونیای نەدەکرد، بێزاربو لەو ژیانەی دونیا، بێزاربوو لەو باخچەو ڕوبارەی کە بە ژێر قەسری فیرعەونی مێردەکەیدا دەڕۆیی، بێزاربوو لەو قەسرو ناوماڵەی کە فیرعەون هەیبوو، بێزاربو لەو غولاّم و خزمەتکارانەی کەفیرعەون هەیبوو، بێزاربو لەو پارەو سەروەت و سامانەی کەفیرعەون هەیبوو، بێزاربو لەو زەوی و زارو مێوەجاتەی کەفیرعەون هەیبوو، بۆچی؟! لەبەرئەوەی باوەڕی هەبوو بەخوای گەورە؛ پێی وابو کە ژیانی دونیا ژیانی ڕاستەقینە نیە، ژیانی دوارۆژ ژیانە کە هەتاهەتاییە!، قورئان -لەسەر زمانی ئەو ئافرەتە- دەفەرموێ: ﴿رَبِّ ابْنِ لِي عِندَكَ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِ وَنَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ (١١) التحريم، بزانە چ دوعایەکی کردوە!، بزانە چ داوایەکی کردوە لەخوای گەورە (جل جلالە)!، ئەو ئافرەتەی کە لەدونیا لەهیچی کەم نەبووە، بەلاّم ئیماندارە، دەفەرموێ: پەروەردگارم، قەسرو خانووێکم بۆ دروست بکە لەلای خۆت لەبەهەشت، وە ڕزگاریشم بکە لە فیرعەون و لەکردەوەکانی، وە ڕزگاریشم بکە لەقەومی زالّم و ستەمکار.

تەماشاکەن چەندە عیبرەتی تێدان ئەو داوایە!، ئەو داوایە گەورەو شەرعی یە کەخوای گەورە لەسەر زمانی ئەو نافرەتەدا بۆ ئێمەی ئومەتی محمدﷺ دەگێڕێتەوە، بۆ ئەوەی عیبرەتی لێ وەربگرین:

یەکەمجار دەفەرموێ (رَبِّ) پەروەردگارم، بۆ داخوازی و پێویستیەکانی خۆی هاوار ناکات بۆ کەسی تر، بەڵکو بەس بۆ خوای گەورە (جل جلالـه)!، داوای چی لێدەکات: ﴿رَبِّ ابْنِ لِي عِندَكَ بَيْتًا﴾ خوایە قەسرو خانویەکم بۆ دروست بکە لەبەهەشت لە موقابیل ئەو قەسرەی کە ئێستا هەمە لەدونیا، چونکە بێ قیمەتە، چونکە ئیمانی پێوە نیە، چونکە زائیلەو دەڕوا، خانویەك لەکوێ؟ (عِندَكَ) لەلای خۆت!، نەك لەدونیا، لەلای خۆت، لەکوێ؟ (فِي الْجَنَّةِ) لە بەهەشت!، تەماشاکە ئینسانی مسوڵمان داوای دونیا ناکات، داوای قیامەت دەکات، بۆ دونیا ناژی بەڵکو بۆ قیامەت دەژی، چونکە ئەو دونیایە تەنها ئیمتیحانە.

دڵنیابن خۆشەویستەکانم، ئەو دونیایە تەنها ئیمتیحانە، وەڵڵاهی خوای گەورە پێویستی بەعیبادەتی ئێمە نییە!، برایان و خوشکانمان با شانازی بەعیبادەتی خۆیانەوە بکەن، شانازی بەڕۆژوەکەیانەوە بکەن، شانازی بە مێردەکەی خۆیانەوە بکەن، شانازی بەو موعانات و دەردەسەری و ناخۆشی خۆیانەوە بکەن کە لەسەر ئیسلام تووشیان دەبێت، وە دەبێت دڵنیابن کە ئەو دونیایە تەنها دونیای تاقی کردنەوەیە، خوا پێویستی بەعیبادەتی ئێمە نییە چونکە عیبادەتەکەمان قازانجی خۆمانی تێدایە، خوا پێویستی بەوە نییە ئێمە حوکمی ئیسلام دەهێنینەوە یان نایهێنینەوە، خوا پێویستی بەئێمە نییە بەوەی ئایا بەهۆی ئێمەوە ئیسلام بەعیززەت دەبێت؟، چونکە ئیسلام عیززەتی هەر هەیە و هەر عەزیزە!، ئایا بەهۆی ئێمەوە حوکم و دەسەڵاتی ئیسلام دەگەڕێتەوە یان نا، خوا منەتی پێ نییە، خوا دەسەڵاتدارە، خوا دەوڵەمەندە پێویستی بەهاوکاری کردن نیە!، ئەو دونیایە تەنها ئیمتیحانە: ﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ﴾ (٢) الملك،

خوای گەورە ژیان و مردنی داناوە تەنها بۆ تاقی كردنەوەی ئێوەیە، هیچی تر نا، ئەگەرنا تەماشای پێغەمبەران بكەن (علیهم الصلواة والسلام)، تەماشا ئەكەین پێغەمبەری وا هەیە لەرۆژی قیامەت ئوممەتەكەی دوو كەسە!، هی وا هەیە ئوممەتەكەی یەك كەسە!، هی وا هەیە ئوممەتەكەی هیچ كەس نیە!!، كەسی لەگەڵدا نیە لەرۆژی قیامەت، تۆ بڵێی ئەو پێغەمبەرە خۆی ماندوو نەكردبێ؟!، تۆ بڵێی ئەو پێغەمبەرە حیكمەتی نەبوبێ؟!، تۆ بڵێی ئەو پێغەمبەرە وەحی بۆ نەهاتبێ؟!، لێنەزان بووبێ؟، نەخێر! (نَعُوذُ بالله)، پێغەمبەران هەموویان زانا بوون، هەموویان بەغیرەت بوون، هەموویان بەحیكمەت بوون، نەی بۆ پەرێزی دیار نەبوە لەدونیا؟، چونكە حیكمەتی خوا وابودو خەڵكەكە كەللەرِدق بوود، دیارە دونیا هیچ نییە، دیارە سەنگی مەحەك دونیا نیە، تەرازوو دونیا نییە، ئەنجامی هەڵسەنگاندن لەدونیا نییە، بنەمایەكە نییەت و بۆ خوا ماندوبون و بۆخوا كاركردنە، لەبەرئەوە دونیا جێگای تاقی كردنەوەیەو بەس، ئەگەر تۆ شەوو رۆژ نەخەوی بەسەدان وتار بڵێی و بەسەدان كتێب تەنلیف بكەی، وە بەسەدان لەشكری ئیسلام و مسوڵمانان پرچەك بكەی تەنها تاقی كردنەوەیە، كارەكە بەنییەتە، وە خوا هەر بە دەستەڵاتەو لە دەستەڵات و دەوڵەمەندیەكەی هیچ زیاد نابێت، وە ئەگەر كەسیش لەسەر زەوی عیبادەتی خوا نەكات قەت لە دەسەڵاتی خوای گەورە كەم نابێت و لەدەوڵەمەندی خوای گەورە كەم نابێت، وەكو خوا (جل جلاله) دەفەرموێ: ﴿إِن تَكْفُرُواْ أَنتُمْ وَمَن فِي الأَرْضِ جَمِيعًا فَإِنَّ اللّهَ لَغَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾ (٨) إبراهیم، واتە: ئەگەر ئێوە هەرچی لەسەر زەوی یە هەمووتان كافربن، خوا هەر دەوڵەمەندەو هەر سوپاسی دەكرێت: ﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ وَلَكِن لاَّ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا﴾ (٤٤) الإسراء، واتە: هەر حەوت ئاسمانەكان و ئەرزیش، وە هەرچی تێیاندایە تەسبیحاتی خوا دەكەن!، خوا منەتی بەئێمە نیە ناخۆ ئێمە

تەسبیحاتی دەکەین یان نا، بەلاّم تەنها تاقی کردنەوەیە لەدونیا، خوای گەورە (جل جلاله) دەیەوێ ئێمە ئیسپاتی بکەین ئاخۆ تا چەندە ئامادەین لەپێناوی خوادا ماڵمان بەخت بکەین، لەپێناوی خوادا خوێنمان بەخت بکەین، لەپێناوی خوادا خۆشیمان بەخت بکەین، لەپێناوی خوادا ماڵ و منداڵمان بەخت بکەین، لەپێناوی خوادا لۆمەو لۆمەکاری خەڵکمان بێتەسەر، تەنها تاقی کردنەوەیە، بۆیە خێزانی فیرعەون دەڵێ چی؟: ﴿رَبِّ ابْنِ لِي عِندَكَ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ﴾ (١١) التحریم، خوایە لەلای خۆت، لەبەهەشت شوێنم بۆ دابین بکە، ئەو دونیایە زائیلەو دەڕوا هیچ نیە، ﴿وَنَجِّنِي مِن فِرْعَوْنَ﴾: خوایە ڕزگاریشم بکە لەفیرعەون، چونکە لێی بێزارم، لێی بێتاقەتم، کافرە، ﴿وَعَمَلِهِ﴾ وە لەکردەوەکانیشی ڕزگارم بکە، چونکە کردەوەی خراپی چاندووە لەسەر ڕوی زەویدا، نیزام و دەستوری خراپی داناوە لەسەر زەوی، ئەوەش بەڵگەیە بۆ خوشکانی بەڕێزمان، خوشکانی بەڕێزی ئێمەش دەبێ ئەگەر مێردەکانیان توشی گوناهو تاوان و کوفرو ئیلحاد بون، دەبێ بڵێن: خوایە ڕزگارمان بکەی لەکردەوەی مێردەکانمان، چونکە کردەوەکانیان پیسن، کردەوەکانیان بێ شەرعیین، کردەوەکانیان مایەی توڕەبونی خوان، دەبێت خوشکانی ئێمە تەماشای ئەو ئافرەتە مسوڵمانە بکەن کە خێزانی فیرعەونە،ئینجا دەڵێت: ﴿وَنَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ خوایە لەقەومی زاڵمیش ڕزگارم بکەی، کە مەبەستی قەومی زاڵم دەوروبەری خۆی بووە، خزم و کەسەکانی خۆی بوون، بێزار بوە لە خزم و کەسی خۆیشی چونکە مسوڵمان نەبوون، دەبێ سەنگی مەحەك لەلای ئینسانی مسوڵمان ئیمان بێت، نەك لەبەرئەوەی ئەوە باوکیەتی (با کافریش بێت) هەر فەرمانی بەسەر سەرو بەسەرچاو!، ئەوە لەبەرئەوەی برای دایك و باوکیەتی با کافریش بێ، بەلاّم هەر فەرمانی بەسەر سەرو بەسەرچاو، نەخێر برایەتی ئەگەر ئیمانی تێدا نەما، برایەتی نابێت، دوو برا ئەگەر یەکیان مسوڵمان بێت وئەویتر کافر بێت، میراتی لەیەکتری ناگرن!، باوك وكوڕ ئەگەر

یەکیان کافر بێ و ئەویتر مسوڵمان، میراتی لەیەکتری ناگرن، لەبەرئەوە ئیسلام سەنگی مەحەکەو تەرازووە.

خۆشەویستەکانم: ئەوە ئیمانە!، دەبێت ئیمانمان وابێت، بەهەموو فەقەرەو بەشەکانی ئیسلام، ئەو ئیمانەمان هەبێت، لەسەر بنەمای ئەو ئیمانە بتوانین لەدونیادا شەریعەتی ئیسلام پیادە بکەین.

ئینجا ئەتوانین دەست بە دروستکردنی خاڵی دووەم بکەین، کە لەبەر خاتری خوا یەکتر خۆشویستنە: مادام ئیمانی تەواومان هەبێ ئەوجار لەبەر خاتری خواش یەکتریان خۆش دەوێت، یەکتر خۆشویستن بەدەست خۆمان نیە خۆشەویستەکانم، چونکە پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) فەرموی: (وَلا تُؤْمِنُوا حتّی تَحابُّوا) واتە: ئیمانیشتان نییە هەتا یەکتریتان خۆش نەوێت، جا ئەگەر کەسێك بڵێ من ئیمانم هەیە بەڵام نابێ مسوڵمانیشم خۆش بوێن!، ئەوە ڕاست ناکات!، پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) ڕاست دەکات، ئایا دەکرێ بڵێین پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) ڕاستی نەکردووە؟! ناکرێ، لەبەرئەوە ئینسان ئەگەر ئیمانی هەبێ دەبێت مسوڵمانیشی خۆش بوێن، لەبەرئەوە هەر کەسێك ڕقی لەمسوڵمانان بێتەوە، ئەوە موخالیفی ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەری ﷺ کردووە!، وە بە پێی ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەر ﷺ یان ئیمانی نیە یان ئیمانەکەی زۆر لاوازە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (ثَلاثُ مَنْ كُنَّ فيهِ وَجَدَ حَلاوَةَ الأيمانْ)[١٠] واتە: هەر کەسێك سێ شتی تێدا هەبن ئیمانی تەواوەو شیرنایەتی ئیمانی چێشتووە: (أنْ يَكُونَ اللهُ وَرَسولَهُ أحَبَّ الَيهِ مِمّا سِواهُما) واتە: خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ لە هەموو شتێك زیاتر خۆش بوێن، ئەوە نیشانەی ئیمانی تەواوە، واتە لەپێناوی ڕەزابونی خواو ڕەزابونی پێغەمبەرەکەی ﷺ ئامادەی هەموو شتێك بێت، وە پاشان: (أنْ يُحِبَّ المَرء لا يُحِبُّهُ الّا للّه) واتە: مسوڵمانی

---

[١٠] صحيح البخاري، كتاب الأيمان، باب: حلاوة الأيمان، رقم الحديث ١٦

خۆشبوێن تەنها لەبەر خاتری خوا، وە پاشان پێی ناخۆش بێت بگەڕێتەوە سەر کوفرو نەفامی، وەکوچۆن پێی ناخۆش بێت بیخەنە ناو ئاگر!.

جا یەکترخۆشویستن مەرجی ئیمانە وە بەرهەمی ئیمانیشە، (مَنْ أعطَى للهِ وَمنَع للهِ وأَحَبَّ للهِ وابغَضَ للهِ فَقَد اِستَكمَلَ الأيمان)[11] واتە: هەر کەسێك لەبەر خاتری خوا شت ببەخشێ، وە لەبەر خاتری خوا شت مەنع بکات، وە لەبەر خاتری خوا کەسێکی خۆشبوێت، وە لەبەر خاتری خوا ڕقی لەکەسێك بێتەوە، ئەوە ئیمانی تەواوە!، فەرمودەی پێغەمبەرە ﷺ، پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کرد: (الرَجُلُ يُحِبُّ القَوْمَ ولَمّا يَلْحَقُ بِهِمْ)[12] فەرمویان: یا رسول الله جاری وا هەیە پیاوێك قەومێکی خۆشدەوێت، پیاوێك کۆمەڵێکی خۆشدەوێت بەلاّم لەگەڵیشیاندا نییە ئایا ئەوە حوکمی چیە؟، فەرموی: (المَرءُ مَعَ مَنْ أَحَبْ)[13] ئینسان لەگەڵ ئەو کەسەدا لەقیامەتێ حەشر دەکرێت کە خۆشی ویستووە لە دنیادا، خۆ بەڵێ لەگەڵیاندا نیە بەلاّم کێت خۆشویستبێ لەدونیا لەگەڵ ئەودا حەشرت دەکرێت لەقیامەت.

جا با بۆخۆمان سەر پشك بین لەدونیا کێمان خۆشبوێت؟، یەکتریان خۆشبوێت وەکو مسوڵمان یان کافرو بێ دین و موشریك؟، کە ئەو کاتە لەرۆژی قیامەت لەسەری تووشی عەزاب دەبین، لەبەرئەوە فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر چاوانە، وە ئێمەی نەزان و نەفام ئەگەر جار جار سەرمان لێ دەشێوێ و جار جار لێمان تێك دەچێ، لێمان ون دەبێت، با خۆمان بەو فەرمودە پیرۆزانە وشیار بکەینەوە.

خۆشەویستەکانم، بەکورتی دەڵێم خۆشەویستی بە چەند شتێك دروست دەبێت، لەوانە:

---

١١ سنن أبي داود، كتاب السُّنة، باب: الدليل على زيادة الأيمان ونقصانه، رقم الحديث ٤٦٨١

١٢ صحيح البخاري، كتاب الأدب، باب: علامة حب في الله عزوجل...، رقم الحديث ٥٨١٨

١٣ صحيح البخاري، كتاب الأدب، باب: علامة حب في الله عزوجل...، رقم الحديث ٥٨١٦ و ٥٨١٧

لێبوردن لەیەکتری، وە خۆ بەکەمزانین لەبەرامبەر یەکتری (تواضع)، جا سەبارەت بە چاوپۆشی لەیەکتر کردن و عەفوکردن، ڕاستە خوای گەورە (جل جلالە) لەقورئانی پیرۆزدا لە موقابیلی هەڵەی مسوڵمانێك، لە موقابیلی زوڵمێکی یان تەحەددایەك کە مسوڵمانێك دەیکات تۆڵەی داناوە، بەڵام دەشفەرموێ، ﴿فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ﴾ (٤٠) الشوری، واتە، کەسێك لە موقابیلی تۆڵە سەندنەوە، عەفوی بکات و چاکە لەگەڵ موقابیلی بکات پاداشتی دەکەوێتە لای خوا، جا دەفەرموێ، ﴿وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ (٢٢) النور، واتە: چاوپۆشی لەیەکتری بکەن و یەکتری عەفوو بکەن، ئایا پێتان خۆش نیە خوا عەفووتان بکات؟، زۆر برای مسوڵمان هەیە لەسەر قسەیەکی کەم دڵی لەبرای مسوڵمان دەهێشێ، لەسەر هەڵەیەکی کەم کە مسوڵمانێك لەموقابیلیدا دەیکات، قسەیەکە یان ڕەفتارێکە، بڕیاری خۆی لەسەر ئەدات قسەی لەگەڵ ناکات ئیدی هەتا مردن یان دەڵێ هەتا دەمری گەردنت ئازا نەبێت!، یان دەڵێ قەت لێت خۆش نابم!، ئەو برایەتییە بەو شێوەیە دروست نابێت، ئینسان لەدونیا بێ هەڵە نابێت، تەنها پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) مەعصوم بوون ئەمما ئینسانەکان —تەنانەت صەحابەکانیش- بێ هەڵە نەبوون لە بەرامبەر یەکتری دا، ئایا دەکرێ ئینسان بڵێ نابێ هیچ هەڵەت هەبێت؟، دەی لەو کاتەدا هونەرە ئینسان لە موقابیلی هەڵەیەکدا عەفوی بکا، ئەگەر هیچ هەڵەی نەبن چ عەفو بکەم؟، ئەو کاتە خۆ هونەر نیە!، لەبەرئەوە زۆر برامان هەیە -تەنانەت برای دایك و باوکی- برا لەگەڵ برا قسە ناکات، لەسەر میرات جاری وا هەیە، یان لەگەڵ خوشکەکەی قسە ناکات یان خوشك لەگەڵ برا قسە ناکات، لەبەرئەوەی بەشی لە شتێك نەداوە دەڵێ گەردنت ئازا نەبێ هەتا مردن!، یان ژن و مێرد لە بەرامبەر یەکتری دا ڕۆژێك لەڕۆژان دڵی یەکتریان شکاندووە، ئەو دەڵێ قەت گەردنت ئازا نەبێ تا مردن، وە ئەویش دەڵێ گەردنت ئازا نەبێ!،

یان کوڕ بەرامبەر باوك یان باوك بەرامبەر کوڕ یان دایك بەرامبەر منداڵەکانی وە هەروەها منداڵەکانیش بەرامبەر بە دایك و باوکیان، وە خزمەکان، جیرانەکان، زۆر جار شتی وا دەبێ لەسەر شتێکی کەم، لەسەر منداڵێك، لەسەر بستە زەویەك، لەسەر دارێك، لەسەر چەند دینارێك، لەسەر شتێکی کەم عاجزی دروست دەبێت، پێی دەڵێ گەردنت ئازا نەبێ!، ڕەحمەتی خوا لە ئیمامی شافعی بێت کە کاتێك گفتوگۆی لەگەڵ کەسێك کردوە، پێی خۆش بوە هەق لەسەر زمانی موقابیلی دەرکەوێ، وە خاوەنی عەفوو و سەماحەت بوە[١٤].

پێغەمبەرمان محمد ﷺ لە مەککەدا ئەوپەڕی ناخۆشی و نارەحەتیان بۆ هێنایە پێش، لەکەعبە لە سەجدەدا بووە ورگ و ڕیخۆڵەی حوشتریان بەسەر سەریدا داوە، لەنوێژدا!، لەسەجدە دا!، کە عەبد لە هەموو کاتێك زیاتر لەخوا نزیکە!، هەتا فاطمە ی کچی (ڕەزای خوای لەسەر بێت) هاتووە پیسایی و ڕیخۆڵەی ورگی حوشتری لەسەر سەری لاداوەو پێغەمبەر ﷺ خۆی پێهەڵنەستاوەتەوە، تاوا نەزیەتیان داوە!، لە (طائف) بەرد بارانی دەکەن خوێن بە لاقی دا دێتە خوارەوە!، سێ ساڵان لەدوای کۆچی دوایی ئەبوطالب گەمارۆی ئابووری و کۆمەلایەتی و هەموو لایەنەکانی دەخرێتە سەر کەس هاتو چۆی ناکات، ژن و ژنخوازی لەگەڵ ناکەن، نان و ئاو نییە مەگەر بەنهێنی بەشەو بۆیان بچێ، ناچار دواتر لە مەککەوە کۆچ دەکات بۆ مەدینە، لەگەڵ ئەوەشدا کە فەتحی مەککە دەکرێ، دوای چەند ساڵ لە مەدینە دەگەڕێنەوە بۆ مەککە، پێغەمبەر ﷺ بەئەهلی مەککە دەفەرموێ: ئایا ئێوە پێتان وایە چیتان لێ دەکەم؟!، ئەوانیش دەڵێن (أخٌ كَرِيمٌ وابنَ أخٍ كَرِيم): تۆ برایەکی بەڕێزی و برازایەکی بەڕێزی.. ئێمە وا تەماشات دەکەین، چونکە دەزانن پێغەمبەر ﷺ چۆنە! ئەویش دەفەرموێ: ((إِذهَبُوا فَأَنتُمُ الطُّلَقَاء))[١٥]، فەرموی: دەبڕۆن ئێوە

---

[١٤] وەکو دەفەرموێ: (وَدِدتُ إذا ناظَرتُ أحَداً أن يُظهِرَ اللهُ الحقَّ على يَدَيهِ).

[١٥] ((عن أبي هريرة رضي الله عنه - فذكر الحديث قال فيه فجاءت الانصار فأحاطوا برسول الله صلى الله عليه وسلم عند الصفا فجاء أبو سفيان فقال يارسول الله ابيدت خضراء قريش لا قريش بعد اليوم فقال

هەمووتان ئازاد بن!، ئەو ئازارەی پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام) بەدەست ئەهلی مەککەوە بینیویەتی لەژمار نایەت، چەند ساڵ!، نەك چەند ڕۆژو چەند مانگ!، ئینجا لێرە لەبەرخاتری خوا فەرموی: بڕۆن ئێوە ئازاد بن!.

ئایا ئینسانی مسوڵمان ئەگەر هەڵەیەکی لە موقابیلدا دەکرێت، مسوڵمانێك هەڵەیەکی لە موقابیلدا دەکات، قابیلی ئەوە نییە عەفوو بکرێت؟، یان ژن و مێرد بەرامبەر یەکتری یان براو خوشك، براو برا، خزم و خزم، وە جیران و جیران..، لەبەرئەوە خوا دەفەرموێ: ﴿أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ (٢٢) النـور، واتە: پێتان خۆش نیە خوا عەفووتان بکات، توخوا عەفوو و لێخۆش بوونی لای خوا خۆشترە، ئەجرو پاداشتی لای خوا خۆشترە یان ئینتیقام و تۆڵە سەندنەوەی دونیا؟، جا من بەناوی قورئانی پیرۆز، کە ئایەتی قورئانە بۆتان دەخوێنمەوە، داوا لەهەموو مسوڵمانان دەکەم بەتایبەت

---

من دخل داره فهو آمن ومن القى سلاحه فهو آمن ومن دخل دار أبي سفيان فهو آمن ومن اغلق بابه فهو من - اخرجه مسلم في الصحيح من حديث يحيى بن حسان عن حماد الا انه لم يذكر قوله من دخل داره فهو من - (أخبرنا) أبو علي الروذباري أنبأ أبو بكر بن داسه ثنا أبو داود ثنا مسلم بن ابراهيم ثنا سلام بن مسكين ثنا ثابت البناني عن عبد الله بن رباح الانصاري عن أبي هريرة رضى الله عنه ان النبي صلى الله عليه وسلم لما دخل مكة سرح الزبير بن العوام وابا عبيدة بن الجراح وخالد بن الوليد على الخيل وقال يا ابا هريرة اهتف بالانصار قال اسلكوا هذا الطريق فلا يشرفن لكم احد الا انمتموه فنادى منادى لا قريش بعد اليوم فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم من دخل دارا فهو آمن ومن القى السلاح فهو آمن وعمد صناديد قريش فدخلوا الكعبة فغص بهم وطاف النبي صلى الله عليه وسلم وصلى خلف المقام ثم أخذ بجنبى الباب فخرجوا فبايعوا النبي صلى الله عليه وسلم على الاسلام - زاد فيه القاسم بن سلام بن مسكين عن ابيه بهذا الاسناد قال ثم أتى الكعبة فأخذ بعضادتى الباب فقال ما تقولون وما تظنون قالوا نقول ابن اخ وابن عم حليم رحيم قال وقالوا ذلك ثلاثا فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم اقول كما قال يوسف (لا تثريب عليكم اليوم يغفر الله لكم وهو ارحم الراحمين) قال فخرجوا كانما نشروا من القبور فدخلوا في الاسلام - (أخبرناه) أبو بكر بن المؤمل أنبأ أبو سعيد الرازي ثنا محمد بن أيوب أنبأ القاسم بن سلام - فذكره (وفيما حكى الشافعي) عن أبي يوسف في هذه القصة انه قال لهم حين اجتمعوا في المسجد ما ترون اني صانع بكم قالوا خيرا، اخ كريم وابن اخ كريم قال اذهبوا فانتم الطلقاء)) سنن الكبرى، جزء ٩، كتاب السير، باب: فتح مكة حرسها الله تعالى، صفحة ١٩٩، رقم الحديث ١٨٢٧٥.

لەڕۆژگارێکی وەکو ئەمڕۆدا، ئەو شتە بچوك و گچکەلانە لەنێوان یەکتری نەخوێننەوە، دایك و باوك لەبەرامبەر منداڵەکانیان، ژن و مێرد لەبەرامبەر یەکتری دا، خوشك لەبەرامبەر برا دا بەپێچەوانەوەش..، خزم و کەس، جیران و جیران، هەمووتان گەردنی یەکتری ئازاد بکەن، ئەجرتان دەکەوێتە لای خوا (جل جلاله)، کێ پێی خۆش نیە خوا عەفووی بکات؟، پاداشتی لای خوات دەوێ یان ئەو شتەی کە وتووتە: کە دەڵێی گەردنی ئازاد ناکەم..!، نا.. لەبەر خاتری خوا بڵێ: خوایە گیان لەبەر خاتری تۆ گەردنی هەموو مسوڵمانێکی سەر ڕووی زەوی ئازاد بێ!، لە ئافرەتان و لە پیاوان، با هەقی منیشیان لەسەر بێ، مادام ناتوانێ بمداتەوەو، مادام منیش ناتوانم لێی وەربگرمەوە.

**بەڵێ خۆشەویستەکانم، پاشان خۆ بەکەمزانین:** ئەوەش بەڕاستی خاڵێکی ترە کە کات مۆڵەتم نادات لەسەری بڕۆم، بەلام دەبێ بەڕاستی ئەو ئایەتەمان لەبەر چاوبێ کە خوای گەورە (جل جلالە) دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَمْشِ فِي الأَرْضِ مَرَحًا﴾ (٣٧) الإسراء، واتە: لەسەر زەوی بە خۆبەزلزانین(تَکَبُر)ەوە مەڕۆ، بۆ خۆت لێ دەگۆڕێ مسوڵمان؟، خۆت بەچی دەزانی؟، لەسەر زەوی کەشخە(تَکَبُر) لێمەدە!، ﴿إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ الأَرْضَ وَلَن تَبْلُغَ الْجِبَالَ طُولاً﴾ (٣٧) الإسراء: خۆ نەنەتوانی زەوی شەق بکەی، وە نە ئەتوانی درێژاییەکەت بگاتە شاخەکان!، ئیقتیدا بە پێغەمبەرەکەتەوە ﷺ بکە، خوا (جل جلاله) ئەفەرموێ: ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا﴾ (٢١) الأحزاب، پێغەمبەرەکەمان (علیه الصلاة والسلام) بەلای پیرەژنێك دا تێپەڕیوە کۆڵەدارێکی لێکەوتووە، کۆڵەدارەکەی لەسەر پشتی خۆی داناوەو بۆی هەڵگرتووە، خۆی بەگەورە نەگرتووە، پێغەمبەرەکەمان (علیه الصلاة والسلام) گەورەترینی خەڵقە لەسەر ڕوی زەوی، ئەنجا نمونەیە بۆ ئێمە، نە خانوی جیا بووە لە صەحابەکان!، نە خواردنی جیا بووە لەصەحابەکان!، نە جلوبەرگی جیا بووە

لە صەحابەکان!، کابرا هاتۆتە لای پێغەمبەر (علیـه الـصلاة والـسلام) لەگـەڵ صەحابەکان دانیشتووە، وتویەتی: (أَيُّكُم مُحَمَّدٌ)[١٦] کێتان (محمد)ە؟!، چونکە نە جلو بەرگی جیا بووە!، نە قەسری جیا بووە، نە سەیارەی جیا بووە -واتە ئەسپ و وشتری سواری ئەوکاتە-، نە خانووی جیا بـووە، جـاری وا هـەبووە مێـوانی هـاتووە، صـەحابەیەك فەرمویـەتی: کـێ میـوانی پێغەمبـەر (علیـه الـصلاة والـسلام) دەباتەوە ماڵی خۆی؟، نان نەبوە لە ماڵی خۆی!، لەبەرئـەوە ئێمـەش بەڕاستی ئەگەر بمانەوێ بچینە بەهەشت، ئەو بەهەشـتەی پێغەمبـەر محمـدﷺ لێیەتی، وە صەحابەکانی لێن، دەبـێ ئێمـەش بڵـێین خوایـە گیـان ئێمـەش وا لێبکەو وەکو ئەوان بین، ئەگەر هەرنا تۆزێك بە ئەوان بچین، بـۆ ئـەوەی لەگـەڵ ئەوان بچینە بەهەشت، با ئێمەش خۆبەکەمگیری(تواضـع) مـان هـەبێت و خـۆ بەکەم بزانین، با بەخۆبـەرسامبوون(عُجب) نەمان گرێ، چونکە {لـەخۆڕازیبوون و بەخۆبـەرسامبوون} گوناهێکی گەورەیە!، ئەگەر کەسێك پێمـان بڵـێ لـەخوا بترسە یان ئاگات لەخۆت بێت، یان لەسەر ڕێگای ڕاست بە یان ئـەو هەڵەیـەت چاك بکەوە، با لە خۆمانەوە توڕە نـەبین!، بـەڵکو بـا قـسەی خێـر وەرگـرین، وەلاهی برای ڕاستەقینە ئەو کەسـەیە کـە ئامۆژگـاری چـاکت دەکـات، بـرای ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کە ڕێگای بەهەشتت نیـشان دەدات، بـرای ڕاسـتەقینە ئەو کەسەیە کە دەستت دەگرێ و لە گوناهان دەتگێڕێتەوە، نەك ئەو کەسـەی لە دونیادا مووچە(مەعاش)ت بۆ دەبڕێتەوە یان پـارەت بـۆ پەیـدا دەکـات!، یـان مەسڵەحەتێکی دونیات بۆ جێ بەجێ دەکات!، بەڵکو خوشك و برای ڕاستەقینە ئەوانەن کە ئامۆژگاری چاك پێشکەش بەتۆ دەکەن، لەبەر ئەوە مەمنونیان بە!، دەست خۆشییان لێبکە!.

---

[١٦] صحيح البخاري، كتاب العلم، باب: مايذكر في المناولة، رقم الحديث ٦٣

جا له خوای گەورە داواکارم که ئەو چەند سیفەتەمان تێدا بێنێتەدی بۆ ئەوەی برایەتی ڕاستەقینەمان هەبێ، کە ئیمان و یەکترخۆشویستن برایەتی ڕاستەقینە دروست دەکات، یەکتر خۆشویستنیش بە لەیەکتری بوردن و خۆ بەکەمزانین بەرامبەر بە یەکتری و چاکەو هاوکاری یەکتری وسەلام لەیەکتری کردن و پەرۆشی یەکتری و (إیثار) واتە خەڵك هەڵبژاردن بەسەر خۆت و بەمانای وشە برایەتیی دروست دەبێت، یارەببی خوایە برایەتی ڕاستەقینەمان بۆ دروست بکەی، خوایە ئیمانمان سەلامەت بکەی، چونکە ئەگەر ئیمانمان سەلامەت بێ ڕەزابونی تۆو بەهەشتی بەرینمان هەیە، یارەببی خوایە لە خراپەوە هیدایەتمان بدەی بۆ چاکە، خودایە ئەوەی چاکە چاکتری بکەی، ئەوەی خراپیشە هیدایەتی بدەی، خوایە داوات لێ دەکەین و لەتۆ دەپاڕێینەوە هێمنی و ئەمن و ئاسایش بۆ وڵاتەکەمان بنێری، یارەببی خوایە لەناخۆشی و نارەحەتیەکان بمانپارێزی و دوورمان بکەیەوە، یارەببی خوایە ئەو گەردەلول و ڕەشەبایەی کە لەدونیادا بەرێوەیە بۆ وڵاتانی لاوازو مسوڵمان، خوایە لە هەموو مسوڵمانانی لادەی، یارەببی خوایە ئەوەی کە خێری بۆ ئیسلام دەوێ تەوفیقی بدەی، یارەببی خوایە ئەوەی شەڕیشی بۆ مسوڵمانان دەوێ، خوایە پشتی بشکێنی، یارەببی خوایە خۆشەویستیمان لەنێوانـدا زیاتر بکەی و هەڵوێستەکانمان لەگەڵ یەکتری شەرعیی و باش و جوان بن.

ئامین

أقول قولي هذا وأستغفر الله لي ولكم ولسائر المسلمين،

أعوذ بالله من الشيطان الرجيم

{رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ} أمين.

## ئیسلام ئەمانەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

إنَّ الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونستهديه، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضلَّ له ومن يضلل فلا هادي له، ونشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له ونشهد أنَّ سيدنا ونبينا محمداً عبده ورسوله، هذا الرسول الذي بلّغ الرسالة وأدى الأمانة ونصح الأمة وجاهد في الله حق جهاده وتركنا على المحجة البيضاء، ليلها كنهارها، لايزيغ عنها إلا هالك، صلواة الله وسلامه عليه وعلى أله وأصحابه، ومن تبعه الى يوم الدين ...، أما بعد يا عبادالله أوصيكم ونفسي أولاً بتقوى الله وطاعته، فإنّ الله مع الذين اتقوا والذين هم محسنون، قال الله سبحانه وتعالى في كتابه الحكيم، بسم الله الرحمن الرحيم: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ (١) النساء.

ئیماندارانی بەڕێز، ئەی ئومەتی محمد المصطفى ﷺ، میهرەبانی و ڕەحمەتی خوای گەورە(جل جلاله) بڕژێ بەسەر ئێمەی مسوڵمان و هەموو مسوڵمانانی دونیا لەم ڕۆژە پیرۆزەدا.

خۆشەویستەکان، هەموو ماندوو بونێکی ئینسان، بۆ ئەوەیە کە خوای پەروەردگار لەخۆی ڕازی بکات، وە خوای پەروەدگار (جل جلاله) ئەگەر نیعمەتی ڕەزابونی خۆی ڕشت بەسەر عەبدەکاندا گەورەترین نیعمەتی پێداون، وەکو دەفەرمووی: ﴿وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللّهِ أَكْبَرُ﴾ (٧٢) التوبة، واتە: ڕەزابونی خوای پەروەردگار گەورەترین نیعمەتە، وە بێگومان ئینسان ناتوانێ ئەو نیعمەتە وەدەست بێنێ هەتا کۆمەڵێك پلەو کۆمەڵێك دەرەجە هەن وەدەستیان نەهێنێ، ئەوجا دەبێ بە خۆشەویستی خوا جل جلاله (حبیب الله) ، یەکێك لەو دەرەجانە

دەرەجەی ئەمینداریتییە، ئینسان ببێ بە ئەمین، ئەو کاتە خوای پەروەردگار (جل جلاله) خۆشی دەوێت، ئەو پلەیەی کە خوای گەورە (جل جلاله) داویەتی بە پێغەمبەران (علیهم الصلوات والسلام)، کە لەقورئانی پیرۆزدا وەختێك پێغەمبەران ئامۆژگاری ئوممەتەکانی خۆیانیان کردووە، پێیان گوتوون (انّي لَكُمْ ناصِحُ أمينْ) وتویانە: ئێمە بۆ ئێوە مامۆستایەکی دڵسۆزو ئەمینداریین و بەخەمین بۆ ئێوە، وشەی (أمین)، نیعمەتی ئەمینداریەتی، کە گەورەترین نیعمەتە خوای پەروەردگار (جل جلاله) بۆ ڕەزابونی خۆی داویەتی بە پێغەمبەران (علیهم الصلوات والسلام).

ئینجا پێغەمبەرانیش ئەو پلەیەیان بەخشیوە بە شوێنکەوتوانی خۆیان، وە بە تایبەتی زانایان و مامۆستایانی ئاینیی، کە ڕێبازی ئەو پێغەمبەرە پیادە ئەکەن ﷺ، کە لە فەرمودەیەکدا فەرمویەتی: (الفُقَهاءُ أُمَناءُ الرُسُلِ ما لَم يَدخُلُوا فِي الدُنيا وَيَتبَعوا السُلطان فَإذا فَعَلُوا ذالِكَ فَاحذَروهُم[17]) واتە: زانایان ئەمینداری پێغەمبەرانن (علیهم الصلوات والسلام)، بەلام بەمەرجێك لەگەڵ دونیا تێکەڵ نەبووبن و بەدوای دەستەلاتداران نەکەوتبن و ملکەچیان نەبووبن، بەلام ئەگەر تێکەڵ بوون لەگەڵ دەسەلاتدارانی دونیاخۆرو دونیا پەرست ئەوکاتە پێغەمبەر ﷺ بە ئوممەتەکەی خۆی دەفەرمووی: (فاحذَروهُمْ) خۆتان لەو زانایانە بپارێزن، وەختێك زانا شوێنکەوتووی پێغەمبەرە ﷺ کە ڕێبازەکەی ئەو بگرێتەبەر، سوننەتی ئەو جێبەجێ بکات کە بریتیە لە ڕاگەیاندنی حەقەیقەتی خواپەرستی و دینی ئیسلام، چونکە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: (العُلَماءُ وَرَثَةُ ألانبياءْ)[18] واتە: زانایان میراتگری پێغەمبەرانن (علیهم الصلوات والسلام)، بەلام بابزانن کە

[17] العسكري من حديث العوام بن حوشب عن أبي صادق عن علي به مرفوعا وهو ضعيف السند. انظر: (المقاصد الحسنة في بيان كثير من الاحاديث المشتهرة على الالسنة)، صفحة ٣٠٧، رقم الحديث ٧٤٦.

[18] صحيح ابن حبان (الطبعة الثانية-مؤسسة الرسالة/بيروت)، كتاب العلم، ذكر وصف العلماء، رقم الحديث ٨٨

پێغەمبەران (علیهم الصلواة والسلام) دینارو درهەمیان بەجێ نەهێشتووە، بەڵکو زانستیان جێهێشتووە، بەڵکو ڕاگەیاندنی ئەو زانستەیان کەوتۆتە سەر شان، بۆیە فەرمووی: وەختێك زانایان ئەمینداری پێغەمبەرانن (علیهم الصلواة والسلام) کە لەگەڵ دونیا تێکەڵ نەبن، شوێنی دونیا نەکەون، دونیا هەڵیان نەخەڵەتێنێ، شیعاری ئەو دینە بەرز بکەنەوە، شیعاری ئەو دینە پاکە ڕابگرن، ئەو کاتە دەبن بە ئەمینداری پێغەمبەران (علیهم الصلواة والسلام).

بەڵێ خۆشەویستەکانم: وشەی (أمین)، نیعمەتی ئەمینداریەتی، پێغەمبەریش (علیه الصلاة والسلام) بەخشیویەتی بە ئوممەتەکەی خۆی و لەسەروی هەموشیانەوە ئەو ماموّستایانەی کە بەحەقیقەت دینی خوا ڕادەگەیەنن و شوێنکەوتوی پێغەمبەرانن (علیهم الصلواة والسلام)، هەروەکو بە ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەراحی فەرموو (أمينُ هذهِ الأمه)[19]: ئەوە ئەمینی ئەو ئوممەتەیە، ئەمینی ئەو ئوممەتە ئەبو عوبەیدەی جەراحە (ڕەزای خوای لەسەر بێت) کە یەکێکە لە {عشرة المبشرة}[20].

خۆشەویستەکانم، ئەمینداریەتی پلەو پایەیەکی چەندە گەورەیە لە ئیسلامدا؟، وە ئێمەی مسوڵمان چۆن ئەو پلەیە وەدەست دەهێنین؟، بۆئەوەی خوای پەروەردگار خۆشی بوێین، وە ئەمانەت چی یەو چەند جۆری هەیە؟، خوای پەروەردگار پشتیوانیمان بکا لە وتاری ئەمڕۆی هەینی دا لەسەر ئەو باسە دەدوێین، هیوادارم هەموومان گوێچکەی دڵمان هەڵخەین بۆ ڕێ نیشاندان و ڕێنموونی (رَبُّ العالَمينْ)، ڕێ نیشاندان و ڕێنموونی پێغەمبەری ئەمین ﷺ، بۆئەوەی ئێمەی مسوڵمان بزانین ئەرك(وظيفة) ی ئێمە چی یە هەتا بگەینە ئەو پلەیە، بۆ ئەوەی خوای پەروەردگار خۆشی بوێین.

---

[19] صحيح البخاري ، كتاب المغازي، باب: قصة أهل نجران، رقم الحديث ٤١١٩، وفي صحيح مسلم: كتاب فضائل الصحابة، باب: فضائل أبي عبيدة، رقم الحديث ٢٤١٩

[20] دە هاوەڵە موژدە پێدراوەکە کە پێغەمبەرﷺ موژدەی بەهەشتی پێدان{ ڕەزای خوایان لێبێ}.

خۆشەویستەکانم، ئەمانەت پێچەوانەکەی خیانەتـە، (أمـین) پێـچەوانەکەی (خائن)ە، جا بەراوردیان بکە، بزانە وشەی ئەمانەت لەگەڵ ئەمین، بەرامبەر بە خیانەت وخائین چەندە جیاوازیان هەیە؟، چەند خۆشە بە یـەکێك بڵـێن ئـەهلی ئەمانەتە، چەند خۆشە بە یەکێك بڵێن {ئەمین}ە، بەلاّم چـەند ناخۆشـە کـاتێ ئینسـان گوێی لە وشەی خیانەت و خائین دەبێت، ئینسانی ئەمین لەناو میللەت و ئاوەدانیدا ناسراوە، خۆشەویستە، بـاوەڕ پێکـراوە، جێگـای بـاوەڕە، خـەڵك خۆشیان دەوێ چونکە کاری مـسـوڵمانان ڕادەپـەڕێنێ، مـسـوڵمانان کـاری پـێ دەسپێرن، بەلاّم ئینسانی خائین خەڵك ڕقی لێیەتی، بەلایدا تێناپـەڕێ، دوعـای لێدەکرێ، بەڵکو کەس ناچێتە ماڵی، کەس خۆشـی نـاوێ، کـەس پـرس و ڕای پێناکات، بەلاّم بەپێچەوانەوە ئینـسانی ئـەمین و دەسـت پـاك و داوێـن پـاك، خۆشەویستە لەلای خەڵك، خۆشەویستە لەلای خوا (جل جلاله)، جا بۆیە زانایان فەرمویانە: هەر کاتێك کۆمـەڵگای ئینسان ئەمینی تێدا نەما، ئەوە دونیا تێك دەچێ، چونکە یـەکێك لە نیشانەکانی ئاخیر زەمـان ئەوەیە ئەمین کەم دەبـن، وە ئینسـانی ئەمین نامێنن، بۆیە فـەرموودەی پێغەمبـەرە ﷺ دەفـەرمووی: لـە ئاخیر زەماندا کە ئەمانەت کەم دەبێ و ئەمین کەم دەبن، دەگوترێ: (إنَّ في بَني فُلانَ رَجُلاً أميناً)[٢١] واتە: لە ئاخیر زەماندا دەڵێن فلاّن تـیرە، فـلاّن عەشـیرەتە پیاوێکی ئەمینی تێدایە!، ئەوەندە ئەمین کەم دەبن!!.

خۆشەویستەکانم، بۆیە ئینسـان ئەگەر بەراوردێك بکات لـەنێوان ئەمیـندارو خائین دا، ئەو جیاوازیە گەورەیەی بۆ دەکەوێت، عەلی کوڕی ئەبو طالب (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە دەفەرمووی[٢٢]: ئێمە لە خزمـەت پێغەمبـەر (علیـه الصلاة والسلام) دانیشتبوین، پیاوێك هات و گـوتی: (یـا رَسـولَ الله، أخبِرنـي

[٢١] صحیح البخاري، کتاب الرقاق، باب: رفع الأمانة، رقم الحدیث ٦١٣٢

[٢٢] مسند البزار، رقم الحدیث ٨١٩

بِأشَدِ شَيءٍ في هذا الدّينِ وأليَنِـهِ) گوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا گـەورەترین و قورسترین شتم پێ بڵێ لەو دینەدا وە ئاسانترین شتیشم پێ بڵـێ لـەو دینـەدا، فەرمووی: (أليَنُهُ شَهادَةُ أنْ لا الـه الّـا الله وأنَّ مُحَمَّـداً رَسُـولُ الله) فـەرمووی: ئاسانترینیان ئەوەیە ئینسان بڵێ (أشهدُ أن لا اله الا الله وأشهدُ أن محمدا رسـول الله)، شایەتمان بێنێ، ئـەو دوو شـایەتیە هەقیقیـە بێنـێ، کـە هـەموو کـەس نەتوانێ ئەوە بڵێ، ئەوە ئاسـانترینیانە!، وە فەرمووی: گەورەترین و قورسترینی ئەرکی ئەو دینە بریتی یە لە (الأمانة) ئەمانەت!، (إنَّهُ لا دينَ لِمَنْ لا أمانَةَ لَهُ) فەرمووی: هیچ ئینسانێك دینی نیە ئەگەر ئەمانەتی نەبێ، وە فـەرمووی: (وَلا دينَ لِمَنْ لا عَهْدَ لَـهُ) واتە: ئینسـان دینی نیـە ئەگـەر پـەیمان (عهـد)ی نـەبێ، خاوەنی بەڵێن و پەیمانی خۆی نەبێ، ئەگـەر بـەڵێنی دا نەیباتـە سـەر، ئەگـەر ئیمزای کرد ئیمزایەکە نەباتە سەر، ئەگەر پـەیمانی دا پەیمانەکـە نەباتـە سـەر، ئـەگەر کەسێك پەیمانی شکاند ئەوە دینی نیە!، یان دین وئیمانی لاوازە.

بەڵێ خۆشەویستەکانم، فەرمووی: (وَلا صَلاةَ لَهُ وَلا صِيامَ لَه) واتە: نوێژیشی نیە، وە ڕۆژووشی نیە، واتە کەسێك ئەگەر ئەمانەتی نەبێ، نوێژیشی بەکەڵك نایـەت، وە ڕۆژوشی بەکەڵك نایەت بەپێی ئەو فەرمودەی پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام).

جا بۆیە ئەمانەت ئەگەر نەما، سیفەتی دووڕوویی (نفاق) لە ئینسـاندا پەیدا دەبێ!، چونکە پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) فەرمووی: (آيَةُ المُنافِقِ ثَـلاث: إذا حَدَّثَ كَذَبَ، وإذا وَعَدَ أخلَفَ، وأذا اؤتِمنَ خـانَ)[٢٣] واتە: نیـشانەی ئینـسانی دووڕووی کردەیی سێ شتن، یەکەم: ئەگەر قسـەی کرد درۆ بکات، زمانی بـەدرۆ بێت، دووەم: ئەگەر پەیمانی دا، پەیمانەکەی خۆی جێ بـەجێ نـەکا، جـا پـەیمان لەگەڵ خوا (جل جلاله) بدات یان پەیمان لەگەڵ عەبدەکانی خوا بدات، سێ یـەم:

٢٣ صحيح البخاري ، كتاب الأيمان، باب: علامة المنافق، رقم الحديث ٣٣، وفي رقم أخرى ٢٥٣٦ في كتاب الشهادات، باب: من أمر بإنجاز الوعد وفعله الحسن...

کاتێك خەڵك بە ئەمینی دادەنێ خیانەت بکات، وە خیانەت دەکات لەخوا، خیانەت دەکات لە پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام)، خیانەت دەکات لە ئیسلام، خیانەت دەکات لە خەڵك، ئەوە نیشانەی ئینسانی دووڕووە، هەرکەسێك ئەوانەی تێدا بوون ئەوە سیفاتی دووڕوو(مُنافِق)ی تێدا هاتۆتە دی.

بۆیە نەمانی ئەمانەتیش یەکێك لە نیشانەکانی قیامەت، چونکە پێغەمبەر(علیە الصلاة والسلام) فەرمووی: (إذا ضُيِّعَت ألأمانَةُ فَأنتَظِر السـاعَةْ)[٢٤] فەرمووی: ئەگەر ئەمانەت بە زایەع درا، پشتگوێ خرا، جێ بەجێ نەکرا، ئەوە چاوەڕێی هاتنی قیامەت بکەن!، یەکێك فەرمووی: (يا رَسُولَ اللّه، وَما تَضيِعُها؟) واتە: ئەمانەت بەزایەدان چی یە؟، چۆنە؟ لە وەڵامدا فەرمووی: (أذا أُسنِدَ الامرُ الي غَيرِ أهلِه) فەرمووی: کار بسپێردرێ بە کەسانی ناشیاو، کەسانی نائەهل، ئەوە یەکێکە لە نیشانەکانی قیامەت و ئەوە ئەمانەت بەزایەدانە، وەختێك کەسانێك دەبنە پێشەوای ئوممەت و پێشەوای خەڵك، کە ئەهلی ئەو شوێنە نین، شایەنی ئەو شوێنە نین، جا هەر لە سەرۆکی دەوڵەتەوە بگرە هەتا خوارێ، هەتا کوێخاو هەتا ئەنجومەنی دێیەك، ئەگەر بڕیارو پرس و ڕای خەڵك و ئەمرو فەرمانی خەڵك کەوتە دەستی خەڵکی ناشیاو، ئەوە ئەمانەت بەزایە چوەو چاوەڕێی هاتنی قیامەت بکەن.

خۆشەویستەکانم، ئایا چۆن دەتوانین پلەی ئەمانەت وەدەست بێنین؟، ئەمانەت چەند جۆری هەیە لە ئیسلامدا؟، با هەمووومان گوێ بگرین لە فەرموودەی (ربُّ العالمینْ)، کەخوای گەورە (جل جلاله) دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَخُونُواْ اللّهَ وَالرَّسُولَ وَتَخُونُواْ أَمَانَاتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ (٢٧) الأنفال، واتە: ئەی ئیمانداریـنە، خیانەت لەخوا مەکەن، وە خیانەت لە پێغەمبەری خوا ﷺ مەکەن، وە خیانەت لە سپاردەکانتاندا مەکەن واتا

---

[٢٤] صحيح البخاري، كتاب الرقاق، باب: رفع الأمانة، رقم الحديث ٦١٣١

ئەوشتانەی كە خوای گەورە پێی داون و نیعمەتی خوان بۆ ئێوە وەك عەقڵ و ئەندامەكانی لەش و عیلم و...لەكاتێكدا كە ئێوە ئەوە دەزانن.

كەواتە **یەكەمیان:** كاتێك ئینسان دەبێ بە ئەمین، ئەو نیعمەتە گەورەی پێ ئەدرێ، كە لەگەڵ خوادا ڕاست بێ، لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ڕاست بێ، لەگەڵ ئیمانداراندا ڕاست بێ، هەر وەختێك ئینسان خیانەتی لە خواو پێغەمبەر نەكرد، وە پاشان خیانەتی لە مسوڵمانان نەكرد، ئەوكاتە دەبێتە ئەمین، دووەمیش: لەو ئایەتەدا بۆمان دەردەكەوێ كە ئەمانەت چەند جۆرێكن، هەتا ئێستا خەڵكی مسوڵمانی ئێمە زۆربەی وا حاڵی بووە كە ئەمانەت تەنها بریتی یە لەوەی كەسێك بێت پرێسكەیەكت لەلا دابنێ، یان شتێكت لەلا بەجێ بهێڵێ، بڵێ ئەوە ئەمانەت بێ هەتا دەگەڕێمەوە، بەڵام ئەمانەت هەر ئەوە نییە، بەڵكو ئەوە بچووكترینی بەشی ئەمانەتە!، بۆیە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: ئەگەر كەسێك ئەمانەتی نەبێ، دینی نیە، ئینسان بە شتێكی ئاوا لەدین ناچێتە دەر!، كەوابوو ئەمانەت شتێكی گەورەترە، كە ئێمەی مسوڵمان بەراوردمان نەكردووەو لێ حاڵی نەبووین و تێی نەفكریوین و نەچووینەتە ناو ناوەڕۆكی قورئانەوە تابزانین هەقیقەتی ئەمانەت چی یە، ئەمانەتی گەورە چی یەو ئەمانەتی بچوك چی یە، بۆیە دەڵێین وەكو زانایان فەرمویانە: ئینسان كۆمەڵێك هەقی لەسەرە، هەقی خوا (جل جلاله)، وە هەقی خەڵك، ئەوەی هەقی خوایە پێی دەگوترێ (حَقُّ الله)، ئەوەی كە هەقی خەڵكە پێی دەگوترێ (حقُّ الناس)، هەموو ئەو مافانەی كە دەكەونە سەر ئینسان ئەمانەتن بەرامبەر بە خوا (جل جلاله) و بەرامبەر بەخەڵك.

خۆشەویستەكانم، با بزانین گەورەترینی ئەمانەت چی یە؟، گەورەترینی ئەمانەت بریتی یە لەو دینەی كە بۆمان هاتووە، بریتی یە لەو قورئانە كە لەبەر دەستمان دایە، چونكە خوا (جل جلاله) فەرمووی: ﴿إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ

عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الْإِنسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا﴾ (٧٢) الأحزاب، واتە: ئێمە ئەو ئەمانەتەمان ناردەسەر ئاسمانەکان و زەوی و شاخەکان، بەلاّم قبولّیان نەکرد، ئەوە خوا (جل جلالە) ئەفەرمووێ! ئەمانەت چی یە؟!، ئەمانەت واتە فەرمانبەرێتی، طاعەت و بەندایەتی، واتە ملکەچ بون بۆ خوا (جل جلالـە)، ئاسمانەکان نەیانتوانی بلّێن خوایە ئەتوانین ئەو ئەمانەتە هەلّگرین!، شاخەکان نەیانتوانی!، زەوی نەیتوانی!، ﴿فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا﴾ گوتیان پێمان هەلّناگیرێ، بەلاّم خوای گەورە (جل جلالە) ڕووی لە ئادەم کرد، پێی فەرموو: ئەی ئادەم ئەتۆ ئامادەی ئەو ئەمانەتە هەلّگری؟، گوتی: (یا ربّی) ئەو ئەمانەتە چی تێدایەو چی بکەم باشە؟، خوا پێی فەرموو: ئەگەر گوێڕایەلّیم بکەی پاداشتی بەهەشتت دەدەمێ، ئەگەر گوێڕایەلّیشم نەکرێ، سزای ئەو کەسە ئەدەم کە ئەمانەتم ڕاناگرێ و گوێڕایەلّیم ناکات، ئەفەرمووێ ئادەم هەلّی گرت، بۆیە ڕاڤەوانان(مفسرین) دەفەرمون: کاتی خۆی خوای پەروەردگار (جل جلالە) ئاوای بە ئادەم (علیە الصلاة والسلام) فەرمووە، بابە گەورەی ئێمە، یەکەم پێغەمبەری ئینسان بۆ سەر زەوی، ﴿وَحَمَلَهَا الْإِنسَانُ﴾: ئینسان هەلّی گرت، بەلاّم ﴿إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا﴾ (٧٢) الأحزاب، واتە: هەرچەندە ئەمانەتەکەی هەلّگرت بەلاّم ستەمکارو نەزانیشە، نەیزانی هەقیقەتی ئەو ئەمانەتە چەندە گەورەیە!، بەلّێ ئێستا ئەو ئەمانەتەمان هەلّگرتووە!، ئەو ئەمانەتە بریتی یە لەدین، بۆیە پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) لە ڕۆژی قیامەت لەلای خوای پەروەردگار (جل جلالە) شکایەت دەکات لە ئوممەتەکەی خۆی ئەگەر دینیان پشتگوێ خستبێ، خۆیان لێ بەری دەکات، قورئان لەسەر زمانی ئەو پێغەمبەرە ﷺ دەفەرمووی: ﴿وَقَالَ الرَّسُولُ يَا رَبِّ إِنَّ قَوْمِي اتَّخَذُوا هَذَا الْقُرْآنَ مَهْجُورًا﴾ (٣٠) الفرقان، واتە: ئەی پەروەردگارا ئوممەتەکەی من لەدوای من وازیان لەقورئان

هێنابوو، وازیان لە ئەمانەتی خوا (جل جلالە) هێنابوو، چونکە هەرکەسێك لەو دونیایەدا واز لە ئەمانەتی خوا بێنێ کە دینی خوایە، پشتگوێی بخات و پیادەی نەکات، گرنگی پێ نەدات، خوای گەورە (جل جلالە) هەم لە دونیا کوێری دەکات هەم لە قیامەتیش بەکوێری حەشری دەکات!، کوێری کوێری چاو نی یە!، بەڵکو کوێری دڵ!، ئینسان بەدڵ کوێر بێ ئەوە موسیبەتێکی گەورەیە!، وەکو خوای گەورە (جل جلالە) فەرمووی: ﴿فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ﴾[25] (٤٦) الحج. ﴿وَمَن كَانَ فِي هَذِهِ أَعْمَى فَهُوَ فِي الآخِرَةِ أَعْمَى وَأَضَلُّ سَبِيلاً﴾[26] (٧٢) الإسراء. ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى﴾[27] (١٢٤) طه.

ڕۆژی قیامەت لەسەر حەوزی کەوسەر کۆمەڵێك لە ئوممەتی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەیانەوێ بێن ئاو بخۆنەوە، مەلائیکەتەکان ڕێگا نادەن، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) کە ئەو کاتە لەوێیە، دەفەرمووێ: ئەی مەلائیکەتەکان بۆ ڕێگا نادەن، ئەوانە ئوممەتی من بوون، ئەوانیش دەفەرموون: ئەوانە لەدوای تۆ دینی تۆیان گۆڕی و ڕوویان لەدینی تۆ وەرگێڕا، ئا لەوێ پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بەو کەسانە دەفەرموێ: (سُحقاً سُحقاً لَکُم)[28]، واتە: بەهیلاك بچن یاخوا، بەهیلاك بچن کە ئاواتان کرد، بۆ واتان کرد، بۆ دینی خواتان پشتگوێ خست، بۆ ڕێبازەکەی منتان پشتگوێ خستوە؟.

---

[25] واتە: ..جا وەنەبێ چاوان کوێر بووبن، بەڵکو ئەو دڵانە کوێر دەبن کە وان لە سینەکاندا {چونکە هەر ڕەواڵەت دەبینن و ناوەڕۆك لێك نادەنەوە}.

[26] واتە: جا ئەوەی لەم دنیایەدا - دڵ و دەروون و بیروهۆشی- کوێربێت، ئەوە لە قیامەتدا چاوی کوێرەو زۆر سەرگەردانتر و سەرلێشێواوترە!، چونکە چاوی سەری بۆ بینایی و تێفیکرین بەکارنەهێناوە لە دنیادا.

[27] واتە: ئەوەش کە ڕوو وەربگێڕێت لە بەرنامەو یادی من و پشتی تێ بکات، بێگومان بۆ ئەو جۆرە کەسانە ژیانێکی تاڵ و ناخۆش دێتە پێش، لە ڕۆژی قیامەتیشدا بەکوێری حەشری دەکەین ..

[28] صحیح البخاري، کتاب الرقاق، باب: في الحوض وقول الله تعالی (إنا أعطيناك الكوثر...).

بۆیە خۆشەویستەكانم، گەورەترین ئەمانەت بریتی یە لە هەڵگرتنی ئەو دینە، ئێمە ئێستا ئەو دینەمان هەڵگرتوەو مسوڵمانین، باوەڕمان بەخوا هەیە، باوەڕمان بەو دینە هەیە، ئەگەر بەشێوەیەكی ڕێك و پێك ئەو ئەمانەتە هەڵنەگرین، ئەو قورئانە شكایەتمان لێ دەكات لە ڕۆژی قیامەت، چونكە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: (والقُرآنُ حُجَّةٌ لك أو عَلَيك)[29] واتە: ئەو قورئانە لە قیامەت یان شاهێدیت بۆ دەدات ، یان شاهێدیت لەسەر دەدات، چەند خۆشە ئینسان قورئان شاهێد بێت بۆی!، بەلاّم چەند ناخۆشە قورئان شاهێدی لەسەر ئینسان بدات!، بڵێ خوایە گیان هەر بەزمان دەی وت باوەڕم بە قورئان هەیە، باوەڕی بەمن نەبوو، پشتی لەمن وەرگێڕا، ئەگەر ئەو قورئانە شكایەتمان لێبكات ئەو كاتە چ دەكەین؟، خوا (جل جلاله) دەفەرمووی: ﴿فَأينَ تَذهَبُونْ﴾ واتە: بۆ كوێ دەچن؟، هەر ناگەڕێنەوە بەر دەستی خوا ؟!، دوایی ئەو مەحكەمەیە هەرناكرێ؟!، ئەمڕۆ ئێمە كە خۆمان بە شوێنكەوتوی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەزانین، سوننەتەكەی پیادە ناكەین، ئەوە ئەمانەتی پێغەمبەرە ﷺ فەوتاندوومانە، هەموو ئەو فەرموودانەی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) ئەمانەتن لە دەستمان، ئەمانەتی ئەون بۆ ئێمە، كوا ئەو فەرمودانەی كە ئێمە پیادەمان كردوون؟، كوا ئەو سوننەتەی كە ڕێزمان لێناوە؟، كوا ڕێ و شوێنی پێغەمبەرمان گرتووە (علیه الصلاة والسلام)؟، بەڵكو كەسانێك كە ڕێگاو شوێنی پێغەمبەریان (علیه الصلاة والسلام) گرتووە لە سەردەم و زەمەنی ئەمڕۆدا، خەڵك بەنامۆ تەماشایان دەكات، بەسەیر تەماشایان دەكات، دونیا لێیان بۆتە دوژمن، ناشیرین دەكرێن بەهەزار ناوو ناتۆرەو درۆو پڕوپاگەندەیان بۆ هەڵدەبەسترێ، بەلاّم إن شاء الله هەوڵەكانیان بێ بەرهەم دەبن.

---

[29] صحيح مسلم: كتاب الطهارة، باب: فضل الوضوء، رقم الحديث ٢٢٣

بۆیە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) موژدەی داوە بەو کەسانەی کە لە ئاخیر زەمـان پەیـدا ئـەبن و ئەمانـەت ڕائـەگرن، دینـی پێغەمبـەر ﷺ ڕائـەگرن و سونەتەکەی زیندوو ئەکەنەوە کە ئەفەرموێ: (مَن أحيىَ سُنَّتِي فَقَد أحَبَنِـي وَمَـن أَحَبَّنِي كانَ مَعِيَ فِي الجَنَّـة) [30] واتە: هەر کەسێك سونەتی من زینـدوو بکاتـەوە، ئەوە منی خۆشدەوێ، وە هەر کەسێکیش منی خۆشویست ئەوە لەگەڵ من دایە لە بەهەشت، صەحابەیەك بەرامبەر پێغەمبەر ﷺ ڕاوەستا فەرمووی: (طُـوبَى لِمَـنْ رآكَ وأمَنَ بِك) واتە: مزگێنی بۆ ئەو کەسەی کەتۆ دەبینیّ و باوەڕت پـیّ دێنـیّ!، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (طُوبَى ثُم طُوبَى ثُم طُوبَى لِمَنْ لَم يَرانـي وأمَـنَ بِـي) [31] واتە: سیّ جار مزگێنی بۆ ئەو کەسانەی کە نەیان بینیوم و ئیمانم پێدێنن، موژدەی داوە بەوانەی کە لە کۆتایی زەماندا دوای ئەو پەیدا دەبن، دینـی پێغەمبـەر ﷺ ڕادەگرن، ڕێبازەکەی بە بەرز ڕادەگرن، سوننەتی پێغەمبـەر ﷺ پیـادە دەکـەن و زیندووی دەکەنەوە، ڕۆژێك پێغەمبەرﷺ لەسەر گۆڕستـانێك ڕاوەسـتابوو لەگـەڵ کۆمـەڵێك صـەحابە فـەرمووی: (وَدِدتُ أنـا لَـو رَأينـا إخوانَنـا) [32] واتـە: خۆزگـە برایەکانی خۆمانمان دەبینی!، یەکێك فەرمووی: ( أوَلَـسنا إخوانَـكَ يارَسُولَ الله؟) واتە: ئایا ئێمە برای تۆ نین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟، فەرمووی: (أنتُمْ أصحابيْ وإخوانُنَا الذينَ لَمْ يأتوا بَعدُ مِنْ أُمَّتي) واتە: ئێوە هاوەڵی منن، برایـەکانی ئێمـە ئەوانەن کە ئێمە نەمانبینیون و تائێستا نەهاتوون لە ئوممەتی من.

جا ئێمە ئەگەر خۆمان بەبرای پێغەمبەر (علیـه الـصلاة والـسلام) دەزانـین، خوشکانمان کە خۆیان بە خوشکانی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەزانن، با

---

[30] في الحديث قصة طويلة، هذا حديث حسن غريب من هذا الوجه وضعفه الالباني.
سنن الترمذي، كتاب العلم عن رسول الله (صلي الله عليه وسلم)، باب: ما جاء في الاخذ بالسُنة واجتناب البدع، صفحة ٦٠٣، رقم الحديث ٢٦٧٨.

[31] مسند أبي يعلى، من مسند أبي سعيد الخدري: رقم الحديث ١٣٧٤

[32] صحيح مسلم، كتاب الطهارة، باب: استحباب اطالة الغرة والتحجيل، رقم الحديث ٢٤٩

سوننەتی ئەو پیادە بکەین، بۆ ئەوەی ببین بە خۆشەویستی ئەو، ئەمانەتەکەی ئەو کە لەبەر دەستماندایە، چونکە ئەگەر ئەو وەفاتی کردووە، بەلاّم سوننەتەکەی زیندووە، فەرموودەکانی زیندوون، ڕێ و شوێنەکەی زیندووە با بیپارێزین و پیادەی بکەین، ئەگەرنا خوا نەخواستە هەموو ئەوانە شکایەتمان لێدەکەن لەڕۆژی قیامەت.

زۆرجار منەت لەسەر ئیسلام دەکەین، منەت لەسەر خوا دەکەین، کە ئێمە زۆرمان کردووە، زۆر ماندوو بووین، زۆر بۆ ئیسلام ماندوو بووین، بەلاّم نازانین کە واجب و ئەمانەتێکەو جێبەجێمان کردووە، بۆیە خوای گەورە (جل جلالە) دەفەرمووی: ﴿يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا قُل لَّا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُم ﴾ (١٧) الحجرات، واتە: منەتت لەسەر دەکەن کە مسوڵمان بوون، بڵێ منەتی مسوڵمانبونتان لەسەر من مەکەن!، بەڵکو خوا منەت لەسەر ئێوە دەکات کە خوا هیدایەتی داون بۆ ئیمان، ئێمە خوا هیدایەتی داوین، ئەگەر خوا هیدایەتی نەدابایەن مسوڵمان نەدەبوین!، خوا هاوکاری کردوین، کاتێك کە نییەتی خۆمان وابووە کە بەردەو خوا بێین خوا هاوکاری کردوین، خوا زوڵم لەهیچ کەسێك ناکات، خوا لە هیچ کەسێك ناگۆڕێ تا خۆی لەخۆی نەگۆڕێ!، بەلاّم بە هاوکاری خوا ئێمە لەسەر ئەو دینە ڕاوەستاوین، دەبێ ئەو نیعمەتە زۆر بە بەرز بزانین.

بابزانین ئەمانەتی خوا چۆن ڕادەگرین؟، خوای گەورە (جل جلالە) دەفەرمویّ: ﴿وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آيَاتِ اللّهِ يُكَفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلاَ تَقْعُدُواْ مَعَهُمْ﴾ (١٤٠) النساء، واتە: ئەگەر لە مەجلیسێك دانیشتن، باسی دینی خوا بە خراپە کرا، گاڵتەو کوفر بە دین کرا، قەبوڵ مەکەن و لەوێ دامەنیشن، خۆ ئەگەر هیچیشت پێ نەکرا، ڕێت پێ لە خراپە نەگیرا، بڕۆ دەرەوەو لەوێ دامەنیشە، لەگەڵ کەسانێکدا مەگەرێ کە کوفر بەدینی خوا دەکەن و نارازین بەدینی خوا، یان گاڵتە بەسوننەتی پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) دەکەن، خوای گەورە (جل جلالە) فەرمووی: ﴿إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ﴾ (١٤٠)

النساء، واتە: ئەگەر ئێوە بەوە ڕازی بوون و هەر دانیشتن، ئێوەش وەکو ئەوانن، وەکو ئەوان وان، هەرکەسێك لەگەڵ کەسانی بێ دین هەڵسێ و دانیشێ کە ئەو قسە دەکات ئەویش گوێی بۆ شل بکات، ئەو کوفر دەکات، ئەویش گوێی بۆ رادەگرێ، ئەو قسە بە مسوڵمانان بڵێ و بە ئیسلام بڵێ و ئیسلام ناشیرین بکات، ئەویش بەدەمیەوە دابنیشێ، ئەوە حیسابی لەگەڵ ئەوە لەرۆژی قیامەت!، خوا (جل جلالە) فەرمووی: ﴿إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ﴾، کەلامێکی ڕاست(صحیح)، کەلامێکی ڕەوان(فصیح)، کەلامێکی ڕوون(بلیغ)، هەموو کەس تێی دەگات: ئێوە ئەوکاتە وەکو ئەوانن!، نە نوێژی بەکەڵك دێت، نە ڕۆژوی بەکەڵك دێت، نە زەکاتی بەکەڵك دێت، نە خێری بەکەڵك دێت.

ڕاگرتنی ئەمانەتی خوا ئاوایە، دیفاع لە ئەمانەتی خوا بکە، تا خوا بتکات بە ئەمین، ئەگەر دەتەوێ خوا بتکات بە ئەمین، دەبێ دیفاع لەدینی خوا بکەی، کە ئەمانەتی خوایە ئینسان هەڵی گرتووە.

جا حەیفە بەڕاستی ئینسانی مسوڵمان بۆ پێنج و دوو ڕۆژێکی دونیا، قیامەت لەدەست خۆی بدات، حەیفە حەیف!! ئینسان ئەو تەمەنە پڕ لە بەرەکەتەی کە لەدونیا پێی دراوە، دونیا لەسەر شانی خۆی دانێ و قیامەت لەبیر بکاو وازی لێبهێنێ، بۆ چەند ڕۆژو شەوێکی دونیا ئینسان ئاگای لە قیامەتی خۆی نەمێنێ کە دەزانێ لەسەدا سەد زیندوو دەکرێتەوەو موحاسەبەی دەکرێت.

**خۆشەویستەکان،بەشی دووەمی ئەمانەت: ئەمانەتی خەڵکە کە بریتی یە لە (حقُ الناس)**: یەکێك لەو ئەمانەتانە باوك و دایکن، کە ئەمانەتن بەسەر ئینسانەوە، خوای گەورە (جل جلالە) زۆر تەئکید لەسەر مافی دایك و باوك دەکات، وە لەزۆر وتاردا باسکراوە، ئینسان بەرپرسیاریەتی لەسەرە بەرامبەر دایك و باوکی، وە بەرامبەر ماڵ و منداڵی، وە بەرامبەر خیزانەکەی، هەر وەختێك ئینسان ئەو بەرپرسیاریەتییەی بەچاکی جێبەجێ نەکرد موحاسەبە

دەکرێت لە ڕۆژی قیامەت، گوناهبارن ئەو کەسانەی کە مافی باوك و دایکی خۆیان نادەن لەدونیا، لەڕۆژی قیامەت ڕوو زەردن ئەو کەسانەی کە باوك و دایکی خۆیان ڕەنجاندووە!، پەشیمانن ئەو کەسانەی کە لەدونیادا مافی خێزانەکانی خۆیانیان خواردووەو مافی منداڵەکانی خۆیانیان نەداوە، چونکە پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) فەرمووی: (كُلُّكُمْ راعٍ وَكُلُّكُمْ مسؤُلٌ عَنْ رعيَّتِهِ)[٢٣] واتە: هەمووتان چاودێرن، وە هەمووشتان بەرپرسیارن بەرامبەر شوێنکەوتوانتان و ئەرکی سەرشانی خۆتان!، سەرۆکی دەوڵەت چاودێرو بەرپرسە، سەرۆکی ماڵەوە شوانە بەرپرسە و منداڵی خۆی، ئایا ئەگەر شوانێك مەڕو ماڵاتەکەی جوان نەلەوەڕێنێ، ئەو ئەمانەتەی کە لەبەر دەستی دایە کە مەڕو ماڵاتە باش بەخێویان نەکاو خواردنی خراپیان بداتێ و زەڕیان پێبکاو تووشی نەخۆشیان بکات، ئایا موحاسەبە ناکرێت؟، ئەی تۆ کەخوای پەروەردگار (جل جلالە) ئەرکی پێ سپاردوی لەسەر ڕووی زەوی، باوك و دایکت کە بەساڵاچوون لەژێر دەستی تۆی داناوە، ماڵ و منداڵی خۆتی لەژێر دەستی داناوی، ئەو ئەمانەتەت ڕانەگرتبێ، چۆن موحاسەبە ناکرێی؟، زۆرن ئەو کەسانەی کە ئەمڕۆ باوك و دایکیان ڕەنجاندووەو فڕێیان داون، حیسابیان بۆ ناکەن، حیساب بۆ ڕەئییان ناکەن، حیساب بۆ قسەیان ناکەن، حیساب بۆ هەستیان ناکەن، وە زۆرن ئەوانەی کە لەبەرامبەر خێزانەکانیشیاندا تاوانبارن، بەرامبەر ماڵ و منداڵیان تاوانبارن، تەربیەتیان نادەن، کە ئەمانەتن بەسەریەوە، خوا (جل جلالە) ئەفەرمووی: ﴿قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا﴾ (٦) التحريم، واتە: خۆتان و ماڵ و منداڵتان لە دۆزەخ بپارێزن بە تێگەیاندن و ئامۆژگاری و پەروەردەی ئیسلامی.

بەڵێ خۆشەویستەکان، بەشێکی تر لە ئەمانەت، میللەتە، میللەت ئەمانەتە بەدەستی دەسەڵاتدارانەوە!، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (الإمامُ راعٍ

[٢٣] شعب الأيمان، رقم الحديث ٢٧٤٣

وهُوَ مَسؤُلٌ عنْ رعِيّتِهِ) واتــە: ســەرۆکی دەوڵــەت چــاودێرەو بەرپرســیارە لــەو خەڵکەی لەژێردەستی دایە، ئەگــەر بەچــاکی سەرپەرشــتیاری نــەکردبن، ئــەوە بەڕاستی دەبێ لەخۆی بترسێ، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: هەر کەسێك بەرپرسیاریەتی پێسپێردرا، بوو بە سەرپەرشــتیاری کۆمــەڵێك خــەڵك، مافی ئەو کۆمەڵە خەڵکەی نەداو دڵسۆز نەبێ بۆی، (إلا لَمْ يَجِد رائِحةَ الجَنَّة)[٣٤] فەرمووی: ئەو ئینسانە بۆنی بەهەشت ناکات!.

جا ئەگەر سەرۆکی دەوڵەت بێت، ئەگــەر ســەرۆکی شــارێك بێــت، ئەگــەر ئەنجومەنی دێیەك بێــت، ئەگــەر ســەرۆکی مــاڵی خۆشــت بێــت، مــادام وەك پێویــست مــافی ئەوانــەی کــە لەبــەر دەســتت دانــە جێبــەجێیان نەکــەی و کەمتەرخەمییان تێدا بکەی ئەوە بۆنی بەهەشت ناکەی، بۆیە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بە ئەبو ذەڕی غەففاری فەرموو: (يـا أبـاذر إنَّـكَ ضَـعيفٌ)[٣٥] فــەرمووی: ئــەی ئــەبو ذەڕ تــەتۆ لاوازی، (وإنَّهــا لأمانــة) فــەرمووی: ئــەو مەسئولیەتە ئەمانەتە!، دیارە ئەبو ذەڕ پێی خۆش بووە ببێ بــە مەســئول بــۆ کۆمەڵێك صەحابە، بەلاَم پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: تۆ لاوازی، (وإنَّها خِزيٌ وَنَدامة) فەرمووی: ئەوە ســەر شــۆڕی و پەشــیمانی یــە لــەڕۆژی قیامــەت بــۆ کەسێك لە توانــای دا نــەبێت و بــەرپرس بێــت، مەســئولیەت ســەر شــۆڕی و پەشیمانی یە لــەڕۆژی قیامــەت، ڕوو زەردی یــە لــەڕۆژی قیامــەت، (إلاّ مَـنْ أخَذَها بِحَقِها وأعطى الذي كانَ فيهـا) فەرمووی: تەنها کەسـێك بەهــەق وەری بگرێ، وە ئەوەی کە لەسەریەتی جێبەجێی بکات، ئەو مافانەی کە لەسەریەتی جێبەجێی بکات، ئەو بەرپرسیاریەتە بە هەق وەربگرێ، نــەك بۆخــۆی وەپــێش

---

[٣٤] صحيح البخاري: كتاب الأحكام: باب: من استرعى رعية فلم ينصح: رقم الحديث ٦٧٣١

[٣٥] صحيح مسلم: كتاب الأمارة بغير ضرورة، رقم الحديث ١٨٢٥

خەڵك بكەویٚ و دیكتاتۆر بێت، بەڵكو دەبێت خەڵك لەو شوێنەی دابنیٚ!، وە مافەكانیشیان بدات ئەگەرنا بۆنی بەهەشت ناكات.

خۆشەویستەكانم، جۆرێكی تر لە ئەمانەتەكان، بریتی یە لەو زیندەوەرانەی كە لە دەوروبەرمان دەژین (حیوانات): ئەگەر كەسێك مەڕو ماڵاتی هەیە ئەمانەتە لەبەر دەستی، ئەگەر كەسێك گوێدرێژێكی هەیەو باری لێدەنێت ئەمانەتە، چونكە یەكێك لە ئافرەتان بەهۆی سجن كردنی پشیلەیەك دەچێتە ناو دۆزەخ، پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ: ئافرەتێك دەچێتە ناو جەهەننەم، بەهۆی ئەوەی پشیلەیەكی سجن كردوە، نان و ئاوی نەداوەتیٚ هەتا مردووە: (عُذِّبَت إمرأةٌ في هرَّةٍ حَبَسَتها حتَّى ماتَت جَوعاً فَدَخَلَت فيهِ النَّار)[٣٦] فەرمووی: ئافرەتێك چووە ناو جەهەننەم بەهۆی ئەوەی پشیلەیەكی سجن كردو نە ناوی دایێ و نە نانی دایێ هەتا مرد، جا ئەگەر خوای پەروەردگار(جل جلاله) لەسەر ئاژەڵێك كە بەستەزمانێكە ئینسان ببات بۆ جەهەننەم، ئەی ئەگەر ئینسان ئینسانێك بچەوسێنێتەوە!، ئەگەر ئینسان میللەتێك بچەوسێنێتەوە!، ئەگەر ئینسان باوك و دایكی خۆی بچەوسێنێتەوە!، ماڵ و منداڵی خۆی بچەوسێنێتەوە!، دەبیٚ خوا لەسەر ئەوە چیمان لێبكات؟!، ئەگەر پشیلەیەك ئەوەندە قەدرو قیمەتی هەبیٚ و لای خوای گەورە (جل جلاله) مافی بزر نەبیٚ، خاوەنەكەی كە حەبسی كردووە و پێی مردووە بچێتە جەهەننەم، دەبیٚ ئێمە ئەگەر مافی خەڵك بفەوتێنین دەبیٚ حاڵمان چۆن بێت؟!.

بەشێكی تر لە ئەمانەت، ئەو ئەمانەتانەن كە لەلامان دائەنریٚ و ئێمە بە ئەمانەتی هەقیقی دەزانین: ئەگەر سەیارەیە لامان بەجێدەهێڵدریٚ ئەمانەتی

[٣٦] صحيح البخاري، كتاب المساقاة الشرب، باب: من رأى أن صاحب الحوض والقربة أحق، رقم الحديث ٢٢٣٦

کەسێکە، دوکانێکە لەلامان بەجێدەهێڵدرێت، کەسێکەو سەفەر دەکات دەڵێ ئاگات لە ماڵەکەم بێت تا دەگەڕێمەوە، شتێکە لەلات دادەنێ، شەریکەو دەڵێ ئاگات لە کەلوپەلەکان بێت، تا دەگەڕێمەوە، ئەوەش ئەمانەتە، خوای گەورە(جل جلاله) دەفەرمووی: ﴿إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ إِنَّ اللّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِ إِنَّ اللّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾ (٥٨) النساء، واتە: خوا فەرمانتان پێدەدات کە ئەمانەتەکان بگەڕێننەوە بۆ خاوەنەکانیان، لەکوێ ئەمانەتەکەتان بۆ هاتووە، بیگەڕێننەوە شوێنی خۆی، خیانەتکردن لە ئەمانەت خیانەتکردنە لە ئەمرو فەرمانی خوا (جل جلاله).

بەشێکی تر لە ئەمانەت ئەوەیە کەسێك قسەیەکت لەلا دادەنێ و دەڵێ ئەوە ئەمانەت بێت: ئەو ئەمانەتە دەبێ بەرز ڕابگری، نابێ ئەو قسەیە بگێڕیەوە بۆ هیچ کەسێك چونکە ئەو ئینسانە گوتویەتی: با ئەمانەت بێ!، کە گوترا: ئەمانەتە..! ئیدی ئەمانەتەو نابێ لای کەس باسی بکەی، بەلاّم زۆر کەس بەداخەوە کە یەکێك پێی دەڵێ: کاکە با ئەو قسەیە ئەمانەت بێ لەبەینی خۆماندا بێ!، لەوێ دەڵێ بەڵێ، بەلاّم دوایی درۆی لەگەڵ دەکات و دەیگێڕێتەوە لەلای خەڵك!، دوای ئەو نهێنی ئەو کەشف دەکات، جا ئەوەیە خیانەتی ئەمانەت لەخەڵك کە ئینسان بەهۆی ئەوەوە لەڕۆژی قیامەت ئالاّیەکی بۆ هەڵئەدرێ و پێی ئەگوترێ ئەوە ئالاّی فلاّنە کەسی غادیرو خائینە!، کە خیانەتی لە ئەمانەتدا کردوە، بەکەمی مەزانە!، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرمووێ: (إذا حَدَّثَ الرَّجُلُ بحَديثٍ ثمَّ التَفَتَ فهوَ أمانَـة)[٣٧] واتە: ئەگەر کەسێك لە مەجلیسێکدا قسەیەکی کرد، پاشان بە ئەم لاو ئەولای خۆی دا ڕوانی ئەوە ئەمانەتە، ئەگەر نەشڵێ ئەمانەت بێ، ئەوە ئەمانەتە لە لای تۆی کرد چونکە بەو ڕوانینەی مەبەستی ئەوە بووە خەڵکی دیکە گوێی

[٣٧] سنن البيهقي الكبرى، باب: ما يكره من رواية الأرجاف..، رقم الحديث ٢٠٩٥٠

لێی نەبێ، ئەگەر کەسێك قسەیەکی لەلا کردی و دوایی ڕۆیشت، ئەو قسەیە لەلای تۆ دەبێتە ئەمانەت.

بەشێکی تر لەئەمانەت، کاتێك کە خەڵکێك دێت پرس و ڕات پێدەکات: بۆ چارەسەری کێشەیەك، پێغەمبەر دەفەرموێ:(وإذا أستَنـصَحَكَ فأنـصَح)[38]، وددەفەرموێ: (المستشارُ المؤتَمَنْ)[39] واتە: کەسێك کە ئیستیشارەی پێ دەکرێ، ئەمیندارەو ڕەئی وەردەگیرێ، دەبێ چی بەهەق دەزانێ وا بڵێ، شاهێدی هەق بدات، نەك شاهێدی بەدرۆ(زور) بدات، نەك درۆ بکات بەرامبەر ئەو کەسەی کە داوای ئامۆژگاری لێدەکات، کەسێك هاتووە کێشەیەکی هەیە، هاتووە ڕەئیت وەرگرێ و پرست پێدەکات، ئەتۆ چی بەهەق دەزانی دەبێ ئەوەی پێبڵێی، ئەگەرنا خیانەتت لێکردوە، ئەوە جۆرێکە لە ئەمانەت، چونکە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرمووی: (المُستَشار مُؤتمنْ) واتە: ئەوەی کە پرسی پێدەکرێ، بە ئەمین دانراوەو ئەمیندارە.

بەڵێ خۆشەویستەکانم، وە هەروەها دەنگدانیش ئەمانەتە: دەنگدان ئەمانەتێکی گەورەیە، خەڵکێك کە پرس و ڕات پێدەکات بۆ سەرپەرشتیارییێك، بۆ بەرپرسیاریەتیەك، بۆ سەرۆکی دەوڵەت، بۆ هەر بەرپرسیاریەتێکی تر..، دەبێ ئەو ئەمانەتە بە هەق ڕابگەیەنی کە دەنگدانە، گوێ بگرن لە فەرموودەی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرمووی: (مَن استَعمَل رَجُلاً عَلى عِصابة مِن المُسلِمين وفِيهِم مَن هُو أرضَى لله مِنه فَقَد خانَ الله ورسولَه والمُؤمِنين)[40] واتە: هەر کەسێك کەسێك بکات بە بەر پرسیار بەسەر مسوڵمانانەوە، هەر کەسێك دەنگ بدات بە کەسێك، کە لەوی چاکتر هەبێت لەناو مسوڵمانان دا، ئەفەرمووی: خیانەتی لەخوا کردووە، لە پێغەمبەر (علیه

[38] صحيح مسلم، كتاب السلام: باب: من حق المسلم، رقم الحديث ٢١٦٢

[39] المستدرك على الصحيحين،كتاب الأطعمة، رقم الحديث ٧١٧٨

[40] المستدرك على الصحيحين، كتاب الأحكام، رقم الحديث ٧٠٢٣

الصلاة والسلام) کردووە، لە ئیمانداران کردووە، جا کەسێك تەنها بۆ قەڵەمێك ئامادە بێت خیانەت لەخوا (جل جلالە) بکات، لە پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) بکات، لە مسوڵمانان بکات، ئەوە دەبێ چ فەهمێکی هەبێت؟، چ دین و ئیمانێکی هەبێت؟، کەواتە دەبێ زۆر بە وریاییەوە لەو مەجالەشدا هەنگاوبنێین و هەڵوێست بنوێنین و ڕای خۆمان بۆ کەسێك بدەین کە پاك و چاك و لێهاتووە و لە خوا دەترسێ.

لەکۆتایشدا دەڵێین: ئایا ئەگەر کەسێك خیانەتی لە ئەمانەت دا کرد بەرامبەر تۆ، تۆ وەڵامت چی یە بۆ ئەو؟، پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) دەفەرمووی: (أدِّ ألأمانَةَ الی مَن ائتَمَنَكَ ولا تَخُن مَن خانَكَ)[41] واتە: ئەمانەتی خاوەنەکانیان بگەیەنەوە شوێنی خۆی کە بە ئەمینی دانـاوی، وە خیانەت لەو کەسە مەکە کە خیانەتی لێکردووی، ئەوە ئیسلامە!؛ ئەوە ئیسلامە کە عەقڵ و ڕەحمەت و بەزەیی و ئاشتی و خۆشگوزەرانی و سەعادەتی بۆ ئینسان دەوێ، ئەگەر کەسێکیش خیانەتی لێکردی خیانەتی لێمەکەوە، ئەگەر کەسێك لەئیسلام حاڵی بێت، غەیری ئیسلامی ناوێ چونکە ئیسلام سەعادەتە و سەرکەوتنی دونیاو قیامەتی تێدایە.

کۆتایی وتارەکەشم بە فەرموودەیەکی پێغەمبەرﷺ دێنم کە هەر لەسەر ئەمانەت دەفەرموێ: لە ڕۆژی قیامەت، خوای گەورە (جل جلالە) کەسێك دێنێ، ئەمانەتی فەوتاندوە، ئەمانەتی خواو پێغەمبەری فەوتاندوە (علیە الصلاة والسلام)، ئەمانەتی مسوڵمانانی فەوتاندوە. خوا (جل جلالە) پێی دەفەرموێ: ئەی ئینسانە (أدِّ أمانَتَك)[42]: دەی..ئەمانەتەکەت بدەوە!، لێرە ئەمانەتەکەت

[41] المستدرك علی الصحیحین، کتاب البیوع، رقم الحدیث ٢٢٩٦ و٢٢٩٧

[42] سنن البیهقي، کتاب الودیعة الکبری، باب: ماجاء في الترغیب في إداء الأمانات: رقم الحدیث ١٢٤٧٢

جێبەجێ بکە!، ئەو ئینسانەش دەڵێ: (یاربِّي أنّیَ وقَد ذهبتِ الـدُّنیا)، چۆن بتوانم ئەو ئەمانەتە جێبەجێ بکەم و بدەمەوە خۆ ئێستا دونیـا نـەماوە!، ئـەوەی کـە لەدونیا بۆم دەکرا ئێستا قیامەتەو لێرە چۆن بتـوانم؟!، خـوای پـەروەردگار (جـل جلاله) جاری دووەم پێی دەفەرموێ: (أدِّ أمانَتَك): ئەمانەتەکەت بدەوە، ئـەویش هەمان وەلاّم ئەداتەوە، جـاری سـێیەم خـوای گـەورە دەفـەرموێ: (أدِّ أمانَتَـك) ئەمانەتەکەت بدەوە، ئەویش هـەر ئـەو وەلاّمـە ئەداتـەوەو هـیچ دەسـەلاّتێکی دیکەی نیە، ئینجا خوای پەروەردگار (جـل جلالـه) فـەرمان دەکـاو دەفـەرموێ: (إذهَبوا بِهِ الی الهاوِیة)، واتە: برۆن ببەن بۆ جەهەننەم کـە نـاوی (هاویـة) یـە، (هاویە) ئەوەی کە لە کۆتایی سورەتی (القارعـة) خوای گەورە (جل جلاله) باسـی دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَأُمُّـهُ هَاوِیَـةٌ، وَمَـا أَدْرَاكَ مَـا هِیَـهْ، نَـارٌ حَامِیَـةٌ﴾ (٩-١١) القارعة، (هاویة) لە زمانی عەرەبیدا دەڵێن: بەشوێنێکی ئەوەنـدە قـوڵ دەوتـرێ ئەگەر شتێکی بکەویتە ناو جارێکی دیکە دەرنەیەتەوە، بیرێکە لەناو جەهەننـەم ئەوەندە قوڵە!، بـۆ ئـەو کەسـانەی کـە خیانـەت لـە ئەمانەتـدا دەکـەن، خـوا بمانپارێزێ؛ ئێمە دەبێ چ جورئەتێکمان هەبێت لەسـەر ئـاگری جەهەننـەم، ئـاوا بەبێ منەتانە خیانـەت لـە ئەمانەتـدا بکـەین؟، چ ئەمانـەتی خـوا بـێ، وە چ ئەمانەتی ئینسانەکان بێت.

خۆشەویسـتەکانم، جـا لـەوەدا بۆمـان دەردەکـەوێت کـە ئەمانـەت تـەنها ئەمانەتی ئینسانەکان نیە، ئەمانەت هەموو ئەو هەقانەی کە لەسەر ئینسانە، هەقی خوام لەسەرە ئەمانەتە، تەنانەت مـافی لەشـم ئەمانەتـە بەسـەرمەوە، ئەگەر هەقی چاوم نەدەم ئەمانەتە بەسەرمەوەو گوناهبار دەبم، هـەقی هـەموو ئەندامەکانی دیکەی جەستەش بە هەمان شێوە دەبێ لەشتی چـاك بـەکاریان بهێنم، وەئەگەر هەقی ماڵ و منداڵ و باوك و دایك و جیران و خەڵکی گەڕەك و میللەتەکەم نەدەم گوناهبار دەبم و ئەوانە ئەمانەتن بەسەرمەوە، ئەگەر کەسێك دوکانی هەیە، ئەمانەتی خەڵکی بەسەرەوەیە، ئەگەر کەسێك ئازوقەی بایەعی

هەیە ئەمانەتی خەڵکی بەسەرەوەیە، ئەگەر کەسێك نەوت دابەش دەکات ئەمانەتی خەڵکی بەسەرەوەیە، هەروەها هەموو سەرپەرشتیارێك کە ئیش و کاری خەڵکی بەدەستە، جا با ئێمەش بیر لەحاڵی خۆمان بکەینەوە بەر لەوەی بچینە ئەو ڕۆژەی خوا (جل جلاله) پێمان بفەرمووی: ئەمانەتەکەتان بدەنەوەو دەسەلاتیشمان نەبێت.

یارەببی خوایە حاڵمان چاك بکەی، یارەببی خوایە هاوکاریمان بکەی بۆ ئەوەی بتوانین ئەو ئەمانەتەی لەسەرشانمانە جێبەجێ بکەین، ئەمانەتەکانمان بدەینەوە، یارەببی خوایە هاوکاریمان بکەی لەسەر خێر، یارەببی خوایە ئەوەی کە شەڕو ئاژاوەو ناخۆشی و بێ شەرعی یە خوایە لێمان دوور بکەیەوە، خوایە خۆمان و میللەتەکەمان ئاسودە بکەی لەژێر سێبەری قورئاندا، یارەببی خوایە ڕەحم بەماڵ و منداڵمان بکەی، یارەببی خوایە شیفای نەخۆشەکانمان بێنی، خوایە ڕەحم بە پیرەکانمان بکەی، خوایە لە گوناهمان خۆشبی، خوایە لەڕابردومان خۆشبی و داهاتوشمان بۆ بەخێر بێنی، یارەببی خوایە حاڵی ئێمەو هەموو مسوڵمانانی دونیا چاك بکەی لەو ڕۆژە پیرۆزەدا، خوایە دوعای ئێمەو هەموو مسوڵمانان قەبوڵ بکەی (ياربَّ العالمين).

أقول قولي هذا وأستغفر الله لي ولكم ولسائر المسلمين، فاستغفِرُوهُ إنَّه كان غَفَّاراً ،

أعوذ بالله من الشيطان الرجيم

{رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ} أمين.

# پاکیی و ساغیی دڵ و دەروون

## بسم الله الرحمن الرحيم

إنَّ الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونستهديه، ونعوذ بالله مِن شرور أنفُسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضلَّ له ومن يضلل فلا هادي له، ونشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له ونشهد أنَّ سيدنا ونبينا محمداً عبده ورسوله، هذا الرسول الذي بلَّغ الرسالة وأدى الأمانة ونصح الأمة وجاهد في الله حق جهاده وتركنا على المحجة البيضاء، ليلها كنهارها، لايزيغ عنها إلا هالِك، صلواة اللهِ وسلامه عليه وعلى أله وأصحابه، ومن تبعهم باحسان الى يوم الدين ...، أما بعد يا عبادالله أوصيكم ونفسي أولاً بتقوى الله وطاعته، فإنّ اللهَ مع الذين اتقوا والذين هم محسنون، قال الله سبحانه وتعالى في كتابه الحكيم، بسم الله الرحمن الرحيم: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ (١) النساء.

ئیماندارانی بەڕێز، ئەی شوێنکەوتوانی پێغەمبەری پێشەوامان موحەممەد ﷺ، ئەی عاشقانی خوا (جل جلاله)، عاشقانی پێغەمبەری خواو دینی خوا، ئەی ئەو کەسانەی خوا و پێغەمبەر و دینەکەتان لەخۆتان و لەخزم و کەس و هەموو دونیا خۆشتر دەوێت، سەلامی خوای پەروەردگارتان لەسەر بێت، میهرەبانیی و ڕەحمەتی خوای گەورە برژێ بەسەر ئێوەو هەموو مسوڵمانانی دونیا لەو ڕۆژە پیرۆزەدا، یارەببی خوایە ئێمەو هەموو مسوڵمانانی دونیا لەبەهەشتدا بەیەکەوە کۆبکەیەوە، یارەببی خوایە بەگوناهی ئێمە لەگەڵ ئێمە نەکەی و ڕەحمی خۆت بەسەرماندا برژێنی، قەڵەمی عەفو بەسەر گوناهەکانماندا بێنی، خوایە شیفای نەخۆشیەکانمان بدەی، خوایە دڵ و دەروونمان بۆخۆت ساغ

بکەیەوە، خوایە لەمردووەکانمان خۆشبی، خوایە هیدایەتمان بدەی بۆئەوەی زیاتر بتوانین عەبدی ڕاستەقینەی تۆ بین، یاربَّ العالمین، ئامین.

بەرێزان، هەموو ئینسانێك دوو دیوی هەیە: دیوی ناوەوەی، وە دیوی دەرەوەی، ناوەڕۆکی ئینسان کە بریتی یە لە'قەناعەت، بریتی یە لە بیروباوەڕ و(مبدأ)، بریتی یە لە نییەتی ساغ، ئەوە پەیوەندی بەناوەڕۆکی ئینسان و بەدیوی ناودوەو لایەنی مەعنەوی ئینسانەوە هەیە، دیوی دەرەوەی ئینسان بریتی یە لەو کار و ئەرك و فەرمانانەی کە ئەندامەکان: بەچاو، بەزمان، بەدەست، بەجوڵەی بەدەنی تر...، کاریان لەسەر دەکرێت، دیارە دیوی ناوەوەی ئینسان گرنگترە لەدیوی دەرەوە، ئەگەر خوانەخواستە دیوی ناوەوەی ئینسان بۆخوا یەکلا نەبێتەوە ئەوەی کە لەدیوی دەرەوەدا بەڕواڵەت دەبینرێ ئیستیفادەی لێ ناکات، بۆنمونە خوای گەورە (جل جلاله) دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ﴾ (٢٧) المائدة، واتە: خوای گەورە (جل جلاله) تەنها کردەوەکانی تەقوا داران وەردەگرێ، وە خوای گەورە (جل جلالە) پاداشتی خێریان لەسەر نەداتەوە، تەقوا لەکوێیە؟!، پێغەمبەرﷺ ئیشارەتی بۆسینگی موبارەکی خۆی کردو فەرموی: (التَّقوى ههُنا)[٤٣]، واتە: تەقوا لێرەیە، لەناو سینگدایە، تەقوا پەیوەندی بەدڵ و دەروونەوە هەیە، ئەگەر ئینسانێك دڵ و دەروونی پاك بێت ئەوە مانای وایە ئەندامەکانی تریشی پاك دەردەچن، وەزیفەو کاری ڕواڵەتی تریشی پاك دەردەچن، جا ئێمە لەسەر ئیخلاص و پابەندبون بەشەرع و لەسەر صەبرو سوور بوون و مانەوە لەسەر ئیخلاص و پابەند بوون بە شەرع لە وتارەکانی ڕابردوودا لەسەریان دوایـن، لە وتاری ئەمڕۆشماندا دەمەوێ لەژێر ڕۆشنایی چەند ئایەتێك و فەرمودەیەکدا ئاماژە بەگرنگی دیوی ناوەوەی ئینسان بکەم کە دڵ و دەروونە.

---

[٤٣] سنن البيهقي، كتاب الحدود، باب: ما جاء في تحريم القذف، رقم الحديث ١٦٩٠٦

دەگوترێ فلانە کەس پیاوی چاکە، پیاوێکی پاکە، مانای وانییە کەدەگوترێ پیاوێکی پاکە، تەنها پاکی جلوبەرگ بێت!، لەبەرئەوە پێی بگوترێ پیاوێکی پاکە، لەبەرئەوە نییە ئەمڕۆ چۆتە حەمام و جوان سەرو لەشی خۆی شۆردووەو هاتۆتە دەرەوە پێی دەوترێ پیاوی پاك!، ئەگەر ئەو دەستەواژەیە ڕاست بێت، دەبێ بەو کەسانەی کە هەر ڕۆژێك نا ڕۆژێك، جارێك نا جارێك بەلای کەم دەچنە حەمام و دێنە دەرەوە، بەوانە بگوترێ پیاوی پاك و پیاوی چاك و ئەوەیشی کە ڕەنگ و ڕوخساری لە ئارەقەی ئیشکردن و ماندوبوون و کرێکاری و جوتیاریدا دەبینرێ ئەوە پێی نەگوترێ پیاوی پاك و پیاوی چاك کە ئەمە وانییە.

دیارە مەبەست لەپاکی و چاکی، پاکی و چاکی کردەوەو مەعنەوی یە، کەدەگوترێ فلانە کەس چاوی پاکە، یان زمانی پاکە، یان داوێنی پاکە، یان دەستی پاکە، یان دڵ و دەروونی پاکە، مانای وایە لەڕووی مەعنەوی یەوە پاکە، مانای وایە گوناه و تاوانی بەسەردا نایەن، کەدەگوترێ دەمی پیسە، مانای وانییە شتێکی پیسی بەدەمەوەیە!، کەدەگوتری دەستی پیسە، مانای وانییە شتێکی پیسی بەدەستەوەیە!، مانای وایە دەستی لەخراپە بەکاردێنێ، لەدزی بەکاردێنێ، لە لێدانی چەوساوەو مەزلوومان بەکاردێنێ، دەستی لە خیانەت و فێڵ و تەڵەکەبازی بەکاردێنێ، کەدەگوترێ داوێنی پیسە، مانای وایە لە بێ شەرعییدا بەکاری دێنێ، کەدەگوترێ دەروونی پیسە، مانای وایە دڵ و دەروونی پڕە لەخیانەت، دڵ و دەروونی پڕە لەفێڵ، دڵ و دەروونی پڕە لەغەش، دڵ و دەروونی پڕە لە لە حیقد وبوغز بەرامبەر مسوڵمانان و پڕە لە لایەنگری ناهەق و پڕە لە حەسەد و...، وەکە گوترا زمانی پیسە واتە کاری بریتی یە لەدرۆ و بوهتان و جاسوسی کردن، لەقسە هێنان و بردن لە ناو مسوڵمانان، کەدەگوترێ دەروونی پاکە، مانای وایە دەروونی لەڕووی مەعنەوی یەوە پاکە، خیانەتی تێدا نییە، غەشی تێدا نییە، پڕە لە ئیمان و خۆشویستنی خوا، درۆی تێدا نییە، بوهتان و فێڵ و پیلانی خراپی بۆ مسوڵمانان تێدا نییە،

قەناعەتی پاك، واتە قەناعەت لەسەر بنەمای دینی خوا (جل جلالە)، دڵی بەرامبەر خوا (جل جلالە) پاکە، دڵی بەرامبەر پێغەمبەرﷺ پاکە، دڵی بەرامبەر بە ئیمانداران پاکە، مانای وایە بەرامبەر بەخوا (جل جلالە) یەقینی هەیە، وەکو لە وتارێکی ڕابردوودا باسی یەقینمان کرد، ئینسان بەرامبەر بەخوا(جل جلالە) دەبێت یەقینی تەواوی هەبێت، نەك گومانیش!!، وە بەرامبەر پێغەمبەرﷺ، بەرامبەر بەئیسلام، یەقینی تەواوی هەیە، دڵ و دەروونی پاکە، وە بەرامبەر مسوڵمانانیش گومانی چاکی هەیە!، قەناعەت و مەبدەئی لەدڵ و دەرونییدا، ئیسلامەکەی وای پێدەڵێ، کە دڵی پاك بێت بەرامبەر بەئیمانداران.

خۆشەویستەکانم: خوا(جل جلالە) پاکە، ئاینەکەیشی پاکە، پێغەمبەرەکەی ﷺ پاکە، مزگەوتەکانیشی پاکن، بۆیە ئەوانەش کەخۆیان بەشوێنکەوتووی دینی خوا دەزانن، ئەوانەی کەخۆیان بەخاوەنی پەیامی (ربُّ العالمین) دەزانن، خۆیان بەتەهلی مزگەوت دەزانن دەبێت پاك بن، چونکە خوا(جل جلالە) پاکە، چونکە پێغەمبەرەکەیان ﷺ پاکە، چونکە ئاین و بەرنامەو مەنهەجەکەیان پاکە، خوای گەورە (جل جلالە) دەفەرموێ: ﴿لَا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ﴾ (٤٢) فصلت، وە لە سورەتی (المُلك) دا دەفەرموێ: ﴿تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (١) الملك، خوا پاکە، ئەو خوایەی کە خاوەنی موڵکە، ئەو خوایە پاکە، لەهەموو کەمو کورتیەك بێ عەیبە، ﴿اللَّهُ أَحَدٌ ، اللَّهُ الصَّمَدُ ، لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ، وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ﴾ (١-٤) الإخلاص، سورەتی (الإخلاص) ئەو سورەتەیە کە سیفاتی پاکی (ربُّ العالمین) دەردەخا، خودا پاکە، محمدﷺ و دینەکەی کە بۆی هاتووە پاکە، ئەو دینە، ئەو ئیسلامە عەزیزە، خوای گەورە(جل جلالە) عیززەتی داناوە بۆخۆی، پاشان بۆ پێغەمبەرەکەی، پاشان بۆ ئیمانداران: ﴿وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ (٨) المنافقون.

خۆشەویستەكانم، ئەگەر بەراورد بكەین: پێچەوانەی دڵپاكی دڵپیسی یە، پێچەوانەی دەستپاكی دەستپیسی یە، ئەگەر پیاوێك پاك نەبێت، دەبێ پێی بگوترێ پیس، ئەگەر ساغ نەبێت، دەبێ پێی بگوترێ نەخۆش، لەرووی مەعنەوی یەوە نەخۆش واتە فێڵباز، واتە دەروون پیس، واتە بێ قەناعەت، ئەو قەناعەتەی كە لەسەر بنەمای دینەوە بۆی دروست نەبووە، قەناعەتێكە كە لەسەر بنەمای ڕاستی بۆی دروست نەبووە؛ بۆیە ئینسان كاتێك پاكە: لەزمانەوە، لە گوێچكەیەوە، لە دەم و زمانی یەوە، لە چاویەوە، لە دەروونیەوە، لە دەست و قاچیەوە، لە داوێنیەوە.. ئەوكاتە پاكە كە ئیمانی تەواو لە دڵ و دەروونی دا هەبێ و لەسەر بنەمای ئیسلامەتی قەناعەتەكەی بۆ دروست بووبێت، وە بۆ هەمووشیان سەرچاوەی پاك بوون پەیوەندی بەدڵەوە هەیە.

خۆشەویستەكانم، دڵ مەڵبەندی بڕیارە، سەرچاوەی پاكبونەوەی ئەندامەكانە، وە سەروچاوەی پیسبونەوەی ئەندامەكانیشە، بۆیە پێغەمبەرﷺ فەرموی: (الا انَ في الجَسَدِ مُضغَةَ اِذَا صَلَحَت صَلَحَ الجَسَدَ كَلهُ وَاِذا فَسَدَت فَسَدَ الجَسَدَ كُلهُ.. اَلا وَهِيَ القَلب)[44] واتە: یەك پارچە گۆشت لەناو لاشەی ئینساندا هەیە، ئەگەر ئەو پارچە گۆشتە بۆخوا صوڵحا، چاك بوو، ساغ بوو، پاك بوو، هەموو ئەندامەكانی تر چاك دەبن، ئەگەر ئەو پارچە گۆشتە فاسدو خراپ بوو، هەموو ئەندامەكانی تر پیس و خراپ دەردەچن!، (اَلا وَهِيَ القَلب) واتە: ئاگاداربن ئەو پارچە گۆشتەش دڵە، بۆیە ئەگەر كەسێك بڵێ دڵم پاكە؛ لەپاش ئەوەی لەگەڵ گوناهاندا غەرق بووە، ئەوە ڕاست ناكات!، چونكە ئەگەر دڵی پاك بێت چاویشی پاك دەبێ و دەستیشی پاك دەبێ و داوێنیشی پاك دەبێ، هەموو ئەندامەكان بەستراونەتەوە بەدڵ، چونكە دڵ مەڵبەندی بڕیارە، بەر لەوەی كە

---

[44] صحيح البخاري، جزء ١، كتاب الايمان. باب: فضل من استبرأ لدينه. صفحة ٢٨، رقم الحديث ٥٢، وأطراف الحديث في البخاري ((١٩٤٦)). وأخرجه مسلم في المسقاة. باب: أخذ الحلال وترك الشبهات، رقم الحديث ١٥٩٩.

چاو گوناهێك بكات دەبێت دڵ بڕیاری بۆ بدات، بیكات یان نەیكات، بەرلەوەی هەركەسێك بەدەست خیانەتێك بكات دڵ بڕیاری بۆ ئەدات، بیكات یان نەیكات، وەكو گوتمان لە وتارێكی ڕابردوودا هەر ئینسانێك كە دەیەوێ قسەیەك بكات یان دەیەوێت بڕیارێك بدات، ئەو بڕیارە بڕیاری فەردی بێت یان جەماعی بێت، دەبێت بەدڵ دوو شت لێكبداتەوە، یەكەم: ئایا ئەو بڕیارەی بەپێی شەرعە؟، وە بزانێ لەگەڵ شەرع تێك دەكاتەوە یان نا، چونكە ئەگەر لەگەڵ شەرع تێك نەكاتەوە هەموو ماندوبوونەكەی بەخەسار دەچێ ، دووەمینیش: ئایا بڕیارەكەی، قسەو گوفتار و كردارەكەی لەبەرخاتری خوایە یان لەبەرخاتری خۆیەتی یان دونیایە یان مەصلەحەتێكی ترە، گوتمان ئەو دوو شتە زۆر پێویستن، بۆیەش هەموو جار پێغەمبەرﷺ كە دەیەویست ئیشێك بكات دەیفەرموو: (بِسمِ اللە)، ئینسان كە كار دەكات دەبێت بڵێ (بِسمِ اللە)، بەناوی خواوە دەست بەهەموو ئیشێك بكات، ئەگەر لەمەجلیسێك دەیەوێت قسە بكات دەبێ بڵێ: (بِسمِ اللە)، ئەگەر بیەوێ هەڵبستێ لەمەجلیسێكدا دوای تەواو بوون، سوپاسی خوا دەكات، ناوی خوا دێنێت، ئەگەر بیەوێ دەست بەكارێك بكات (بِسمِ اللە) دەكات، بچێتە سەفەرێك (بِسمِ اللە) دەكات، دەست بەكارێكەوە بگرێ، موعامەلەیەك دەستپێدەكات دەبێت بڵێ (بِسمِ اللە)، (بِسمِ اللە) مانای چییە؟ (بِسمِ اللە) واتە سێ شت، یەكەم: خوایە بەناوی تۆ دەست پێدەكەم، بەپشتیوانی تۆ دەست پێدەكەم، دووەم، واتە: خوایە لەبەر خاتری تۆ ئەو ئیشە دەكەم، سێیەم، واتە: خوایە لەسەر بنەماو بنچینەی بەرنامەكەی تۆ دەست بەو كارە دەكەم، جا هەر ئینسانێك لە هەر كارو كردەوەیەكیدا ئەو سێ شتەی تێدا بەدی كرا ئەوە ئیشەكەی تێدا سەردەكەوێ و ناجیح دەبێت، با لەدونیاشدا ناجیح نەبێت بەلاّم لە قیامەتدا چونكە لەبەرخاتری خوا كردوویەتی پاداشتی نەبڕاوەی لەسەر وەردەگرێ، بەپشتیوانی خوا، لەبەرخاتری خوا، لەسەر بنەمای دینی خوا.

خۆشەویستەکانم: دڵی پیس هیچ کاتێك هەق وەرناگرێ، بۆیە خوای گەورە (جل جلاله) لەقورئاندا دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ الْجِنِّ وَالإِنسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لاَّ يَفْقَهُونَ بِهَا﴾ (١٧٩) الأعراف، واتە: ئێمە بۆ دۆزەخ خەڵکێکمان ئامادەو دروست کردوە کە هیدایەتیان وەرنەگرتووە، دڵیان هەن بەلاّم بەدڵەکانیان تێناگەن و هەق وەرناگرن، نافەرموێ دڵیان نین!، دەفەرموێ دڵیان هەیە بەلاّم بەدڵەکانیان هەق تێناگەن، هەق وەرناگرن، حاڵی نابن، زۆرجار کەسێك دادەنیشێ لە بەرامبەرت دەتەوێ حاڵیی بکەی لە بابەتێك و تێی بگەیەنی، دادەنیشی بەڵگەی ئایەت و فەرمودەی بۆ دێنیەوە، خوا (جل جلاله) وا دەفەرموێ، پێغەمبەرﷺ وا دەفەرموێ، زانایان (ڕەزای خوایان لەسەر بێت) وا دەفەرموون، ڕاستیەکە ئاوایە، بەلاّم خۆی قەناعەت ناکات، لەبەر چییە کە قەناعەت ناکات، لەبەر ئەوەی دڵی نەخۆشە!، چونکە هەر کەسێك دڵی ساغ بێت دەبێت تەسلیمی ئایاتی (ربُّ العالمین) بێت، هەر کەسێك دڵی ساغ بێت نابێ موناقەشە لەبەرامبەر فەرمودەی پێغەمبەرﷺ بکات.

بەڵێ خۆشەویستەکانم: دڵپاکی واتە تەسلیم بوون بەخوا، واتە ئەو دڵەی خوا بەپاکی دەزانێت، ئەو دڵەی ئیسلام بەپاکی دەزانێت، ئەو دڵەی سوننەتی پێغەمبەرﷺ پیادە دەکات، بۆیە هەموو کاتێك جیاوازی نێوان دڵی مسوڵمانان و دڵی بێ بڕوایان و دووڕوان بریتی یە لە چەند شتێك: دڵ و دەروونی ئینسانی مسوڵمان لەگەڵ ئەندامەکانی دەرەوەی دا موافیقە، گوتمان ئینسان دیوی ناوەوەی هەیە، وە دیوی دەرەوەی هەیە، لە دەروونەدا بڕیارێك دەدات، بەزمان جێبەجێی دەکات، بەدەست جێبەجێی دەکات، بەچاو جێبەجێی دەکات، مسوڵمان ئەوەی کە لەناو دڵی دایە لەگەڵ ئەوەی کە جێبەجێی دەکات موافیقە، بەپێچەوانەی ئینسانی کافر و ئینسانی دووڕوو.

خوای گەورە (جل جلاله) سەبارەت بەئینسانی مسوڵمان و دڵەکەی نموونە بە حەزرەتی ئیبراهیم دێنێتەوەو دەفەرموێت: ﴿إِذْ جَاءَ رَبَّهُ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾ (٨٤)

الـصافات، حەزرەتی ئیبراهیم بەرەو پەروەردگاری خۆی چوو بـه دڵێكـی سـەلیم، دڵێكی سەلیم واته دڵێكی سەلامەت، دڵێكی پاك و بەئیمان، دڵێكی بێ غـەش، دڵێكی بێ فێڵ، دڵێكی بێ خڵتەو خاڵ، دڵێك لەسەر بنەمای دینی خوا، ﴿إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ﴾ (١٣١) البقرة، واته: خوای گەورە (جل جلالـه) پێـی فـەرموو ئـەی ئیبراهیم تەسلیم بە. ئیبراهیم چی فەرموو؟، ﴿قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَـالَمِينَ﴾ (١٣١) البقرة، واته: تەسلیمی پەروەردگاری جیهانیان(ربُّ العالمین) بووم.

بەڵێ خۆشەویستەكانم: ئا ئەو ئیبراهیمە دوای ئەوەی كە خۆی یەكلا دەكاتـەوە بۆ خوا كاتێك فڕێی دەدەنە ناو ئاگر دڵەكەی ئەوەندە پاك بۆتەوەو ئەوەندە پـڕ لـە ئیمان و قەناعەتە بەرامبەر بەخوا، دەفەرموێ: {حَسْبِيَ اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ}، واته: بەسە خوا بۆ من، وە باشترین پەناو پاڵپشتە، كەسی لە دەوروبەر نەبوو!، چ سوپای لە دەوروبەر نەبوون!، چ پاسەوانی لە دەوروبەر نەبوو!، چ هێزی لە دەوروبەر نەبوون تا بەهێزی ئەوانەوە بنازێ!، بەڵكو كە فڕێیان دایە ناو ئاگر، دەیفەرموو: بەسە خوا پاڵپشتم بێت، {وَنِعْمَ الْوَكِيلُ}: وە باشترین پەناو یارمەتیدەرە بـۆ مـن، باشـترین پاڵپشته بۆ من، {نِعْمَ الْمَوْلَى وَنِعْمَ النَّصِيرُ}، خواش (جل جلاله) فەرمووی: ﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ﴾ (٣) الطلاق، هەر كەسێك پـشت بـەخوا ببەسـتێ و ڕاست بكات لەگەڵ خوا، خوا بەسـیەتی!، خـوا بـەهانای دێـت، بۆیـە حـەزرەتی ئیبراهیم بەو قەناعەتە، بەو دەروون پاكی یە، بەو مەبدەئە ڕاستەقینەیە ڕۆیشت بۆ ناو ئاگرەكە، كاتێك كە خوای گەورە (جل جلاله) حەزرەتی ئیـبراهیم دەبینـێ بـەو شێوەیە قەناعەت و مەبدەئی دامەزراوەو بۆ خوا گونجاوە، خوای گەورە (جل جلاله) بە ئاگر دەفەرموێ: ﴿يَا نَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَامًا عَلَى إِبْرَاهِيمَ﴾ (٦٩) الأنبیاء، واته: ئەی ئاگر ساردبە، ساردێكی سـەلامەتیش بە لەسەر ئیبراهیم، ئەوە لەسەر بنەمای چی؟، لەسەر بنەمای قەناعەتەكەی حەزرەتی ئیبراهیم، لەسەر بنەمای عەقیدەكەی حەزرەتی ئیبراهیم. دەبێ عەقیدەو بڕوای ئینسان ئـاوا دامـەزراو بێـت، بـۆ خـوا بگونجێت، لەبەر خاتری خوا بژی، وە لەبەر خاتری خوای گەورە (جل جلاله) بمرێ.

بەڵێ، بۆیە حەزرەتی موساش کاتێـک کـە ڕووبـەڕووی فیرعـەون دەبێتـەوە ئەوانەی کە لە دەوروبەری حەزرەتی موسان دەترسن: ﴿قَالَ أَصْحَابُ مُوسَى إِنَّا لَمُدْرَكُونَ﴾ (٦١) الشعراء، واتە: برادەرانـی حـەزرەتی موسـا گوتیـان سـوپای فیرعەون دەمانگاتێ، بەڵام حـەزرەتی موسـا فـەرمووی: ﴿كَلَّا إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهْدِينِ﴾ (٦٢) الشعراء، واتە: نەخێر وانییە، بەڵکو پەروەردگاری من لەگـەڵ مندایە، وە هاوکاریان دەکات، ڕێڕوونیمان دەکات، خوا بەفیڕۆمان نادات.

خۆشەویستەکانم: کەسێك ئیمانی بە خوا هەبێت، لەگەڵ دینـی خـوادا بێـت، قەناعەتی پاك بێت وەك ئەوەی کە ئیسلام فەرمانی پێکردوە، خوای گەورە (جـل جلالە) قەت بەفیڕۆی نادات!، پێغەمبەرﷺ چونکە دەروونی پـاك بـوو، چـونکە بـە(بِسمِ اللّه) دەسـتی پێکـرد لـە ئەشـکەوتی (حـراء)، چـونکە بـە(بِسمِ اللّه) لەماڵەکەی خۆیەوە دەستی پێکرد، کە خۆی و خێزانەکەی (خەدیجە) و ئەبوبەکری صیدیق -لە پیاوان- و عەلیی کوڕی ئـەبی تاڵیـب -لەمنـداڵان- بـوون، بـەڵێ پێغەمبەرێك و پیاوێك و ئافرەتێـك و منـداڵێك.. بـەڵام چـونکە بـە(بِسمِ اللّه) دەستی پێکـرد، خـوای گـەورە (جـل جلالـە) پـشتی گـرت و بەرەکـەتی خـستە ئیـشەکەی، خـوای گـەورە (جـل جلالـە) وایکـرد گەشـەی بەدینەکـەی و بـە بیروباوەڕەکەی بدات، بۆیەش دوای ئەوەی کە ماوەیەك وەحی ڕاوەستا وکافرەکانی قوڕەیش ئەو پڕوپاگنـدەیان بـڵاو کـردەوەو گوتیـان: خـوای موحەمـەد وازی لـە موحەمەد هێناوە، چیتر وەحی بۆ نانێرێ و پەیوەنـدی لەگـەڵ پـچڕاندووە، خـوای گەورە (جل جلاله) پیلانی هاوبەش دانەران و بێ باوەڕان پـوچ دەکاتـەوە، ئایـەتی ناردە خوارەوە لە سورەتی (الضُّحى): فەرمووی: ﴿وَالضُّحَى، وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى، مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى﴾ (١-٣) الـضحی، خـوا ئەفـەرموێ: سـوێند بـە چێشتەنگاو، وە سوێندم بە شەو-کاتێك کە بە تاریکییەکـەی زەوی دادەپۆشـێ- خوای پەروەردگار وازی لـێ نـەهێناوی، ﴿وَمَا قَلَى﴾: وە لێـشت تـوڕە نییـە، ئینسانێك لەگەڵ خوادا بێت خوا قەت لێی توڕە نابێت، لەگەڵ خـوادا بێـت خـوا

قەت پشتی بەرنادات، لەگەڵ خوادا بێت خوا قەت ڕیسوای ناکات لە دونیاو لەقیامەت، بەڵام خوای گەورە (جل جلاله) دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُهِنِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن مُّكْرِمٍ﴾ (١٨) الحج، واتە: هەر کەسێك خوا سوك و ڕیسوای بکات، کەس ناتوانێ ڕێزی بگرێ، بەڵام کەسێك خوا ڕێزی لێنا کەس ناتوانێ بێ ڕێزی بکات، ﴿تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاء وَتَنزِعُ الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاء وَتُعِزُّ مَن تَشَاء وَتُذِلُّ مَن تَشَاء﴾ (٢٦) آل عمران، واتە: ئەوەی کە عەزیزی دەکات هەر خوایە، ئەوەی کە زەلیلی دەکات هەر خوایە، ئەوەی کە موڵك و دەسەڵاتی دەداتێ هەر خوایە، ئەوەی کە موڵك و دەسەڵاتی لێ دەستێنێتەوە هەر خوایە(جل جلاله).

خۆشەویستەکانم: دڵی ئیماندار دڵێکی پاکە، بۆیە خوای پەروەردگار (جل جلاله) دەفەرموێ: ﴿مَنْ خَشِيَ الرَّحْمَنَ بِالْغَيْبِ وَجَاء بِقَلْبٍ مُّنِيبٍ﴾ (٣٣) ق، واتە: دڵی ئیماندار ئەو دڵەیە کە لەخوا ئەترسێ و بە تەوبەکاری دەگەڕێتەوە لای خوا، بەڵام دڵی کافر چۆنە؟، دڵی کافر، موافق نییە لەگەڵ کردارەکانی، ئەوەی لە دڵی دایە لەگەڵ ئەوەی دەری دەبڕێ لەگەڵ مسوڵمانان شتێکی ترە!، خوا لە قورئان دەفەرموێ: ﴿يَقُولُونَ بِأَفْوَاهِهِم مَّا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يَكْتُمُونَ﴾ (١٦٧) آل عمران، واتە: شتێك بە زار دەردەبڕن کە لەدڵ و دەرونیان دا نییە، خوا فەرمووی: ﴿يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ﴾ (١١) الفتح، واتە: شتێك بە زمان دەردەبڕن کە لەناو دڵ و دەرونیان دا نییە، ﴿قَالَتِ الْأَعْرَابُ آمَنَّا﴾ (١٤) الحجرات: ئەعرابیەکان وتیان باوەڕمان هێناوە ئەی موحەممەد، ﴿قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا﴾: ئەی موحەممەد پێیان بڵێ ئیمانتان نەهێناوە، ﴿وَلَكِن قُولُوا أَسْلَمْنَا﴾: بەڵکو پێیان بڵێ تەسلیم بوون لە ناچاری!، ﴿وَلَمَّا يَدْخُلِ الْإِيمَانُ فِي قُلُوبِكُمْ﴾: هێشتا ئیمان نەچۆتە ناو دڵتان!، کەوابو ئینسانی بێ دین و ئینسانی بێ باوەڕ هەمیشە ئەوەی کە بەزمان دەیڵێ لەگەڵ دڵ و دەروونی تێك ناکاتەوە، برای مسوڵمانم: کەم وایە ئینسانێك باوەڕی بەخوا نەبێت لەبەرامبەر تۆدا ڕاست بکات!، مەگەر کۆمەڵێك پەیمان و بەڵێن یان لەسەر بنەمای هاوپەیمانی یان

لەسەر بنەمای بەرژەوەندی هەردوولا، مەگەر لێرەدا ڕاست بکات، بۆیە خوای گەورە(جل جلالە) لەقورئاندا بۆ ئێمەی ڕوونکردۆتەوە.

ئینجا ئینسانی دووڕوو دڵەکەی پێچەوانەی دڵی ئینسانی مسوڵمانە، خوای پەروەردگار (جل جلالە) سەبارەت بەدڵی دووڕووان دەفەرموێ: ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ اللّهُ مَرَضاً وَلَهُم عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ﴾ (١٠) البقرة، واتە: لەناو دڵیاندا نەخۆشی هەیە، ئەو نەخۆشییەی کە هەیانە نەخۆشی دووڕوویی یە، بە ڕوویەك لەگەڵ مسوڵمانان بەجۆرێکە و لەگەڵ خەڵکی غەیرە مسوڵمانیش بەجۆرێکی ترە، هەروەکو خەڵکی زەمانەی خۆشمان ئەمڕۆ بەداخەوە زۆری وا هەیە لەبەرامبەر مسوڵمان دەستی لەسینگی دەدات، لەبەرامبەر نا مسوڵمان دەستی لە سینگی دەدات!، بەپێی مەسڵەحەتی خۆی، مەسڵەحەتی لەکوێ بێت ڕووی لەوێ دەکات، تەماشای قیامەت و بەرژەوەندی قیامەتی خۆی و داهاتوی خۆی ناکات، لەکوێ دونیای دەستکەوێت ڕوو لەوێ دەکات!، وە خوا نەخۆشیەکەیان بۆ زیاد دەکات بەهۆی بەردەوامبوونیان لەسەر ئەم نەخۆشیە، بەڕێزان: نەخۆشی دووڕوویی گەورەترین نەخۆشی یە!، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (انَّ شـرَّ النَّـاسِ ذا الـوَجهَين)[٤٥] ڕۆژی قیامەت خراپترین کەس ئەو کەسانەن کە دووڕوون!، (الـذی یَـأتي هَـؤلاءِ بِوجهٍ وهـؤلاءِ بَوجه) واتە: کە لەگەڵ ئەو کۆمەڵە بە ڕوویەك قسە دەکەن بەجۆرێك، لەگەڵ ئەوانی تر بەجۆرێکی تر قسە دەکەن، دیارە ئینسانی مسوڵمان یەك ڕووی هەیە وە دڵ و دەروونی موافیقە لەگەڵ کردەوەکانی خۆی، ئەوەی کە بەدڵ قەناعەتی پێ هەیە هەر ئەوەش دەڵێ، نە فێڵ لەخوا دەکات چونکە فێڵ لەخوا ناکرێت،

---

[٤٥] صحيح البخاري، كتاب المناقب، باب: قول الله تعالى (يا أيها الناس إنا خلقناكم من ذكر وأنثى...)، رقم الحديث ٣٣٠٤

نە خیانەت لەخوا دەکات، نە لەدینی خوا دەکات، وە نە لە مسوڵمانانیش دەکات، ئەوەی کە بە دڵی قەناعەتی پێی هەیە هەر ئەوەش دەردەبڕێ.

بەڵێ خۆشەویستەکانم: دیارە هەر ئەو قەناعەت و بیرو باوەڕەیە وا لەئینسانی مسوڵمان دەکات کە ماندوو بێت بۆخوا، گیانی خۆی بەخت بکات لە پێناوی خوا، ئەگەر ئینسانێك قەناعەتێکی پاکی هەبوو، ئەوکاتە سەرفی نەزەر لەحاڵی خۆی و لەماڵ و منداڵی خۆی و لە خزم و کەس و عەشیرەتی خۆی و کارو کەسابەتی خۆی دەکات لە پێناوی ئەوەی کە خوا لێی ڕازی بێت، ئەگەر ماڵ و منداڵی بۆ خواپەرستی نەهاتە پاڵی، ئەوە ماڵ و منداڵی خۆی وەلادەنێ، بەلاّم تەزحیە بەدینی خۆی نادات، دینی خوا زۆر بەقیمەتە، ڕەزابونی خوا زۆر بە قیمەتە، هەر ئەو قەناعەت و مەبدەئەیە کە مسوڵمان هەیەتی کە ئەمڕۆ لە فەڵەستینێك کە جوولەکە بە هەموو هێزی خۆی زوڵم لە مسوڵمانانی فەڵەستین دەکات، ئەوانیش بە بەردو بەو بیروباوەڕە پاکەی کە هەیانە بەرپەرچی دوژمنانی دین و دوژمنانی خوا، داگیرکەرانی قودس دەدەنەوە، ئەو قەناعەت و مەبدەئەیە مسوڵمان بە وەزیفەی خۆی دەزانێ ماندوو ببێت لەبەر خاتری خوا، خۆی بەوە نەبەستۆتەوە دەوڵەتی ئیسلامی پێ تەشکیل دەکرێ یان نا، ئەگەر لەسەر بنەمای ئەوە بێت کە ئینسان ئەگەر بتوانێت بیکاو ئەگەر نەتوانێت نەیکا، مانای وایە دەبێت زۆرینەی ئایەتەکانی قورئان فەرامۆش بکەین ولەکارخەین (تعطیل)یان بکەین، جیهاد هەر نەمێنێ، بەلاّم هەر ئەو قەناعەتەیە کە وای لەمسوڵمانانی فەڵەستین کردووە، دەشزانن چەکەکەیان بەرامبەری چەکەکەی جوولەکە کاریگەری وای نییە، بەلاّم چونکە بە واجبی دەزانن، چونکە بە بێ غیرەتیی و بە بێ عیززەتی دەزانن کە (بیتُ المقدس) ەکەیان لەژێر دەستی جولەکە دابێ و ئەوانیش لەماڵی خۆیان لەسەر دوکان و بازاڕو کرێکاری و جوتیاری و موعامەلەکەی خۆیان بەردەوام بن، ئەو قەناعەتەیە وایان لێدەکات، یا لەپێناوی خوادا شەهید بن، یا لەپێناوی خوادا دەربەدەر بن، یا خانووەکەی

بروخێ، با منداڵەكەی بكوژرێ، بەڵام با خوا لێی ڕازی بێت!، خوا ئەو دینەی كە ناردووە دینێكی گرانە، خوای گەورە (جل جلاله) بـه موحەممـەدﷺ دەفـەرموێ: ﴿إِنَّا سَنُلْقِي عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا﴾ (٥) المزمل، واتە: ئێمە قسەیەكی قورسمان بەسـەر تۆدا ناردۆتە خوارەوە ئەی موحەممەدﷺ، كە قورئـانی پـیرۆزە، {ثَقِيل} واتـە: قورس، ئەو دینە دینێكی قورسە، ئەو كەسەی كە بیەوێ كە بەئاسانی دینەكـەی بگرێ و پاشان خواش بیباتە بەهەشت، خەیاڵی خاوە!، ئەو دینە دینێكی قورسە، دەبێـت ئینســان بـەگرنگی بیگـرێ بـۆ ئـەوەی خـوا بیباتــە بەهەشــت، ئــەو مــسوڵمانانەی كـە خۆیـان بـە كوشـت دەدەن لەهـەر شـوێنێكی ئـەم دنیایـەدا قەناعەتیان بەوە هەیە كە ئەركی خوایی جێبەجێ دەكەن، وەزیفەی خۆیانە، گیان بەخشین و خوێن بەخشین لەپێناو خواو ڕزگاری چەوساوان، ئەو مــسوڵمانانەی لــە قورئان حاڵیی بووبن، حاڵیی بووبن لەو ئایەتەی كـە خـوای گـەورە (جـل جلالـه) دەفەموێ: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ﴾ (٢١٦) البقـرة، بـۆ حـاڵی نـەبین لەو ئایەتە؟، بۆ تێنەگەین لەو ئایەتە؟، دەفەرموێ: جەنگتان لەسـەر فەڕز كـراوە، ﴿وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ﴾: پێتان ناخۆشـە!!، چـۆن دەفـەرموێ: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ﴾ (١٨٣) البقـرة، واتــە: ڕۆژووتــان لەســەر فــەڕز كـراوە، بەهــەمان عیبــارەت دەفەرموێ: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ﴾، واتە: جـەنگتان لەسـەر فـەڕز كـراوە، بـەڵام لەڕۆژووەكە نافەرموێ: ﴿وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ﴾ پێتـان ناخۆشـە، بـەڵام لـە جـەنگ و جیهادەكەدا دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ﴾ جەنگ و جیهادتان لەسەر فەڕز كـراوە بەڵام پێتان ناخۆشـە!، تەبیعـەتی هـەموو ئینـسانێك وایـە، تەبیعـەتی هـەموو ئیمانداران، صەحابەكانی پێغەمبەریشﷺ لەسەرەتادا پێیان ناخۆش بوو، بـەڵام ئایا قیاس پێناخۆش بوونی ئینسانە؟، نەخێر خوا(جل جلاله) دەفەرموێ: ﴿وَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ (٢١٦) البقرة، واتە: زۆر شت هەیە ئێـوە پێتـان ناخۆشە بـەڵام خێـری تێدایـە بۆخۆتـان، وەك جیهـاد، وەك عزەتـی ئیـسلام و مسوڵمانان، ﴿وَعَسَى أَن تُحِبُّواْ شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ﴾ (٢١٦) البقـرة، واتـە: زۆر

شت هەیە ئێوە پێتان خۆشە بەلاّم خراپە بۆ ئێوە، ﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ (٢١٦) البقرة، واتە: خوا ئەزانێ و ئێوە نایزانن.

بەڵێ خۆشەویستەکانم: ماندووبوون لەسەر بنەمای ئەو قەناعەتەیە کە ئینسان لە دڵ و دەروونیدا هەیە، ئەگەر ئینسان قەناعەتی بە شتێك هەبوو لەسەری بەدەنگ دێت، تۆ خێزانەکەی خۆت و ناموسی خۆت خۆشدەوێ، ئایا قەبوڵتە کەسێك جوێن بە خێزانەکەت بدات؟، ئەگەر کەسێك لە بەرامبەرتدا جوێن بەخێزانەکەت بدات، خۆت لەسەری نادەی بەکوشت؟، بێگومان هەرکات کەسێك هەڕەشەی کوشتن و هەڕەشەی تەحەددا کردن و ئیهانە پێکردن بەرامبەر بەدایکت، بەرامبەر بەخوشکت و کچەکەت و خێزانەکەت یان بەرامبەر بە دایك و باوکت بکات، لێی قەبوڵ ناکەی؟، ئەی ئەگەر ئیهانە بەدینی خوا بکرێت؟!، ئەی دینی خوا خۆشەویستتر نییە لە خێزان و دایك و باوك؟!، دینی خوا خۆشەویستر نییە لە هەموو شتێ؟، کەوابو ئەوەی کە لە فەلەستین خۆی بەشەهید کردن دەدات، لەسەر بنەمای حیکمەتێکە، لەسەر بنەمای بەرگری لە ژیان و دینە، ئەگەرنا ئەگەر مەبەستی ئەوە نەبێت چۆن چەند ملیۆن کەس ئێستا موهاجیرەو لە فەلەستین چۆتە دەرێ! چەندملیۆنیش ماوەو لەژێر زوڵم و ستەمی صەهیۆنیەکان شەهید و ماڵ کاولدەکرێ، ئەوە هەمووی چونکە ئەوگەلە چۆك دانادات و خۆی بە قوربانی پیرۆزیەکان دەکات .

بۆیە بەڕێزان: ماندووبون و خزمەتکردنی دینی خوا عەقیدەو مەبدەئە، بۆیە دەبێت ئێمەی مسولّمان دڵ و دەروونمان پاك بێت لەبەرامبەر دینی خوا، عەقیدەیەکی پاکمان لەدڵ و دەرووندا هەبێت، بیر لەوە نەکەینەوە ئاخۆ لە دونیادا دەگەینە ئامانج؟، گرنگ ئەوەیە لە قیامەتدا لەبەرامبەر خوا ڕووسوور بین، وە شەرمەزاری ڕۆژی قیامەت نەبین.

دیارە ئینسانی مسولّمان لە بەرامبەر خوادا دەبێت دڵی پاك بێت، لەبەرامبەر پێغەمبەری خوادا ﷺ دڵمان پاك بێ، چونکە گەورەترین

خۆشەویستیمان دەبێت بۆ خواو پێغەمبەر بێـت، (أن يَكـونَ اللهُ ورسـولُهَ أحـبَّ اليهِ مما سِواهُما)[٤٦] واته: مـسولّمان دەبێت خواو پێغەمبەرەکەی لەهەموو شتێك زیاتر خۆشبوێت، واتا بەدڵ وە بە قەناعەتەوە تەسلیمی دینـی خـواو تەسـلیمی سـوننەتی پێغەمبەرﷺ بێت، چونکە هەر کەسێك بڵێ خـوام خۆشـدەوێ(جـل جلالـه)، دەبـێ شـوێنکەوتوی دینەکـەی بێـت، هەرکەسـێك بڵـێ پێغەمبـەرم خۆشـدەوێ ﷺ، دەبێـت شـوێنکەوتوی سـوننەتەکانی بێـت، وە پاشـانیش لەبەرامبەر ئیمانداراندا دڵ و قەناعەتمان قەناعەتێکی پاك بێت، گومانی خراپ بە خەڵك نەبەین، گومانی چاکمان بەرامبەر بە مسوڵمانان هـەبێت، خـوا(جـل جلاله) دەفەرموێ: ﴿اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِّنَ الظَّنِّ﴾ (١٢) الحجرات، واته: خۆتان لـه زۆر گومان بپارێزن، هەرچی کـه گومانـه بـه خەیاڵتـدا دێـت، بەدڵتـدا دێـت بەرامبـەر بە مـسولّمان بینـای لەسـەر مەکە، خوا(جل جلاله) دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّـذِينَ آمَنُـوا إِن جَـاءَكُمْ فَاسِـقٌ بِنَبَـإٍ فَتَبَيَّنُـوا﴾ (٦) الحجـرات، واتـه: ئـەی ئیماندارینە کاتێك کەسێکی فاسق دێت خەبەرێکتان بۆ دێنێت، لێی بکۆڵنـەوە ئەوجار بڕیاری لەسەر بینا بکەن، هەروا بەگۆتەی کەسێك کـه قـسەیەکتان بـۆ دێنێت باوەڕ مەکەن، کەسێك بێت بۆ لات بڵێت: فلانـه کـەس پیـاوی خراپـه، یەکسەر زەربی سفری مەکە و زەرپێکی بەسەردا مەهێنە، کەسێك بێت بۆ لات بڵێت: فلانه کەس زەمی کردی، یەکسەر بڕیاری ناشیرینکردن و بڕیـاری حیقـدو بوغزت بەرامبەری مەدە، دیارە ئەوە پێچەوانەی ئەو ئایەتە پیرۆزەیەو پێویستە ڕونکردنەوە بکرێ، دەبێت ئینسانی مسولّمان قەناعەتی دڵ ودەروونی پاك بێت لەبەرامبەر ئیمانداران، لەبەرامبەر دایك و باوکی، چونکە هەر ئەو قەناعەتەشە کە وا لە ئینسان دەکات، ڕواڵەتە ظاهریەکەی پاك بێت، من ئەگـەر دڵـم پـاك نەبێت زمانیشم پاك نابێت، دڵم پاك نـەبێت ڕووشـم خـۆش و شـیرین نابێـت،

[٤٦] صحيح البخاري، كتاب الأيمان، باب: حلاوة الأيمان، رقم الحديث ١٦

مسوڵمان ئەگەر دەیەوێ لە ماڵێش ڕووخۆش بێ و لە بەرو بازاڕ ڕووخۆش بێ و لەناو مسوڵمانان ڕووخۆش بێت، با دڵ و دەروونی ساغ و پاك بێت، ئەو کاتە ڕووی خۆش دەبێت، بەداخەوە زۆر کەس کە دەچێتەوە ماڵێ پێی عەیبە سەلام لەماڵ و منداڵی خۆی بکات، ڕووی ئەوەندە گرژە!، پێی وایە تەنازولە ئەگەر سەلام لە خێزانەکەی بکات!، لە سەفەر دێتەوە لەجیاتی ئەوەی بڵێ: ئەرێ خاوو خێزانم حاڵتان چۆنە؟، حاڵتان چۆن بوو؟، هیچ قسەی وای لەگەڵ ناکا، لەوانەیە خۆی بەشایەنی ئەوە نەزانێت کە زۆر قسە لەگەڵ خێزانی خۆی بکات!، لەوانەیە خۆی بە شایەنی ئەوە نەزانێت کە هاتەوە سەلامی لێبکات بڵێ (السلامُ عَلَيكُمْ ورَحمةُ اللهِ وبَرَكاتهُ)، خۆ سەلامکردن هەر بۆ کۆمەڵێك نییە!، ئینسان کە دەچێتەوە ماڵی خۆی با کەسیش لە ماڵێ نەبێت با سەلام بکات لەماڵەوە!، ﴿فَإِذَا دَخَلْتُم بُيُوتًا فَسَلِّمُوا عَلَى أَنفُسِكُمْ تَحِيَّةً مِّنْ عِندِ اللَّهِ مُبَارَكَةً طَيِّبَةً﴾ (٦١) النور، کە دەچیەوە ماڵەوە، بەڕووی گەشەوە لەگەڵ خێزانت و منداڵەکانت، بەڕوی گەشەوە لەگەڵ دایك و باوکت و دراوسێ و ئەهلی موعامەلەت هەڵسوکەوت بکە، چونکە قەناعەتی دڵە وات لێدەکات ڕووت خۆش و گەش بێت، ئەگەر قەناعەتی دڵ و دەروونت پاك بوو ئەوکاتە ئەندامەکانی دەرەوەشت پاك دەردەچن، بە پێچەوانەوە، ئەگەر دڵت پاك نەبوو، قسەی پیسیش بەسەر زمانتدا دێت و ئەوکاتە دەستیشت پیس دەبێت.

وەڵڵاهی برا بەڕێزەکانم: کەسێك لەگەڵ خوادا ڕاست نەبێت، خیانەت لەگەڵ دایك و باوکی خۆیشی دەکات، خیانەت لەگەڵ خزم و کەسی خۆی دەکاو لەگەڵ خێزان و ماڵ و منداڵەکانی خۆیشی دەکات، چونکە پێغەمبەرمان ﷺ فەرمووی: (إذا لَم تَستَحي فَاصنَع ما شِئتَ)[٤٧]: ئەگەر حەیات بەخۆت نەبێت و

---

[٤٧] صحيح البخاري، كتاب الانبياء، باب: أم حسبت أن أصحاب الكهف، رقم الحديث ٣٢٩٦.

شەرم لەخوا نەکەی، هەرچی دەکەی بکە!، واتا کەسێك شەرم لەخوا نەکات شەرم لەهیچ کەسێك ناکات.

جا با شەرم لەخوا بکەین، بەدڵ و دەروون لەگەڵ خوادا بین، دڵمان پاك بێت، لەسەر بنەمای دین بەڕێوە بچین، با لە لۆمەی لۆمەکاران نەترسین، خوای گەورە(جل جلالە) لە سیفەتی مسوڵمانە ڕاستەقینەکاندا دەفەرموێ: ﴿وَلاَ يَخَافُونَ لَوْمَةَ لآئِمٍ﴾ (٥٤) المائدة، واتە: لە لۆمەی لۆمەکاران ناترسێن، جا ئەگەر تۆ لەبەر خاتری ئەوەی لۆمەت نەکرێ خۆت شەرمەزاری قاپی خوا دەکەی، تۆ هەر دەمری، خۆ ئەو خەڵکە لۆمەت هەر دەکات!، ئەرێ بەڕاستی لەبەرو بازاڕی ئەمڕۆ کێ هەیە کابرا باوەڕی بەخوا نەبێ و بەدینی خوا نەبێت، مەدحی خواو پێغەمبەری خوا بکات؟، کێ هەیە ئەگەر دۆستی خواو دینی خوا نەبێت مەدحی خواو مسوڵمانانت بۆ بکات؟، بێگومان کەسێك ڕقی لەتۆ بێتەوە شتی چاکت بۆ نالێ، کابرا هاتووە یەخەی پێغەمبەری ﷺ گرتووەو پێی گوتووە: (إعدلْ يامُحَمَّد!!)[٤٨] : بۆ دادگەر نیت ئەی موحەممەد؟، عەدالەت بکە، پێغەمبەرﷺ تورە نەبوو، عومەری کوڕی خەتتاب فەرمووی: یارسول الله لێم گەڕێ با بەشمشێرێك لەملی بدەم!، پێغەمبەرﷺ فەرمووی لێی گەڕێ (ويحك ومَن يعدِل إذا ما أعدِل) واتە: مالوێران ئەگەر من عادل نەبم کێ عادلە؟!، لەگەڵ ئەوەشدا هێمن بووە، بەلاّم مەبەست ئەوەیە کە هەموو خەڵك لێت ڕازی نابێت، خەڵکی ناحەز و خەڵکی نامسوڵمان قەت لە مسوڵمان ڕازی نەبووە تا مەدحی بکات!، کەواتە نابێ لە لۆمەو لۆمەکاری خەڵك بگەڕێیەوە، لەسەر بنەمای دینی خوا بەڕێوە بچۆ خوای گەورە (جل جلاله) پاڵپشتت دەبێت هەم لەدونیا وە هەم لە قیامەتیش، ئینسانیش بۆ دونیا ناژی، بەڵکو بۆ قیامەتی خۆی دەژی، جا خۆشحاڵی بۆ ئەوکەسەی لەبەرخاتری خوا دەژی و

---

[٤٨] صحيح البخاري، كتاب استتابة المرتدين، باب: من ترك قتال الخوارج، رقم الحديث ٦٥٣٤

لەبەرخاتری خوا دەمرێ، لەسەر بنەمای دینی خوا بەرێوە دەچێ، قەناعەت و دڵ و زمانی یەكە، وە لەگەڵ مسوڵمانان ساغ و سافە، بۆ دینی خوا دەگونجێ.

یارەببی خوایە حاڵمان چاك بكەی، یارەببی خوایە عاقیبەتی هەموولایەك خێر بكەی، یارەببی خوایە دین و ئیمانمان سەلامەت بكەی، یارەببی خوایە ئەوەی راستە راستری بكەی، یارەببی خوایە ئەوەی خوارە راستی بكەیەوە، یارەببی خوایە وامان لێبكەی تەنها لەبەرخاتری تۆ بژین، وە بەمسوڵمانێتی بمرین، خوایە شیفای نەخۆشیەكانمان بێنی، خوایە لە مردوەكانمان خۆشبی، خوایە مسوڵمانان لە هەموو دونیا سەر بخەی، خوایە لەژێر نیری زوڵم و ستەم رزگاریان بكەی، یارەببی خوایە دینی خۆمان بۆ عەزیزو سەركەوتوو بكەی، ئێمەش بەهۆی ئەو دینەوە عەزیز بكەی، خوایە ئەو عیززەتەمان لێنەستێنیەوە، آمین.

أقول قولي هذا وأستغفر الله لي ولكم ولسائر المسلمين، فاستغفِرُوهُ إنَّه كان غَفَّاراً ،

أعوذ بالله من الشيطان الرجيم

{رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ} آمين.

# ڕۆڵی گەنج لە ئیسلامدا

## بسم الله الرحمن الرحيم

إنَّ الحمد لله نحمده ونشكره ونستعفره ونستهديه ، ونعوذ بالله مِن شرور أنفُسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضلَّ له ومن يضلل فلا هادي له، ونشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له ونشهد أنَّ سيدنا ونبينا محمداً عبده ورسوله، هذا الرسول الذي بلغ الرسالة وأد الأمانة ونصح الأمة وجاهد في الله حق جهاده وتركنا على الحجة البيضاء، ليلها كنهارها، لايزيغ عنها إلا هالك صلواة الله وسلامه عليه وعلى أله وأصحابه، صلاةً وسلاماً الى يوم الدين ...، أما بعد يا عبادالله أوصيكم ونفسي أولاً بتقوى الله وطاعته ، فإنَّ اللهَ مع الذين اتقَو والذين هم محسنون، أعوذ بالله من الشيطان الرجيم: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا ۞ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾ (٧٠-٧١) الأحزاب.

ئیماندارانی بەڕێز، شوێنکەوتوانی پێغەمبەری پێشەوامان موحەممەد ﷺ، عاشقانی خوداو پێغەمبەرو پیاوچاکان..، سەلامی خوای پەروەردگارتان لێبێت لە ڕۆژێکی موبارەکی وەکو ئەمڕۆی جومعە دا داوا لە خوای پەروەردگار دەکەین و دەڵێین یارەببی خوایە ڕەحم بە حاڵی ئێمەو هەموو مسوڵمانانی دونیا بکەی، یارەببی خوایە لەسەر ئەساسی ئیسلامەتی بمانژیێنی و بمانمرێنی و، بە مسوڵمانێتی زیندوومانکەیەوە، یارەببی خوایە ڕەحم بە حاڵی ئێمەو نەخۆشەکانمان بکەی، شیفایان بۆ بنێری، لە مردوەکانمان خۆشبی، هیدایەتی خۆمان و ماڵ و منداڵمان بدەی ، یارەببی خوایە ڕەحم بە مسوڵمانان بکەی کە لە جیهان دا لە هەرشوێنێکدا هەن و نارەحەتن لە دەردو کۆسپ و گرفت و نارەحەتی ڕزگاریان بکەی .

خۆشەویستەکانم، خوای پەروەردگار ئینسانی کـە دروسـتکردووە بـەجۆرێك غەریزەیەکی تایبەتی پێداوە کە خۆشویستنی دونیاو ژیـانی دونیـاو ئـارەزووی نەفس و خۆشگوزەرانییە، کە هەموو ئینسانێك هەریەکە بەپێی خـۆی هەسـتی پێدەکات، خوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿كَلَّا إِنَّ الْإِنسَانَ لَيَطْغَى * أَن رَّآهُ اسْتَغْنَى﴾ (٦-٧) العلق، واتە: بەڕاستی ئینسـان خـۆی لـێ دەگـۆڕێ و، یـاخی دەبێ، لەسنوور دەردەچێ، وەختێك کە خۆی دەبینێت دەوڵەمەندەو بێ نیازە!، دەوڵەمەندی نەك تەنها دەوڵەمەندی ماڵ بـەڵکو وەختێـك کـە خـۆی دەبـینێ لەژیانێکی خۆشدایە، لە گوزەرانێکی چاکدایە، خۆی لێ بایی دەبێت و خۆی لێ دەگـۆڕێ و خـۆی لـەبیر دەچـێتەوە کـە لەچـی دروسـتکراوە لەلایـەن خـوای پەروەردگارەوە!، بەڵام خوای گەورە وەبیری دێنێتەوە هەردوای ئەوە پێی دەڵـێ: ﴿إِنَّ إِلَى رَبِّكَ الرُّجْعَى﴾ (٨) العلق، واتە: بەڕاستی دەگەڕێیەوە لای خوا ، ئـەی ئینسان خۆت لێ نەگۆڕێ، خۆت لێ ون نەبێت، خۆت بناسە کە تۆ دوای مـردن دەگەڕێیەوە لای خوا بۆ لێپرسینەوەو دادگاییکردن.

جا بۆیە خوای پەروەردگار کۆمەڵێك بنچینەی داناون کە ئینسان لەسەر ئەو ئەساسانە بەو ڕێگایەدا بڕوات بۆئەوەی کـە خـۆی لـێ نـەگۆڕێ و سـەری لـێ نەشێوێ، هەست بکات بە مەسئولییەتی خۆی، شعور بە بەرپرسـیارێتی خـۆی بکات لە دونیا، ئەو عومرەی خۆی لەشتی پڕوپوچ سەرف نەکات، ئەو وەقتـەی خۆی بە فیڕۆ نەدات!، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (إغتَنِم خَمسـاً قبـلَ خَمـس)[٤٩] واتە: ئەی ئینسان پێنج شتان ئیستیغلال بکەو بە فورسەت بزانە پـێش ئـەوەی پێنج شتی ترت بۆ بێت کە ئەوکاتی چارت ناچارە، تەسلیمی واقیع دەبی.

لە دونیادا ئینسان دە حاڵەت و قۆناغی هەن بۆیە پێغەمبەرﷺ ئیـشارەت بەو دە حاڵەتە دەکات لەو حەدیسەدا، ئەفەرموێ (شَـبابَكَ قبـلَ هَرَمِـك) واتـە:

---

[٤٩] المستدرك على الصحيحين. كتاب الرقاق، رقم الحديث ٧٨٤٦

گەنجایەتیت پێش پیربوونت!، دوو قۆناغن: گەنجایەتی قۆناغێکە پیربوونیش قۆناغێکی ترە، نەفەرموێ ناگات لە گەنجایەتی خۆت بێ کە پیر بوویت دوایی دەستەڵاتت نامێنێ!، خۆزگە بە وەختی گەنجایەتیت دە خوازیت ئەوکاتە کە دەستەڵاتت نییە!، دووحاڵەتی تایبەت بەرامبەر یەك کە زۆر لێك جیاوازن!، دوایی دەفەرموێ (صِحَّتَكَ قَبلَ سَقَمِك) واتە: لەش ساغیت پێش نەخۆشیت، ئینسان کە لەشی ساغە، جەستە و هۆشی ساغە، ئەتوانێ کار بکات و ماندوو ببێ، دڵسۆزبێت و چاکەکار بێت، خزمەتکاربێت، بەڵام ئەگەر نەخۆش بوو لەسەر جێگا دەکەوێ، چاری ناچارەو دەبێ ڕازی بێ بە نەخۆشییەکەی خۆی و خۆزگە بە کاتی لەش ساغی و هۆش ساغی دەخوازێ!، وە دەفەرموێ (فَراغَكَ قَبلَ شُغلِك) واتە: ئەو کاتانەی کە بێ ئیشی بە فورسەت بزانە پێش ئەوەی کە کاروبارو مەشغەڵەت و سەرقاڵیت بەسەردابێ و خۆزگە بەوکاتانە بخوازی کە ئیشت نەبووە بۆئەوەی کاری خێری تێدا ئەنجام بدەی، ئەو کاتانەی بێ ئیشی بە فورسەت بزانە، بۆیە زانایەك دەڵێ: (الوَقتُ سَيفٌ إن لم تقطعهُ يقطَعكَ)[٥٠] واتە: کات شمشێرێکە ئەگەر نەیبڕی دەتبڕێ!، ئەو کاتەی کە ئێستا ئێمە بەفیڕۆی ئەدەین بە پارە دەست ناکەوێ!، بەڵام ئێمە قەدری نازانین ئەو کاتە چەندە بە نرخە!، کات لەلای بێباوەڕان ئەمڕۆ بە نرخە کە شەووڕۆژ دەخەنە سەریەك لە وڵاتانی ئەورووپاو ڕۆژئاوا، شەووڕۆژ دەخەنە سەریەك بۆئەوەی وەقتیان لێ نەڕوات بۆ دونیای خۆیان، بۆ وەدەستهێنانی ئامانج و دەستەڵاتی دونیایی خۆیان، بەڵام بەداخەوە کات لەلای ئێمەی مسوڵمان زۆر بێ نرخە بەڕاستی!!، وە زۆر بە زایەی ئەدەین!، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی مسوڵمان کات بەزایە مەدە، ناگات لەخۆت بێت ئەو کاتانەی کە بێ ئیشی ئیستیغلالی بکەو

---

[٥٠] جد الحثيث، باب الواو، رقم ٥٩٥ ، فيه يقول: .. من كلام بعض الحكماء، وأيضا: كشف الخفاء، باب حرف الواو، رقم ٢٩٣٥

بە فورسەتی بزانە پێش ئەوەی قوٚناغی ئیشکردنت بەسەر دابێ!، پاشان فەرمووی (غِناكَ قَبلَ فُقرِك) واتە: حاڵەتی دەوڵەمەندیت بە فورسەت بزانە پێش ئەوەی کە فەقیربیت، زوٚر کەس هەیە کە ئێستا فەقیربووەو، پێشتر لە حاڵەتێکدابووە کە دەوڵەمەندبووە، دەڵێ: خوٚزگە لە حاڵەتی دەوڵەمەندیم دا یان لەساڵانی ڕابردووم، یان لە فلانە زەمەنەدا چاکەو خێرو پیاوەتیم بەماڵەکەمەوە بکردایە!.

بەڕێزان: قوٚناغی گەنجێتیێ قوٚناغێکە نیعمەتی خوایە بوٚ ئینسان و پاشان لێی وەردەگرێتەوە!، بوٚیە پێویستە هەموو ئینسانێك بە حەقی خوٚی ئەدای بکات، جا یان لە دونیا لێی وەردەگرێتەوە یان بە مردنی لێی وەردەگرێتەوەو ئیدی ئیستیفادەی لێ ناکات کە لە حاڵەتی ژیانی دا ئیستیغلالی نەکردووە.

وە کوٚتاییشی دەفەرموێ (حَياتَكَ قَبلَ مَوتِك) واتە: ژیانت پێش مردنت ئیستیغلال بکە، ئینسان ئەگەر مرد هەموو کردەوەکانی دەپچڕێن، جا هونەر ئەوەیە ئینسان لەژیانی دونیادا ئاگای لە خوٚی بێت خوٚی لێ نەگوٚڕێ و بزانێ ئەوژیانە بوٚچی دروست بووە؟، بزانێ ئینسان بوٚچی هاتوٚتە سەر ئەو دونیایە؟!، وەزیفەی ئەو ئینسانە چییە و بوٚ کوێ دەڕوات؟، لەکوێ هاتوین ، بوٚچی هاتووین و، بوٚ کوێش دەڕوٚین؟!.

بەڵێ خوٚشەویستەکانم، ئێمە لە وتاری ئەمڕوٚی جومعەدا لە خزمەتی یەك حاڵەت لەو حاڵەتانە دەبین کە ئەویش ڕوٚڵی گەنجە، کە حاڵەتی گەنجێتی یە، خوای گەورە چوٚن ڕێزی لە گەنج ناوە؟، ئیسلام چوٚن دەڕوانێتە گەنج؟، گەنجی مسوڵمان دەبێ چوٚن بێت؟، وەزیفەو واجبی گەنجی مسوڵمان چییە؟ گەنجی مسوڵمان چوٚن داهاتوویەکی چاك لە دونیاو لە قیامەت بوٚخوٚی وەدەستبهێنێ؟، خوٚشەویستەکانم: لە سێ خالاٚندا دەمەوێت لە خزمەتی براو خوشکە گەنجەکانماندابم بەتایبەتی بوٚیە دەڵێم گەنجەکان چونکە دەمەوێ زیاتر لە وتاری

ئەمڕۆی جومعەدا ڕوو لە گەنجەکان بکەم بەڕاستی زۆرێـك لـە گەنجـەکان ڕێـزم بۆیان ئاگایان لەخۆ نییە خۆیان دۆڕاندووە!، لە ئیـسلام دەرچـوون!، سـنووریان بەزانـدووە!، یـان هـەر مـسولمان نـین!، دەبـێ ئێمـەی مـسولمان بـەزەییمان پێیاندابێتەوە، ئەو ڕاستییانەی کە لەلای ئینـسانی مـسولمان دەسـت ئەکـەون لەکانیاوی پڕلە گەوهەری قورئان وسوننەتی پێغەمبەرﷺ دەست ئەکەون دەبێ براو خوشکە گەنجەکانمان لێی ئاگاداربن.

بۆیە دەبێ چەند خاڵێك بزانن:

یەکەم: قۆناغی گەنجێتی چەندە گرنگە، وە چەندە ئیسلام ڕێزی لێناوە.

دووەم: خۆ پێگەیاندنی گەنجی مسولمان چۆن دەبێ؟.

سێیەم: ئەرك و وەزیفەی گەنجی مسولمان چییە؟.

خۆشەویستەکانم: ئەگەر بەراوردێك لـە نێـوان قۆنـاغی گـەنجێتی و قۆنـاغی پیرێتی بکەین زۆر شـتی ئاشـکرامان دەسـت ئەکـەون و دەبیـنین، لـە قۆنـاغی گەنجێتی دا ئینسان هۆشی ساغە، فیکری تیژە، لەشی ساغەو بـەهێزە، ئـەتوانێ کاروبار ڕاپەڕێنێ و بەهێزو جورئەت و بەتوانایە، بەڵام کاتێ پیربوو دیاردەی بـێ هێزی لە هەموو لایەنەکانەوە تێدا دەردەکەوێ!، سـەری دێـشێ، چـاوی زەعیـف دەبێ، ددانی دەکەون، گوێیـەکانی زەعیـف دەبـن، بـەدەنگی بـەرز نـەبێ شـت نابیستێ، دەستی دەلەرزن، دڵی کوتەکوتەدەکات و دەیان نەخۆشی وەکو زەختـی خوێن و شەکرەو هەموو نەخۆشییەکانی بێ هێزی لێ پەیدا دەبن!، لاق و تـەژنۆی دەلەرزن، ئەو ئەندامانەی کە تادوێنێ سـاغ و سـەلامەت بـوون و شـان وشـکۆو دەست و بازووی لە کارکردن و بەڕێوەبردنی کاروباری دونیا بـەکاردەهێنا ئـەمڕۆ تەوانەی نەماوە!، با بەراورد بکەین بزانین جیـاوازی نێـوان گـەنج و پـیر چییە؟: بزانین چەندە فەرقیان هەیە، بۆیە بەڕاستی زۆرجار ئەگەر گەنجێك لەلای پیـاوێکی پیر دادەنیشێ ئەو پیاوە پیرە دەڵێ: خۆزگەم بەکاتی گەنجێتی!!، ئەگەر بمزانیبایـە

وام دەكرد و وام نەدەكرد!، بەڕاستی ئەوە دەرسێكی زۆر گەورەیە بۆ ئەو گەنجە كە گوێی لێ دەبێت ئەو پیاوە پیرە چی دەڵێ جا ئەگەر ژنە یان پیرە پیاوێكە نەوقسەیە دەكات، دەرسێكی زۆر گەورەیە یەعنی ئەی گەنجە تۆش بزانە ئەوقۆناغەت بەسەردادێ، ئەو قۆناغەی گەنجێتی هەرنامێنێتەوە!، تۆش ڕۆژێك دێ دەگەیە ئەو قۆناغەی كە من ئەمڕۆ تێیدام!، جا بە فورسەتی بزانە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئاگادارمان دەكاتەوەوپێمان دەفەرموێ ئاگاتان لە قۆناغی گەنجایەتیتان بێ.

قورئانی پیرۆز مەدحی ئەوانە دەكات كە لەگەڵ پێغەمبەرﷺ بوون و زۆربەیان گەنج بوون، دەفەرموێ: ﴿مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ ﴾(٢٩) الفتح، واتە: موحەممەد نێردراوی خودایە (جل جلاله) وە ئەوانەی كە لە گەڵی دان دوو سیفەتی زۆر گەورەیان هەیە: یەكێكیان ڕەق و توندن لەسەر بێ باوەڕان لەكاتی جەنگدا، بەجورئەت و بە غیرەتن لەسەر كافرو بێباوەڕان، لە نێوان یەكتریشدا زۆر بەبەزەیی و بەڕەحم و لێبووردەن، برایەتیی یان زۆر بەهێزە، كە ئەوە بەڕاستی دوو دەرسی زۆر گەورەن: یەكەمیان، ئینسانی موسڵمان دەبێ بە غیرەت بێ، چاونەترس بێ، لەخۆبوردوو بێ..، چونكە ئینسان یەك جار دەمرێ ئەویش ئەو مردنەیە كە خوا دیاری كردووە!، گیانی خۆی لەخزمەتی دینی خوادا بەخت بكات، مسوڵمانانی خۆش بوێن، بێ دینانی ڕق لێ ببنەوە، لەبەر خاتری خوا، وە لە نێوانی خۆشیاندا مسوڵمانان دەبێ تەبا و برابن، ڕێك و پێك بن، بەبەزەیی و نەرم و نیان بن، خۆبەزۆر نەزانن و، دڵ و سینەیان فرەوان بێ، حیقد و بوغزو حەسەدیان بەرامبەر بەیەكتری لە دڵدا نەبێ، قورئان ئاوا مەدحی صەحابەكان دەكات، صەحابەكانی پێغەمبەرﷺ كە لەسەرەتاوە هەموویان گەنج بوون تەنها كەسانێكی كەم نەبێ!، ئەبوبەكر (ڕەزای خوای لێبێ) دەفەرموێ: خۆم دەبینی لەناو ئەوهەموو گەنجانەدا ڕیشم

سپییە!، هەموویان گەنج بوون لەسەردەمی هیجرەتدا!، دەوڵەتی مەدینەیان دامەزراند هەموویان گەنج بوون، ئەوە دەرسی زۆری تێدایە، ئەگەر تەماشای سیرەی پێغەمبەرﷺ بکەین ئەو ئیسلامە بەرێزو پیرۆزو بەنرخە کە بە ئێمە گەیشتووە لەرێگای ئەو گەنجانەوە بە ئێمە گەیشتووە!.

بەڵێ خۆشەویستەکانم، قورئان مەدحی ئەو کۆمەڵە گەنجەش دەکات کە پێیان دەگوترا (أصحابُ الكهف) دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ آمَنُوا بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَاهُمْ هُدًى﴾ (١٣) الكهف، واتە: ئەوانە چەند گەنجێك بوون باوەڕیان بە پەروەردگاری خۆیان هێنابوو، چەند گەنجێك بوون!!، ئەو گەنجانەی کە خوای پەروەردگار قانوونی کەونی بۆ گۆڕین کە ئینسان لە شەوو رۆژێکدا دەبێ چەند سەعاتێك بخەوێ، ئەوان سێسەدونۆ ٣٠٩ ساڵ لە ئەشکەوتێکدا خەوتن!، ئەوانە باوەڕیان بەخوا هێناو ملیان کەچ نەکرد بۆ ستەمکارانی سەردەم و لێیان ڕاپەڕین و رێی هیجرەت و دەربەدەرییان لەوپێناوەدا گرتەبەر، لەبەرئەوە خوای گەورە مەدحیان دەکات، بۆیە پێغەمبەریشﷺ وەسیەتێکی تایبەت بۆ گەنجەکان دەکات و، دەفەرموێ: (أُوصيكُم بِالشُّبّانِ خَيراً فإنَّهُم أرَقُّ أفئِدة) واتە: ئەی ئیمانداره‌کان (پیاوان و ئافرەتان) گوێتان لێبێت، ئاگادارتان دەکەمەوە کە ئاگاتان لە گەنجەکان بێت ( چ برایان و چ خوشکان) چونکە دڵنەرمترین کەسن!، گەنج وەکو دارێکی شلك وایە، دارێك کە تازە پێدەگات، ئەو باو ڕەشەبایەی کە دێ دەیسوڕێنێ بەولایەدا و بەولایەدا..، لەبەرئەوە ئاگاتان لێیان بێت زۆرجار براو خوشکی گەنج بە دڵدانەوەیەك دێتەسەر کاری خێر، زۆر جاریش بە کاردانەوەیەکی خراپ، بە قسەیەکی ناشیرین، بە هەڵوێستێکی نەگونجاو لەلایەن بەرامبەرەکەیەوە ئەگە باوکی یان دایکی یان برایەتی..، ڕێگایەکی هەڵە دەگرێتەبەرو دوایی لەدەست هەموویان دەچێت، بۆیە فەرمووی ئاگاتان لە گەنجەکان بێت دڵیان نەرمە و زوو شت وەردەگرن و، زوو رد فعل پەیدا دەکەن!. بۆ چاکە زوو دێنە پێش بەلاّم لەبەرئەوەی شعوریان ناسکە لە گەنجێتی دا زۆر

جار وەکو رد فیعلێك بەرەو خەراپە دەگۆڕێن ئەگەر هەڵوێستێکی خراپتان لە بەرامبەریان هەبێ، بۆیە فەرمووی ئاگاتان لە گەنجەکان بێت!.

ئیسلام ئاوا تەماشای گەنج دەکات بەلاّم گەنجەکانمان چۆن خۆیان پێبگەیەنن؟

یەکەم هەنگاویان: بە مزگەوت پێدەگەن، مزگەوت ئینسان دروست دەکات، مزگەوت کە شوێنی خواپەرستییە ئینسان دەگەیەنێتە پلەیەکی بەرز بەتایبەتی گەنجەکانمان، پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ دەفەرموێ: (سبعةٌ يُـظِلُّهُمُ اللهُ في ظِلِّهِ يَومَ لا ظِلَّ إلاَّ ظِلُّه)[١] واتە: حەوت جۆرە ئینسان لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە دەیانخاتە ژێر سێبەری خۆیەوە کە ئەوڕۆژە هیچ سێبەرێن جگە لە سێبەری ئەو، یەکێك لەوانە: (شابٌ نَشَأ في عِبادة الله) گەنجێك کە لە ناو خواپەرستی دا گەورە بووبێ چ کوڕبێ چ کچ!، گەنجێك لە مزگەوت پەروەردە بووبێت، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (إذا رَأَيتُمُ الرَّجُلَ يَتَعاهَدُ المَسجِد فاشْهَدُوا لَهُ بالإيمان)[٢] واتە: ئەگەر پیاوێکتان بینی بەردەوام هاتوچۆی مزگەوت دەکات، هاتوچۆی جومعەو جەماعەت دەکات ئەوا شاهێدی بۆ بدەن کە ئینسانێکی ئیماندارە!، ئەوەی کەدڵی پەیوەستە بە مزگەوت و دڵی لەلای مزگەوتە، ئەوەی کە نوێژەکانی لە مزگەوتن و هاوەڵی مزگەوتەو ئەهلی مزگەوتە خوا مەدحی دەکات، پێغەمبەرﷺ مەدحی دەکات، لەبەرئەوە برای گەنج یەکەم هەنگاو دەبێ لە مزگەوتەوە دەستپێبکات، دەبێت لە مەدرەسەی موحەممەد ﷺ بخوێنێ کە مزگەوتە، وە لە کتێبی خودا (جل جلاله) کە قورئانی پیرۆزە دەرس وەربگرێ، ئەو خودایەی کە دروستیکردووە ئەویش دەزانێ چ بۆ وی باشترە بۆ دونیای، خوا ئەفەرموێ: ﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾ (١٤) الملك، خوایەك کە دروستی کردووی هەر ئەو دەزانێ بەرنامەت بۆ دابنێ! هەرئەو

---

[١] صحيح البخاري، كتاب الجماعة والإمامة، باب: من جلس في المسجد وانتظر الصلاة، رقم الحديث ٦٢٩

[٢] سنن الترمذي، كتاب الايمان، باب: حرمة الصلاة، رقم الحديث ٢٦١٧.

دەزانیٚ چ بۆ دونیای تۆ، وە چ بۆ دوای مردنی تۆ باشە! بێگومان خوای گەورە بە ئێمە زاناترە لە خۆمان بۆخۆمان!.

**خۆشەویستەکانم**، دووەم هەنگاو بریتی یە لە فێربوونی زانست و زانیاری، بە دەرس خوێندن لەلای مامۆستایان وە لە حەلەقاتی دەرسی مزگەوتەکان، وە بە دەرس خوێندن لەلای پیاوێك، یان خوشکان لەلای خوشکێك کە شارەزایە بە دین، ئینسانی مسوڵمان هەتا زۆر بزانیٚ هێشتا هیچی نەزانیوە!، چونکە ئایینی ئیسلام زۆر فراوانە!، ئەو وەقتەی کە ئینسانی گەنج هەیەتی دوایی بە دەستیەوە نامێنیٚ و لە دەستی دەڕوات و پەشیمان دەبێتەوە!، ئەو عومرە چاکەی با لە خواپەرستی دا بەکاری بهێنیٚ نەك خوانەخواستە ڕۆژیٚ لە ڕۆژان بۆی پەشیمان بێتەوە کە ئەوکاتە دادی نادات!، سەد حەیف و مخابن بۆ ئەو گەنجانەی کە کاتی خۆیان بە فیڕۆ ئەددەن! سەد حەیف و مخابن بۆ ئەو گەنجانەی کە ئاگایان لیٚ نییە وەقت بەخێرایی بەسەریاندا تێدەپەڕیٚ بەلاٚم بە فورسەتی نازانن!، تەماشاکەن پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (إغْتَنِمْ) فەرمووی: بە غەنیمەتی بزانە کاتی گەنجێتیت!، غەنیمەت ماڵ و سەروەت و سامانێکە کە مسوڵمانان بەشەڕ لە کافرەکانی دەگرن!، بۆیە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: کاتی گەنجێتیت بە غەنیمەت بزانە!، بەلاٚم بەڕاستی ئێمە زۆر بەبیٚ نرخ تەماشای دەکەین، بۆیە دەڵێین حەیفە، سەد حەیف بۆ ئەو گەنجانەی بەڕۆژو بەشەو تەنها خەریکی ئەودن ئارەزووی جینسییان تێرکەن!، بەداخەوە کە لە کوردستانمان خەڵکێکی زۆر تەقلیدی ڕۆژئاوا دەکات و، خەریکە ئەوهەموو داب و نەریتەی ڕۆژئاوا لە کوردستانی ئێمەشدا پیادە دەکرێت بەتایبەت لە بابەتی ئافرەت و بەڕەلاٚیی ئافرەتان لە فیلم و زۆر دەزگاکانی ئیعلام دا...؛ کە کاریگەری لەسەر ئەخلاقی میللەت هەیە، بەڕاستی خەریکە بەشێوەیەکی گشتگیر تەقلیدی ڕۆژئاوا دەکەین، کە ئەوەش خەتەرێکی گەورەیە لەسەر هەموو میللەت!، بۆیە دەڵێین حەیفە بۆ ئەو گەنجانەی کە ئاگایان لەخۆ نییە بە ناڕاستەوخۆ بەرێگای شەیتان

دەڕۆن و شەیتان فێڵی لێكردوون، وە حەیفە بیر لە هیچی تر ناكەنەوە لەوە نەبێ تاخۆ كەی بڕۆن بۆ خاریج!، تاخۆ كەی سەرەیان دێت و ئەوانیش دەڕۆن، كەی لەگەڵ فلانەكەسە ڕێگای دەبێ و دەڕوا بەو شاخ و كێوەدا تا دەگاتەلای برادەرەكانی یان لای فلانە ولاتە!، كە پێی وایە ئەگەر ڕۆیشت بۆ ئەوێ ئیتر هەمووشتی تەواوكرد، دین و دونیای هەموو لەوێ مسۆگەرە!!، ئاگامان لێ نییە زۆركەس هەیە لەسەری قەرزاربوتەوە دینی لەسەرداناوە!، زۆركەس هەیە سەرو ماڵی لەسەر داناوە!، ماڵ و منداڵی لەسەرداناوە!، سومعەی خۆی لەسەرداناوە!، تەنانەت زیانی بە سومعەی میللەت و ولاتەكەی گەیاندووە!، دەڵێن ئەوە فلانە كوردە لە فلانەشوێنە فلان ئیشی كردووە!، فلانە قسەیە دەكات!، بۆیە خۆشەویستەكانم: زۆر باوك و دایك هەنە ئەمڕۆ ئاخ و داخیان لەسەرئەوەیە كە كوڕەكەیان ڕۆیشتووە پرسیشی پێیان نەكردووە! ماڵ و منداڵەكەی خۆی بەجێهێشتووە، بەبێ پرس و مەشوەرەتی ماڵ و منداڵیشی سەفەری كردووەو ڕۆیشتووە، حەیفە ئەو گەنجانەمان تەنها بیر لەوە دەكەنەوە چۆن بڕۆن پارەیەك پەیداكەن و بدەنە قاچاخچەیەك و بڕۆن بۆ خاریج!!، بەڕاستی حەیفە برایەكی گەنج ئاوا ڕۆشنبیر لە قۆناغێكی پڕلە هێز و تواناو فیكردا تەنها بیرلەوە بكاتەوە چۆن ولاتی خۆی بەجێبهێڵێ، ولاتی لەدایك بوونی، ولاتی باوك وباپیرانی! تەنها بڕوات بۆ شوێنێ كە لەوێ نازانێ خزمەت بە چ كافرێك دەكات!!، ڕێزم بۆ ئەو براو خوشكە مسوڵمانانەی كە لەوێ دین و ئابرووی خۆیان و میللەتەكەیان پاراستووە، دەستخۆشییان لێ دەكەم، بەلام بەڕاستی خەتەرێكە ڕووی لە میللەتی ئێمە كردووە ئەوە بەڕاستی بەلاو موسیبەتێكە بۆ میللەتی ئێمە!، كە گەنجەكانمان بیر لە هیچی تر نەكەنەوە تەنها ئەوە نەبێ بڕۆین بۆ خاریج، بەڵكو دەبێ بیر لەوە بكەنەوە داهاتووی خۆیان لە دونیا و لە قیامەت چۆن دابین دەكەن!.

ئینجا خاڵی کۆتایی، وەزیفەی برا و خوشکە گەنجەکانمان چییە؟، ئایا بەوە خوای گەورە لێیان دەگەڕێ کە تەنها بۆخۆیان مسوڵمان و دیندار بن و، ئەهلی مزگەوت و قورئانخوێن بن، وە لە دەرسی عیلم دابنیشن، بەوە لێیان دەگەڕێ تەنها قوتابی بن؟ بێگومان نەخێر!، تادوێنێ ئەگەر قۆناغی منداڵێتی بوو، ئەمڕۆ قۆناغی گەنجێتیتە، تادوێنێ ئەگەر یەکێ بەرپرست بوو ئەمڕۆ تۆ بەرپرسی!، تادوێنێ ئەگەر باوك و دایکت تۆیان بەخێودەکرد لە ژیانت، لە پەروەردەکردنت، لە شەوو ڕۆژت ئەوان بەرپرست بوون ئێستا تۆ بەرپرسی لێیان، خوا لە قورئان دەفەرموێ دەبێ بڵێی: ﴿ وَقُل رَّبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا ﴾ (٢٤) الإسراء، خوایە لە دایك وباوکم خۆش بەو بەزەییت پێیاندا بێتەوە هەروەکو منیان بە گچکەیی پەروەردەکردووە، بەڵام بەداخەوە ئەمڕۆ زۆر گەنج هەن باوك و دایکی خۆیان فڕێداوە!، ئاگایان لێ نییە، لێشی ناپرسنەوە!، یان بەجێیان هێشتووەو ڕۆیشتوون بۆ هەندەران!، منداڵی مسوڵمان دەبێ بەوەفابێ بەرامبەر باوك و دایکی، لەبەر خاتری خوا ئەویان بە گچکەیی پەروەردەکردووەو بەخێویانکردووە، شەوخوونیان لەسەر کێشاوە!، (هەروەکو لە چەند وتارێکی ڕابردوودا باسکراوە) بۆیە دەڵێین واجبی یەکەمی گەنج بەرامبەر باوك و دایکی یەتی، تادوێنێ ئەویان بەخێوکردووەو ژیاندوویانە، غەمیان پێوە خواردووە، دەبێ ئەم لەوەودوا ڕێزیان بگرێ قسەیان نەشکێنێ وە دەبێ لەوەودوا حورمەتیان بۆدابنێ، ئیشیان بۆ ئاسان بکات، بەخێویان بکات، ماندوویان نەکات!.

مەسئولییەتی دووەمی بەرامبەر بە خێزانەکەیەتی: کە هەتا دوێنێ بێ خێزان بوو ئەمڕۆ ماڵی داناوە، خێزانێکی لەبەردەستە، ماڵێکی بۆداناوە، ئافرەتێکە لەبەردەستی ئەو پیاوەدایە، ئەو پیاوە لێی بەرپرسە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (كُلُّكُم راعٍ وَكُلُّكُم مَسؤولٌ عَن رَعِيَّتِهِ) هەمووتان چاودێرن، وە هەمووتان بەرپرسن لەوەی لەبەردەستاندایە!، ئینسان لە ماڵی خۆی مەسئولە بەرامبەر ماڵ و منداڵی خۆی، بەرپرسیارە لێیان و لە ڕۆژی قیامەت لێی دەپرسرێتەوە، هەروەکو چۆن

ڕەئیسی دەوڵەت بەرپرسە لە وڵاتەکەی خۆی و بەرامبەر بە میللەتەکەی خۆی، هەروەکو کوێخای دێیەك یان ئەنجومەنی دێیەك کە کراوەتە براگەورە، ڕەئیسی شارێك کە کرابێتە براگەورە بەرپرسە لە قازانج و بەرژەوەندییەکانی ئەو میللەتە و ئەو دانیشتووانەی کە لەبەردەستی دایە، بەئەندازەی کەمتەرخەمیی لە ڕۆژی قیامەت لێی دەپرسرێتەوەو موحاسەبەی دەکرێت!.

پاشان بەرپرسیارێتی بەرامبەر منداڵەکانی، پەروەردەکردنیان ولێپێچانەوەیان، لە بەرامبەر چاکەکردندا تەشجیعکردنیان و، لە بەرامبەر هەڵەکردنیان موحاسەبەکردنیان، ئەوە بەرپرسیارێتی گەنجە کە قۆناغێکەو دێتەپێشی، ئینجا بەرپرسیارێتی تریش ئەوەیە بەرپرسیارە بەرامبەربە واقیعێکی نابەجێ، بەرامبەر خراپەکارییەك کە لەناو شارو وڵاتەکەی هەیە!، دەبێ ئەو گەنجە هەوڵبدا بیگۆڕێ، کورد دەڵێ: ئەگەر برا لەپشت برا بێ مەگەر قەزا لای خودابێ! خۆ ئەگەر گەنجەکان پاڵپشتی یەکتری بن و ڕیزەکانیان تووندوتەواو بێت، ئەگەر موسڵمانانی دونیا ئەمڕۆ هەموویان یەك هەڵوێست(موقف) دەبن دەتوانن واقیعی خراپ بگۆڕن!، بەڵام گەنج نابێ تەنها بیر لەوە بکاتەوە بەیانییەکەی بڕوا بۆسەر دوکانێ و ئێوارێ بێتەوە، وەزیفەکەی بەجۆرێك ئەنجام بدات کە دەوامی تەواوبوو بێتەوە ماڵەوە، پارووەیەك نان بۆ ماڵ و منداڵی پەیدابکات و ئیتر تەواو..، نەخێر!، واجبی گەورەتری لەسەرشانە کە بریتی یە لە هەڵگرتنی دروشم و شیعاری دین!، هەڵگرتنی ئەرك و وەزیفەی ئیسلامەتی، خوای پەروەردگار لەسەری داناوە، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ﴾ (٢٣) الأحزاب، واتە: لە ئیمانداران پیاوانێك هەڵئەکەون کە ڕاستیانکردووە لەو پەیمانەی بەخوایانداوە، ئەو پیاوانە کێن؟ ئەو پیاوانە زۆربەیان ئەوگەنجانەبوون کە لەسەردەمی پێغەمبەردا ئەو ئیسلامەتی یەیان بە ئێمە گەیاندووەو، بەردەوام بوون تا هەندێکیان شەهید بوون وە دوایی ئەوانی تریش هەر بە پلەی شەهادەت

ڕۆیشتن، گەنج دەبێ وابێ.. ئەو پیاوانە چ پیاوانێکن کە خوای گەورە مەدحیان دەکات دەفەرموێ: ﴿رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ اللَّهِ﴾(٣٧) النـــور، واتە: ئەوانە پیاوانێکن کە نە تیجارەت غافڵیان دەکات لە دین و خواپەرستی و نە کڕین و فرۆشتن مەشـغوڵیان دەکـات نـە دوکـان و بـازاڕ، دەبـێ ئینـسانی مـسوڵمان هەموو ئەوانەی وەکو وەسیلەیەك بۆ خزمەتی دین بەکاربهێنێ، بەڵام نابێ لەسەرووی هەموویانەوە دینی لەبیر بچێتەوە!، خزمەتکردنی بە ئیـسلامی لەبیر بچێتەوە، خوای گەورە مەدحی ئیبراهیم دەکات (علیـه الـصلاة والـسلام) - کە باوکی پێغەمبەرانە- دەفەرموێ: ﴿إِنَّ إِبْرَاهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًـا لِلّـهِ حَنِيفًـا وَلَمْ يَكُ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ (١٢٠) النحـل، واتە: ئیبراهیم بەتەنها ئوممـەتێك بـوو، بۆچی؟، چونکە گەنجێك بوو بۆ خوا ساغ بووبویـەوە، ئـەو گەنجـەی کـە خـوای گەورە لە قورئان بە ئێمە دەفەرموێ: ﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْـوَةٌ حَـسَنَةٌ فِـي إِبْـرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ ﴾ (٤) الممتحنة، وەختێك کە ئیبراهیم بە باوکی و قەومەکەی خۆی وت: ﴿إِنَّا بُرَاء مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّـهِ﴾ (٤) الممتحنـة، واتـە: ئێمـە بەریین لە ئێوەو لە ئەوانەش کە دەیانپەرستن جگە لەخوا!، بەریین لە ئێـوەو لـە پەرستراوەکانیشتان و لە بیروباوەڕەکەشتان، ئیبراهیم ئاوای وت بە قەومەکەی و ئاوای بە باوکی خۆی گـوت، تـەنها گـەنجێك بـوو، هـەموو بتـەکانی بەتـەنها شـکاندن!، ئـەوە ڕۆڵـی گەنجـە، ئـەوە وەزیفـەو واجـبی گەنجێکـە، بتـەکانی هەمووشکاندن ئینجا کە گەڕاوەیە لە بەرامبەر کافرەکانـدا بەتـەنها ڕاوەسـتاو موناقەشەی کرد، وە بەڵکو ئامادەش بوو خۆی بخاتە ناو ئاگر دوای ئەوەش کـە خرایە ناو ئاگر خوا لەبـەر حورمـەتی ئـەو گەنجـە کـە بـۆ خـوا سـاغ بوتـەوە فەرمووی: ﴿يَا نَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَامًا عَلَى إِبْرَاهِيمَ﴾ (٦٩) الأنبيـاء، واتە: ئەی ئاگر ساردبەوەو ساردێکی سەلامەتیش بە!، خوای گەورە قـانوونی ئـاگری کـە سـوتاندنە گـۆڕی بەسـارد لەبـەر گـەنجێك کـە بۆخـوا سـاغ بۆتـەوە!، بۆیـە خۆشەویستەکانم ئێمەش بەڕاستی دەبێ تەماشای ئەو پێغەمبـەرە پایەبەرزانـە

بکەین کە لە تەمەنی گەنجێتی دا هاتنە مەیدانێ، هەموویان پێش تەمەنی پیری وەحیی یان بۆ هاتووە کە تەمەنی گەنجێتی و کامڵ بوونە، عیسا پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام) لە تەمەنی سی و سێ ساڵیی دا بووە بە پێغەمبەر، لەوپەڕی گەشەسەندنی بونیەی گەنجێتی تینساندا، بۆیە نابێ گەنجەکانیشمان هەروا بەخۆیانەوە خەریك بن ئاگایان لە واقیع و دەوروبەری خۆیان نەبێ، تەماشای ئەصحابەکانی پێغەمبەرﷺ بکەین هەموویان گەنج بوون، وە تەماشای هاوەڵانی پێغەمبەرەکانی دیکە بکەین (علیهم الصلاة والسلام) گەنج بوون، بۆیە کافرەکان بە پێغەمبەر نوح (علیه الصلاة والسلام) دەڵێن: ﴿مَا نَرَاكَ إِلاَّ بَشَرًا مِّثْلَنَا وَمَا نَرَاكَ اتَّبَعَكَ إِلاَّ الَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ الرَّأْيِ وَمَا نَرَى لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍ بَلْ نَظُنُّكُمْ كَاذِبِينَ﴾ (۲۷) هود، واتە: ئێمە نابینین کەسی چاك وەدوای تۆ کەوتبێ تەنها ئەوانەن کە تازە گەنجن و پێدەگەن و هەرزەکارن، ڕەنییان لاوازە ( بەپێی ڕای ئەوان)!، دیارە گەنجەکان هەڵگری مەشخەڵی خواپەرستی بوون بۆیە بەڕاستی دەبێ ئێمەش گەنجەکانمان براوخوشکەکانمان بیر لەوە بکەنەوە..، سەد حەیف و مخابن بۆ ئەو گەنجانەی کە کەسێکی وەکو موحەممەدﷺ پێغەمبەرێکی وا سەرکردە هەبێ، دینێکی وا گشتگیری بۆ هێنابن کە باسی هەموو لایەنەکانی ژیان دەکاو بەچاکترین شێوە ڕێکی خستووە بەلاَم ڕێگای شەیتانی بگرێ!، پێغەمبەری بە قائید و سەرکردەی خۆی نەزانێ!، دەرسی لێ وەرگرێت، کە ئەمڕۆ سوننەتە پیرۆزەکانی لەناوماندا هەیە، پێغەمبەرەکەمان لەنێوانماندایە بەو حەدیس و فەرموودانەی کە فەرموونی و بۆ ئێمەی بەجێهێشتوون، کە فەرموویەتی ئەگەر قورئانی خوا لەگەڵ سوننەتی من دەستیان پێوەبگرن سەرتان لێ ناشێوێ، جا ئەو گەنجانەی خۆشمان ئەگەر دەیانەوێ دونیاشیان هەبێ و قیامەتیشیان هەبێ با دەست بە دینەوە بگرن، دەست بە ئیسلامەتی یەوە بگرن سەربەرزی دونیاو قیامەت دەبن، ئەوگەنجانەی کە وشیارن با بەدوای ڕاستی دا بگەڕێن و بزانن ڕاستی لە

کوێ هەیە؟، بزانن دکتۆری دەردەکان لەکوێ هەیە؟ زۆر گەنجمان هەیە زۆرجار لەخۆی بێزاردەبێ لەوەزعی خۆی بێزار دەبێ خەریکە خۆی دەکوژێ، بێ پارەیە، یان وەزعێکی بەسەرداهاتووەو نەخۆشی نەفسی هەیە کە بەداخەوە ئەمرۆ لە چارەسەری نەخۆشی نەفسی دا زۆرکەس تێدا بە هەڵەچووە!، هەموو ئەو براو خوشکانەی کە نەخۆشی نەفسییان هەیە بیرکردنەوەو خەیاڵ و غەم و دڵتووندی و ئەوانە..، هەمووی عیلاجەکەی لە قورئانی پیرۆزدا هەیە!، چ بەوە کە گوێی لێ بگرێ وە چ بەوەی کە جێبەجێی بکات، عیلاجەکەی هەرئەوەیەو بەس چونکە خوا فەرمووی: ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاء وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾ (٨٢) الإسراء، ئەو قورئانە شیفایە، خوا ڕاست ئەکات ئێمە ڕاست ناکەین ئەگەر بڵێین شیفامان لە قورئاندا نییە!، خوا فەرمووی شیفا لەقورئاندا هەیە، خوا چاك دەزانێ!، خوا فەرمووی: ﴿وَاللّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ (٦٦) آل عمران، واتە: خوا دەزانێ و ئێوە نایزانن!، جا خۆشەویستەکانم بەڕاستی وەختێك ئینسان سەرکەوتووە کە سەربازی خوا بێ، خوا ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ الْغَالِبُونَ﴾ (١٧٣) الصافات، واتە: بەڕاستی سەربازەکانی ئێمە سەرکەوتوون، ئینسانیش ئەگەر لەگەڵ خوای خۆیدا ساغ بوو لەهەموو شتێك گرنگترە!، ئەگەرلەگەڵ خوای خۆیدابێ خوا وادەکات لەگەڵ خەڵکیش چاك بێ!، بەلاّم ئەگەر لەگەڵ هەموو خەڵکیی دا چاك بێ لەگەڵ خوادا چاك نەبێ هیچ نییە!، پیاو ئەو پیاوەیە خوا بە پیاوی چاکی بزانێ نەك من و تۆ بە پیاوی چاکی بزانین!، پیاو ئەوپیاوەیە کە خوای گەورە لە ڕیزی پیاوچاکانی دابنێ و ڕێزی لێبنێ نەك ئێمە ڕێزی لێبنێین!، زۆر کەس هەیە لە دونیا ڕێزی لێ دەنرێ و لە قیامەتیشدا بێ ڕێزە!، خوا ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يُهِنِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن مُّكْرِمٍ﴾ (١٨) الحج ، واتە: کەسێك خوا بێڕێزی بکات و ڕێزی لێ نەنێ هیچ کەسێك ناتوانێ ڕێزی لێ بنێ و هەر بێ ڕێزە!، ﴿وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُوراً فَمَا لَهُ مِن نُّورٍ﴾ (٤٠) النور، واتە: هەرکەسێ خوا نوور و ڕووناکیی نەداتێ، نوری

دەستناكەویٚ!، بوٚیە حەیفە بوٚ گەنجەكانمان ئارەزووی نەفسیان زاڵ بكەن بەسەر خواپەرستی دا!، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿الكَيِّسُ مَن دانَ نَفسَهُ وَ عَمِلَ لِمَا بَعدَ المَوت﴾ واتە: عاقڵ ئەوكەسەیە لە دونیایێ خوٚی بە كەم بزانێ و سەركوٚنەی خوٚی بكاو كاربكا بوٚ دوای مردن!، نەك كاربكات بوٚ دونیاو ئاگای لە مردنێ نەبیٚ!، ڕابیعەی عەدەوی ڕەحمەتی خوای لێبیٚ دوعای كردو لەخوا پاڕایەوە فەرمووی: (إذا صَحَّ مِنكَ الوَدُّ فالكُلُّ هَيِّنٌ، وكُلَّ الذي فَوقَ التُّرابِ تُرابٌ)[53]

ئەوە ئیمانە!!، ئافرەتێكی گەنج، شووی نەكردووە لەبەر خواپەرستی، فەرمووی: یاڕەببی ئەگەر ئەتوٚ لێم ڕازی بی ئەوی تر هەمووی ئاسانە، تەنها ئەتوٚ خوٚشەویستیت لەگەڵ من هەبیٚ ئەویتر هەمووی ئاسانە!، ئەتوٚ لوتفت هەبیٚ ئەویتر هەمووی ئاسانە، وە ئەوەی لەسەر خوٚڵە و لەدونیایە ئەمڕوٚ هەمووی دەمریٚ و ڕوٚژیٚ لە ڕوٚژان دەبێتەوە خوٚڵ!، ئەوە ئیمان و عەقیدەو مەبدەئە!، ئەوە تێگەیشتنە لەئیسلام!، كەسێك پێی وانەبیٚ سبەی دەبێتەوەخوٚڵ بە هەڵە حاڵی بووە لە ژیانی خوٚی!، ئێمە دەبیٚ بزانین بەیانی دەبینەوە خوٚڵ!، ئەمڕوٚ كەبەلای گوٚڕستان تێئەپەڕین وائەزانین بەناو بەرداندا ئەڕوٚین!، نازانین ڕوٚژیٚ لە ڕوٚژان ئێمەش بوٚلای ئەوگوٚڕستانە دێین! دەمانخەنە سەر دارەمەیتێك و بوٚ ئەو گوٚڕستانەمان دێنن، بەجێمان دێڵن بەتەنهایی!، ئەومردنە بوٚ هەمووانە خوٚشەویستەكانم، جا دەبیٚ گەنجەكانمان براو خوشكەكانمان بەڕاستی ئاگایان لەخوٚیان بیٚ شەیتان فێڵیان لیٚ نەكات، هاوڕێی خراپ فێڵیان لیٚ نەكات و بە گوێی پێغەمبەر بكەن ﷺ كە پێیان دەفەرمویٚ: (لاتُصاحِب إلاّ مُؤمِناً)[54] تەنها هاوڕێیەتی ئیماندار بكە!، بەگوێی پێغەمبەرﷺ بكەن كە فەرمووی:

---

[53] يتيمة الدهر: الروميات من غرر أبي فراس، جزء ١: صفحة ٩٥، فيه: ...ولقد أحسن أبو الفراس في هذا المعنى.. في قوله: إذا صح منك الود..الخ. وأيضا: ديوان عبدالغني النابلسي، رقم ١٢

[54] صحيح ابن حبان. باب: الصحبة والمجالسة، رقم الحديث ٥٥٤

(المَرءُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ)[٥٥] ئینسان لەسەر دینی هاوڕێیەکەیەتی!، واتە ئەگەر هاوڕێیەتی کەسێکی کرد لەگەڵ وی حەشر دەکرێ لە ڕۆژی قیامەت!، بۆیە دەبێ وشیارو ئاگاداربین لەخۆمان وردبینەوەو خۆمان بناسین، دونیاش بناسین و ئاگامان لەقیامەتی خۆمان بێ.

لەخوای گەورە داواکارم دەڵێم: یارەبی خوایە هیدایەتی گەنجەکانمان بدەی، یارەبی خوایە دین و ئیسلامەتییمان سەلامەت بکەی، یارەبی خوایە خۆشەویستی خۆت و پێغەمبەرەکەت و دینەکەت لە دڵماندا بچەسپێنی، یارەبی خوایە هیدایەتی گەنجە سەرلێشێواوەکانمان بدەی، خوایە هیدایەتی گەنجەکانمان بدەی، خوایە ئیسلامەتییان لەدڵدا خۆشەویست بکەی، یارەبی خوایە تەوفیقی پیرەکانیشمان بکەی، یارەبی خوایە دوعای چاکی پیرەکانیشمان قەبوڵ بکەی، خوایە عیبادەتی گەنجێتی پیرەکانیشمان قەبوڵ بکەی، یارەبی خوایە شیفای نەخۆشیەکانمان بهێنی، خوایە لە مردووەکانیشمان خۆشبی، خوایە حاڵی مسوڵمانان لە هەموو دونیا خۆش بکەی و چاك بکەی، خوایە میللەتەکەمان لە هەموو دەردو بەلایەك بپارێزی، ولات و شارو ئاوەدانی یەکانمان بە نووری ئیمان و ئیسلام و بە ئاشتی و بە برایەتی ئاوەدان کەیەوە یا رب العالمین.

ئامین

أقول قولي هذا وأستغفرالله لي ولكم ولسائر المسلمين، فاستغفِرُوهُ إنَّه كان غَفَّارا

أعوذ بالله من الشيطان الرجيم

{رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ} آمين.

---

[٥٥] المستدرك على الصحيحين، كتاب البر والصلة، رقم الحديث ٧٣١٩

# شاردنەوەی عیلم تاوانە

## بسم الله الرحمن الرحیم

إنَّ الحمد لله نحمده ونشكره ونستغفره ونستهديه، ونعوذ بالله مِن شرور أنفُسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضِلَّ له ومن يضلل فلا هادي له، ونشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له ونشهد أنَّ سيدنا ونبينا محمداً عبده ورسوله، هذا الرسول الذي بلغ الرسالة وأد الأمانة ونصح الأمة وجاهد في الله حق جهاده وتركنا على الحجة البيضاء، ليلها كنهارها، لايزيغ عنها إلا هالك صلواة اللهِ وسلامه عليه وعلى أله وأصحابه الى يوم الدين...، أما بعد يا عبادالله أوصيكم ونفسي أولاً بتقوى الله وطاعته، فإنّ الله مع الذين اتقو والذين هم محسنون، قال الله سبحانه وتعالى في كتابه الحكيم، بسم الله الرحمن الرحيم: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ (١) النساء.

ئیماندارانی بەڕێز، ئەی ئوممەتی محمد المصطفى ﷺ، لەڕۆژی هەینی پیرۆزدا لەخوای گەورە دەپاڕێینەوە، دەڵێین یارەببی خوایە قەڵەمی عەفو بەسەر گوناهەکانمان دابێنی، یارەببی خوایە لە گوناهەکانمان خۆشبی، یارەببی خوایە شیفای نەخۆشیەکانمان بێنی، یارەببی خوایە عاقیبەتی کردەوەکانمان خێر بکەی، لەسەر ئیمان و ئیسلام بمانژیێنی، وە لەسەر ئیمان و ئیسلام بمانمرێنی، وە لەسەر ئیمان و ئیسلام زیندوومان بکەیتەوە، لەگەڵ محمد المصطفى ﷺ حەشرمان بکەی و لەبەهەشتدا کۆمان بکەیەوە.

ئیمانداران: خواناسین و خواپەرستی فەرزە لەسەر هەموو نادەمیزادەکان، ئەو فەریزەتەش جێبەجێ ناکرێ بەبێ زانینی زانست و عیلم، بۆیە

پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ، (طَلَبُ العِلمِ فريضةٌ على كُلِّ مُسلِمٍ ومُسلِمة)[٥٦] واتە: فێربونی عیلم واجبە لەسەر هەموو مسوڵمانێك، چ پیاو بێت چ ئافرەت، چونکە ئینسان ئەگەر زانیـاری نـەبێ بەرامبـەر بـە ئیـسلام، زانیـاری نـەبێ بەرامبەر بەخوای پەروەردگار (جل جلاله)، بەرامبەر بـە پێغەمبەرەکـەی ﷺ، بەرامبەر بەو ئیسلامەی کە ناردویەتی بۆ ئادەمیزادەکان ناتوانێ خواپەرستی بکات!، نازانێ خواپەرستی بکات، لەشتێك شارەزا نەبێ ناتوانێ پیادەی بکـاو بەڕێوەی بەرێ، بۆیە فێربونی عیلم واجبە.

جا لەڕاستیدا فێربونی عیلم نەك هەر بۆخۆت بەڵکو بۆ دەورویەریشت واجبە فێری ببی و بیگەیەنی، بۆیە لەوتاری ئەمڕۆی هەینیدا باسی بابەتێك دەکەین، لە بابەتە گرنگەکانی ئیسلام، باسی گوناهێك دەکەین لە گوناهـەکانی گـەورە کە مسوڵمانان بەتایبەت ئەهلی عیلم پێی تووشی سـزای سەختی دونیاو دواڕۆژ دەبن کـە بـریتی یـە لـە شـاردنەوەی عـیلم، کـە دەڵـێین شـاردنەوەی عـیلم، مەبەستمان هەر مامۆسـتایانی ئـایینی نییـە!، بـەڵکو مەبەسـتمان هـەموو مسوڵمانانە، زانایان ئەوەندەی زانستیان هەیە دەربارەی ئیـسلام، مـسوڵمانان ئەوەندەی کەفێری بوون لەوتارەکانی هەینی، لە کۆڕو مناسبات، لەمناسەباتی تەعزیە، لەشوێنە گشتیەکاندا، لەشوێنە تایبەتیەکاندا، لای مامۆستایان، یـان بەهۆی ئەو خوێندەواریەی کەهەیانەو خۆیان بە دیراسەکردنی کتێبەکان وەریـان گرتووە، واجبی سەرشانیانە هەرچی فێری بوون بیگەیەنن بەخەڵکی.

عیلم دەرەجاتی هەیە بۆیە خوای پەروەردگار (جل جلاله) دەفەرموێ: ﴿وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ﴾ (٧٦) یوسف، واتە: لەسەرووی هەموو خاوەن عیلمێکـەوە زاناتر هەیە، لەسەروی هەموو زانایـەك، زانایـەکی پایـە بـەرزتر هەیـە، هـەر ئینسانێك بەقەدەر خۆی زانیاری هەیە بەرامبـەر بـە ئیـسلام، هەیـە زانیـاری

---

[٥٦] سنن ابن ماجة، باب: فضل العلماء والحث على طلب العلم، رقم الحديث ٢٢٤

بەرامبەر بەئیسلام هەیە وەکو بابەتێکی گشتی، هەمەلایەنـە، مامۆسـتایەکە یان زانایەکە فەتوای لێ وەردەگیرێ، کۆششکار(مجتهد)ە لە هەمـوو بابەتـەکانی ئیسلام شارەزایە، هەشیانە تەنها لە مەزهەبێك شـارەزایە، هەیانـە تـەنها لـە بابەتێك شارەزایە، هەیانە تەنها لە مەسەلەیەك شـارەزایە، هەیانـە تـەنها لـە مەسەلەی بچوك شارەزایە، ئەوە ئینسانەکان ئاوا خوای پەروەردگار(جل جلالـە) عیلمی پێداون بەقەدەر تێکۆشانی خۆیان، بۆ فێربونی عیلم، خوای گەورە (جـل جلالە) فێری کردون، ﴿وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ﴾.

بەڵێ خۆشەویستەکان، دیارە ئێمەی مسوڵمان دەبـێ چـاوەڕێی عـاقیبـەتی کردەوەکانی خۆمان بکەین لە قیامەتدا، ئەگەر چاکەمان کرد چاکەمان دێتەوە ڕێ، وە ئەگەر گوناهمان کردبێ سزاو تۆڵـەی گوناهـەکانمان لێ دەسـتێنرێتەوە، یەکێك لەو گوناهانەی کە ئێمە لێی بێئاگاین بریتی یە لە شـاردنەوەی عـیلم، جا چ مامۆستایانی ئایینی بن، وە چ مسوڵمانێك تەنها خاوەنی خێزان و مـاڵ و منداڵی خۆی بێ، چ باوکێـك بەرامبـەر منداڵـەکانی، چ پیاوێـك بەرامبـەر بەخێزانی، چ خێزانێك بەرامبـەر بەمنداڵـەکانی یـان بەرامبـەر بەمێردەکـەی کەزانیاریـەکی سـەبارەت بەئیسـلام هەیـەو نایگەیـەنێ، عیلمێـك دەزانـێ، سـەبارەت بەئیسلام، بابەتێك یان مەسەلەیەك شـارەزایەو نایگەیـەنێ، دەبێـت چاوەڕێی سزای دواڕۆژ بکات ئەگەر بە ئەنقەسـت ئـەو عیلمـەی شـاردبێتەوەو نەیگەیەنێ!.

خۆشەویستەکانم: پێغەمبەرمان ﷺ کاتێك لەناو صەحابەکان کۆدەبویەوەو دادەنیشت، دوای ئەوەی کە وتاری بۆ دەدان لەکۆتاییـدا دەیفـەرموو: (فَلْيُبلِّـغ الـشَّاهِد الغائِـب)[٥٧] واتـە: ئەوانـەی کـە ئامـادەن، ئـەو زانیاریـەی کـەلێرە وەریانگرت با بەو کەسانە بڵێن کەلێرە نین، تەنها بەمامۆستایانی نـەدەگوت!،

[٥٧] صحيح البخاري، كتاب الحج، باب: الخطبة أيام المُنى، رقم الحديث ١٦٥

تـەنها بـە ئـەهلی عیلمـی نـەدەگوت!، بەهـەموانی دەفـەرموو!، هـەموو ئامادەبوان، ئەوەی کە لێرەیە با بەو کەسانە ڕابگەیەنێ کە لێرە نین، هەر کەس کە دەگەڕێتەوە ناو ماڵ و منداڵی خۆی، هەر کەس کە دەگەڕێتەوە ناو قـەوم و عەشیرەت و هۆزو تیرەی خۆی دەبێ ئەوەی کە فێری بوە بیگەیەنێ، شاهید کە ئامادەیە با بە غائیب ڕابگەیەنێ، یان دەیفەرمو: (بَلِّغُوا عَنِّي وَلَو آية)[58] واتە: لەمنەوە بە خەڵکی ڕابگەیەنن ئەگەر ئایەتێکیش بێ، با وتەیەکیش بێـت کـە لەمنەوە وەری دەگرێ و فێـری دەبێـت بـا ڕایگەیـەنێ، نـەڵێ مـن هـیچ فێـر نەبووم!، نەڵێ من زانا نیم!، بەڵکو هەر شتێك بزانێ و خەڵك پێویستی پێی بێ و بیشارێتەوە بەر هەڕەشەی خوا دەکەوێ و گوناهبارە.

بەڵێ خۆشەویستەکانم، ئەبو هورەیرە صەحابەیەکی بەڕێزی پێغەمبـەرﷺ بوو، دەیفەرموو: (لَولا آيَتَينِ ماحَدَّثتُ حَديثاً)[59] واتـە: ئەگـەر دوو ئایـەت لـە قورئانـدا نەبوونایـە هـیچ قـسەم نـەدەکرد بـۆ مـسوڵمانان، ئـەو ئیـسلامەم ڕانەدەگەیاند، لەترسی ئەو دوو ئایەتە ئەوەندە ماندووم و ئەوەندە سوورم لەسەر وەرگرتنی فەرمودەکانی پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام)، وە لەبەر کردنیان و گەیاندنیان بەخەڵك، چونکە هیچ کەسێك بەقەدەر ئەبو هورەیرە فەرمودەی لـە پێغەمبەرەوە (عليه الصلاة والسلام) ڕیوایـەت نـەکردووە!، کـە لەپێغەمبـەر (عليه الصلاة والسلام) وەریگرتبێ بەبێ ئەوەی بینوسێتەوە، ئەو ترسـە تـەنها بۆ ئەبو هورەیرە نییە، ئەو ترسەو ئەو هەڕەشەیەی لەو دوو ئایەتەدا هاتووە بۆ ئێمەشە، بابزانین ئـەو دوو ئایەتانـە چـین؟، وە چ هەڕەشـەیەکیان تێدایـە؟، چ مەترسی گەورەیان تێدایە بۆ دونیاو قیامەت؟، گوێ بگرن یـەك لـەو ئایەتانـە خوای پەروەردگار (جـل جلالـە) لەسـورەتی (البقـرة)دا ئەفـەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ

[58] صحيح البخاري، كتاب الأنبياء، باب: ما ذكر عن بني إسرائيل، رقم الحديث ٣٢٤٧

[59] صحيح البخاري، كتاب العلم، باب: حفظ العلم، رقم الحديث ١١٨

يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى مِن بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ أُولَئِكَ يَلعَنُهُمُ اللّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ، إِلاَّ الَّذِينَ تَابُواْ وَأَصْلَحُواْ وَبَيَّنُواْ فَأُوْلَئِكَ أَتُوبُ عَلَيْهِمْ وَأَنَا التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾ (١٥٩-١٦٠) البقرة، واتە: بەدڵنیایی ئەوانەی ئەو زانین و زانیاریەی کە ئێمە ناردومانەتە خوارەوە لەقورئانی پیرۆز دوای ئەوەی کە ڕونمانکردۆتەوە لە کتێبەکانی پێش قورئان کە (ئینجیل و تەورات) ن، دەیشارنەوەو بەخەڵکی ناگەیەنن لەدوای ئەوەی ئێمە بۆ خەڵکیمان ڕونکردۆتەوە لە کتێبەکانداو ئەوانەی کەلێی ئاگادارن دەیشارنەوەو بەخەڵکی ڕاناگەیەنن: ﴿أُولَئِكَ يَلعَنُهُمُ اللّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ﴾ ئا ئەوانە خوای پەروەردگار (جل جلاله) لەعنەتیان لێدەکات!، ﴿وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ﴾: وە لەعنەتکارانیش لەعنەتیان لێدەکەن (چ مەلائیکەتەکانی خوابن چ ئیمانداران بن)، بێجگە لەخوا (جل جلاله) مەلائیکەتەکان و مسوڵمانانیش نەفرین و لەعنەتیان لێدەکەن لەوانەی کە عیلم دەشارنەوەو هەقیقەتێك کە خوای پەروەردگار(جل جلاله) لە قورئان و کتێبەکانی ناردویەتیە خوارەوە دەیشارنەوەو بەخەڵکی ڕاناگەیەنن، ﴿يَلعَنُهُمُ اللّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ﴾ کە ئەوە هەڕەشەیەکی زۆر گەورەیە!، لەعنەت واتای چی یە؟!، لەعنەت واتا دەرکردن لەژێر ڕەحمەتی خوا!، خوا دەریان دەکات لەژێر ڕەحمەتی خۆی، خوا(جل جلاله) لێرەدا باسی ئەوە ناکات ئەگەر عیبادەتیان کردبێت دەیانبورێت، خوای گەورە (جل جلاله) هەڕەشە بەوە دەکات کەسانێك ئەو عیلمە بشارنەوە کە خوا ناردویەتی موستەهەقی لەعنەت و نەفرینی (رب العالمین) و وە ئەوانەشن کە لە ئینسانەکان و لە مەلائیکەتەکان لەعنەتیان لێدەکەن، تەنها کەسانێك نەبێ خوا (جل جلاله) فەرموی: ﴿إِلاَّ الَّذِينَ تَابُواْ﴾ مەگەر ئەو کەسانە کە تەوبە دەکەن و دەگەڕێنەوەو پەشیمان دەبنەوە، ﴿وَأَصْلَحُواْ﴾: کردەوەی باش دەکەن و هەڵدەستن بە چارەسەری کاروباری مسوڵمانان، ﴿وَبَيَّنُواْ﴾: وە ئەو عیلمەشیان کەپێیە ئاشکرای بکەن، بەیانی ئەو عیلمە بکەن کەفێری بوون و هەتا ئێستا

شاردویانەتەوە، پێویستە ڕایگەیەنن ئەگەر دەیانەوێ لە لەعنەتی خوای پەروەردگار (جل جلالە) پارێزراو بن، لە لەعنەتی ئیمانداران و مەلائیکەتەکان پارێزراو بن، با تەوبە بکەن، چاکەکار بن، عیلمی خۆیان ڕابگەیەنن ئەوەی کە شاردویانەتەوە لەخەڵك، ﴿فَأُوْلَئِكَ أَتُوبُ عَلَيْهِمْ﴾: ئا ئەوانە تەوبەیان لێ قەبوڵ دەکەم، ﴿وَأَنَا التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾: وە بێگومان مـن تەوبـە لـە بەنـدەکان قـەبوڵ دەکەم و خاوەنی بەزەییم، ئەوە ئایەتی یەکەم.

ئایەتی دووەم -کە ئەبو هورەیرە فەرمووی زۆری لێ ئەترسم- ئەوەیە هـەر لە سورەتی (البقرة) دا دوای ئەوە خوای پـەروەردگار (جـل جلالـە) دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلَ اللَّهُ مِنَ الْكِتَابِ﴾ (١٧٤) البقـرة، ئەوانـەی کـە دەشارنەوە ئەو عیلمەی خوا ناردویەتیە خوارەوە لە کتێبی خۆیـدا، ﴿وَيَشْتَرُونَ بِهِ ثَمَنًا قَلِيلاً﴾ (١٧٤) البقرة: ماڵی دونیای پێ وەردەگرن بەهۆی شاردنەوەی عیلم، دونیای پێ دەخۆن و لەترسی ماڵی دونیا دەری نابڕن، لەترسی سـەروەت و سامانێك کە لەدەستیان بچێ دەری نابڕن یان لەترسی دوژمنانێك دەری نابڕن کە لێیان ئەترسن، پارەیەکی کەمی پێ وەردەگـرن بـەهۆی ئـەوەوە هەقیقـەتی خوایی ناڵێن و جێبەجێی ناکەن، ﴿أُولَئِكَ مَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ إِلاَّ النَّارَ﴾ (١٧٤) البقرة، واتە: ئەوانە تەنها ئاگر دەخۆن لەڕۆژی قیامەت، ئەوانە ئـاگر لەناو زگیان دەبێ لەڕۆژی قیامەت، ئامادەیە لەپێناوی وەدەستهێنانی دونیـا، لەپێناوی لۆمە نەکردن، لەپێناوی لەدەستنەچونی مەسڵەحەتی دونیا، لەپێناوی لەدەستنەچونی مەسڵەحەتی خۆی و ماڵ و خزم و کەس و کـاری و سـەروەت و سـامانی و حیزبەکـەی ئـەو عیلمـەی کـەخوا ناردویـەتی بیـشارێتەوە، خـوا ئەفەرموێ تەنها ئاگر لەناو زگیان دا دەبێت لەڕۆژی قیامەت لە جەهەننەمدا، ئینسانێك کە بۆخۆی بچێتە نـاو جەهەننـەم، ئـاگر دەچـێتە نـاو زگـی، ئـاگر دەچێتە ناو ڕیخۆڵەکانی، ئاگر دەچێتە ناو هەناوەکانی!، ﴿مَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ إِلاَّ النَّارَ﴾: ئاگر نەبێ نایخۆن، ﴿وَلاَ يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ (١٧٤) البقـرة،

واتە: خوا قسەیان لەگەڵ ناکات لەڕۆژی قیامەت، ﴿وَلاَ يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ (١٧٤) البقرة، واتە: تەزکیەشیان ناکات، پاکیان ناکاتەوە لەگوناهان، لێیان خۆش نابێت، مەدحیان ناکات بەچاکە و سەرزەنشتکراون، ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ واتە: وە سزایەکی بەئێشیان هەیە!.

بەڕێزان، خوای گەورە لەو ئایەتەدا شاردنەوەی عیلم دەهێنێتە ڕیزی خواردنی ماڵی هەتیو، ماڵی هەتیو کە ئێمە زۆر جاران خۆی لێ دەپارێزین، لەبەرئەوەی گوناهی گەورەیە، خوای گەورە (جل جلاله) دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا﴾ (١٠) النساء، واتە: ئەوانەی کە ماڵی هەتیو دەخۆن بەبێ هەق، ئەوانە ئاگر دەخۆن لەڕۆژی قیامەت، وە دەخرێنە ناو کڵپەی ئاگرەوە، ئەوانەش کەعیلم دەشارنەوە بەهەمان شێوە ئاگر دێتە ناو زگیان و لەڕۆژی قیامەت هەناوەکانیان دەسوتێنێ و دەکوڵێنێ.

بەڕێزان: جا شاردنەوەی عیلم تاوانێکە چ مامۆستایەکی ئایینی هەقیقەتێکی لەلایە بیشارێتەوە، یان هەرکەسێکی دیکە زانیارییەکی لەلابێ و لە خەڵکی بشارێتەوە لەکاتێکدا کە خەڵك پێویستییان پێیەتی.

خوای گەورە (جل جلاله) دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَجْمَعُ اللّهُ الرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَا أُجِبْتُمْ قَالُواْ لاَ عِلْمَ لَنَا إِنَّكَ أَنتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ﴾ (١٠٩) المائدة، واتە: خوای گەورە (جل جلاله) ڕۆژی قیامەت هەموو پێغەمبەران ڕیز دەکات، کۆیان دەکاتەوەو لێیان دەپرسێ: ئەرێ چۆن وەڵامتان درایەوە؟، تەماشاکەن زۆر جێگای سەرنجە!، یەکەم پرسیار لەپێغەمبەران (علیهم الصلوات والسلام) دەکرێت، یەکەم پرسیار لە مامۆستایان دەکرێت، یەکەم پرسیار لەپێشەواو لە ئیمامەکان دەکرێت، ئەرێ چۆن خەڵك وەڵامی ئێوەی دایەوە؟ سەرەتا پرسیار لەخەڵکەکە ناکرێت چۆن وەڵامی پێغەمبەرانتان دایەوە (علیهم الصلاة والسلام)؟، بەڵکو پرسیار لەپێغەمبەران دەکرێت (علیهم الصلوات والسلام)،

خوای گەورە (جل جلاله) دەفەرموێ، چۆن وەڵامتان درایەوە؟، ﴿قَالُواْ لاَ عِلْمَ لَنَا﴾: دەڵێن پەروەردگارمان زانیاریمان نییە، ﴿إِنَّكَ أَنتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ﴾: هەرئەتۆی بەهەموو نهێنییەکان زانای و دەزانی چۆن وەڵامان درایەوە، ئەوەی جێگای سەرنج بێت ئەوەیە خۆشەویستەکانم سەرەتا پرسیار لە ئەهلی عیلم دەکرێت، لەپێشەوا(قائد) و سەرکردەکان دەکرێت، ئەرێ چۆن ئومەتەکەتان چۆن کۆمەڵەکەتان چۆن خەڵکەکەتان کەلەژێر دەستتان دابووە وەڵامیان دانەوە؟! کەوابو دەبێ بزانێ ئەوە مەسئولیەتێکی قورسە لەسەری.

بەڵێ خوای پەروەردگار (جل جلاله) بەپێغەمبەرمان (عليه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ وَاللّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ إِنَّ اللّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ﴾ (٦٧) المائدة، واتە: ئەی پێغەمبەری خوا (عليه الصلاة والسلام) ئەوەی کەخوا بۆی ناردوی رایگەیەنە، ئەگەر راینەگەیەنی واتا تەبلیغی ریسالەی خوات نەکردوە، ﴿وَاللّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ﴾ واتە: خوا دەتپارێزێ لەخەڵك، کەواتە کە کەئیماندار بێ و ئیمانی بەخوا هەبێت، کەخوا خاوەنی دەسەلاتە، خوا سودگەیێن(النافع) و زیان گەیێن(الضار)ە، خوا لێگرەوە(المانع) وپێدەر(المعطي)یە، خودا مرێنەر(المميت)و ژیێنەر(المحيي)ە نابێ بترسێ و ئەو ترسە وای لێبکات شتێك پێویستبێ بگوترێ بەلام بیشارێتەوە!، ئەی{گیان} بەدەست خوا نیە؟، مردن بەدەست خوا نیە؟!، کاتێکی تایبەتی بۆ دیاری نەکراوە؟، ئەجەل بەدەست خوا نیە؟، لەشوێنی تایبەت، لەکاتی تایبەت؟، بەشتێکی تایبەت؟، هیچ شتێك لەدەست ئینسانەکە نییە لەمردن و لەکاتی ئەجەلدا ئەی بۆ دەترسی؟، بۆئەو هەقیقەتەی کەلاتە نایلێی؟، بۆ دەیشاریەوە؟، ئاگری رۆژی قیامەت توشی خۆت دەکەی، سزای سەختی دوارۆژ بۆخۆت دەهێنیە پێش، خوای گەورە (جل جلاله) دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَالَاتِ اللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا اللَّهَ﴾ (٣٩) الأحزاب، واتە: ئەوانەی کە تەبلیغی ریسالەی خوا دەکەن، ئەوانەی کەپەیامی خوا رادەگەیەنن و لەکەس

ناترسن تەنها لەخوا نەبێت، ﴿وَكَفَى بِاللَّهِ حَسِيبًا﴾ واتە: بەسە خوای گەورە چاودێر بێ بۆ ئینسانەكان، ﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا﴾ (٣) الطلاق، واتە: هەركەسێك پشت بەخوا ببەستێ خوا بەسیەتی!، زۆر مامۆستا هەیە -رێزم بۆ مامۆستایانی نابینی- كاتێك كە لەناو مەجلیسێك دادەنیشێ، عوزر بۆخۆی بەوە دێنێتەوە یان بیانوو بۆخۆی دروست دەكات دەڵێ: كاكە وەڵاهی كەڵكی نەماوە ئامۆژگاری خەڵك بكەین. چ قسەیان بۆ بكەی چ قسەیان بۆ نەكەی هەروەكو یەكە، ئەو خەڵكە تازە بەكەڵك نایەت، ناگەڕێتەوە سەر دینی خوا، زەمانەكە زۆر خراپ بووە، فەسادو بێ ئەخلاقی زۆر بڵاوبۆتەوە، خەڵك زۆر ڕووی لە بێ دینی كردوە بەڕاستی بەكەڵك نایەت ئامۆژگاریان بكەی!، بەڵام بەڕاستی ئەوە عوزرێكی بێ شەرعی یە كە بۆخۆی دێنێتەوە!، خوای پەروەردگار (جل جلالە) ئەمر بە چاكەو ڕێگری لەخراپەی ڕانەگرتوە لەسەر ئەوەی خەڵك وەڵام دەداتەوە یان نایداتەوە، پێغەمبەری وادێت لە ڕۆژی قیامەت ئوممەتەكەی دوو كەسن!، هی وا هەیە دێت ئوممەتەكەی یەك كەسە!، هی وا هەیە دێت كەسی لەگەڵدا نییە!!، ئەرێ دەبێ ئەو پێغەمبەرە خۆی ماندوو نەكردبێ؟!، وازی لە تەبلیغاتی دینی خوا هێنابێ؟، ئایا كەخەڵك بەقسەی نەكردوو مانای وایە ئەو پێغەمبەرە وەزیفەی خۆی بەجێ نەهێناوە؟!، دیارە هەموو مامۆستایان ئەو یاسایە دەزانن: (الأمْرُ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّهيَ عَنِ الْمُنكَرِ لا يستَلزِمانِ الإجابةَ): فەرمان بەچاكەو ڕێگرتن لەخراپە، ئەوە نییە كە خەڵك وەڵامت ئەداتەوەو بیكەی یان ئەگەر نەیداتەوە نەیكەی، واجبی سەرشانی هەموو كەسێكە كە ئەهلی عیلمە، وە هەموو كەسێك كە شارەزاییەكی لەئیسلام هەیە، دینی خوا ڕابگەیەنێ.

بەڵێ بەڕێزان: موعاذی كوڕی جبل(خوا لێی ڕازی بێت) لەترسی ئەوەی كە عیلمی خوای پەروەردگار (جل جلالە) عیلمی ئیسلام نەشارێتەوە، یەك

فـەرمودەی پێغەمبـەری لـەلا بـوو (علیـه الـصلاة والـسلام)، کـە پێغەمبـەر فەرموبووی: جاری مەیلێ! لەسەرە مەرگدا ڕایگەیاند، لەترسی ئەوەی کەخوای گەورە موحاسەبەی نەکات، یەك فەرمودە!!، پێغەمبەری خوا ڕۆژێکیان سواری حوشترێك بوبوو موعاذیشی لەدوای خۆی سوار کردبوو، بە معاذی فـەرموو[٦٠]: (ما مِن أحدٍ يَشهدُ أن لا اله الا الله وأن محمد رسـولُ الله صِدقاً مِـن قَلبـه إلاَّ حَرَّمَهُ الله عَلى النَّار)، فەرموی: هەر کەسێك بەدڵێکی پاکەوە بڵێ (لا الـه الا الله و محمد رسولُ الله) ئەوە خوای گەورە(جل جلاله) بە ئاگر نایسوتێنێ.

دیارە زانایان لە شەرحی ئەو فەرمودەیەدا بەمانای کارکردن بـە (لا الـه الا الله و محمد رسولُ الله) یان لێکداوەتەوە، دەڵێ (معاذ) فەرمووی: (یارسـولَ الله أفَلا أخبِرُ بِهِ النَّاسَ فَيَستَبشِرُوا) ئەرێ نەچم هەواڵ بدەمە خـەڵکی بـۆ ئـەوەی دڵخۆش بن و خۆشحاڵ بن؟، پێغەمبەر فەرموی: (اذاً يتَّكِلـوا): نـەخێر نەچـی هەواڵیان پێ مەدە، چونکە ئەو کاتە پشت بـەو فەرموودەیـە دەبەسـتن و خـۆ ماندوو ناکەن، ئەفەرموێ: (وأخبَرَ بِها مَعاذُ عِندَ موتِهِ تأثُّماً) لەسەرە مەرگدا مەعاذی کوڕی جەبەل ئەو فەرمودەیەی ڕاگەیاند لەترسـی گونـاە، (تأثما): بـۆ ئەوەی گوناهبار نەبێت، ئەو صەحابە بەڕێزە کە یەك فەرموودەی نەشاردۆتەوە، ئەی دەبێت حاڵی ئەو کەسانە چۆن بێت کەدینی خوا ڕاناگەیەنن؟!، حاڵی ئـەو زاناو شارەزایانە چۆن بێت کەدینی خوا ڕاناگەیەنن؟، جـا مـن چ لـە عیلمێـك بکەم کە هەموو کتێبەکانی لـەدەوری خـۆی کـۆ کردۆتـەوە ئەگـەر تەماشـای کتێبخانەکەی دەکەی هیچی کەم نییە، بەڵام هەمووی لـەناو سـینگی خۆیـدا سجن کردووەو نایڵێ، وەکو کانیاوێك کەئاوێکی زوڵاڵی لەژێردایەو نە ئینـسان و نە حەیوان سودی لێ وەرناگرێ، ئەو ئاوە هەتا ئێواری سـازگاربێ و صـاف و بێگەرد بێت، بەڵام من چ لە ئاوێك بکەم کە خەڵك ئیـستیفادەی لێناکات.

---

[٦٠] صحيح البخاري. كتاب العلم، باب: من خصَّ بالعلم قوما دون قوم، رقم الحديث ١٢٨

بۆیە بەڕاستی عیلم کاتێك کە ڕاناگەیەندرێ، تەنها عەزاب بۆ خاوەنەکەی زیاد دەکات، بۆیە پێویستە ئەوانەی کە خاوەنی عیلمن نە لەترسی دونیا نە لەترسی ڕزق، عیلمی خۆیان نەشارنەوەو خۆیان توشی خەجالەتی دوارۆژ نەکەن، پێغەمبەریش (علیه الصلاة والسلام) بەئێمە دەفەرموێ: (لَتَأمُرُنَّ بِالمَعروفِ ولَتَنهَوُنَّ عَنِ المُنكَرِ أو لَيوشِكَنَّ اللهُ يَبعَثَ عَلَيكُم عِقاباً ثُم تَدعُونَهُ فَلا يُستجابَ لَكُم)[٦١]، واتە: ئەگەر ئێوە فەرمان بەچاکە نەکەن و ڕێ لەخراپە نەگرن، نزیکە خوای گەورە سزایەکتان بۆ بنێرێ پاشان زۆر دوعا بکەن و لەخوا بپاڕێنەوە دوعاتان قەبوڵ نەکرێ و عیقاب و سزایەکەتان لەدونیا لەسەر لانەچێ!، بەداخەوە زۆرن ئەوانەی کە ئەمڕۆ دەڵێن دەست بەکڵاوی خۆتەوە بگرەو با نەیبات!، ئاگرە سوورە لەخۆم دوورە!، بەڕاستی ئەگەر فیتنە کەوتە ناو مسوڵمانان، گوناه کەوتە ناو مسوڵمانان، ئەوەی تەنیشتی نەهی لێ نەکات، خۆشی بەئاگری ئەوەوە دەسوتێ، بۆیە خوای گەورە (جل جلاله) دەفەرموێ: ﴿وَاتَّقُواْ فِتْنَةً لاَّ تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ (٢٥) الأنفال، واتە: خۆتان لە بەلاو موسیبەتێك بپارێزن کە بەتەنها توشی زاڵمەکان نایەت، بۆ ئێوەش دێت، کەئێوە لە تەنیشت زاڵمەکانن و پێیان ناڵێن زوڵمە دەیکەن.

خۆشەویستەکانم: شاردنەوەی عیلم لەهیچ شتێکدا دروست نیە، کاتێك کەپرسیارت لێ دەکرێت، نابێ ئەو عیلمەی هەتە بۆئەو پرسیارە بیشاریەوە، جا ئەگەر زانای بەهەموو بابەتەکە یان بەشتێك زانای یان بەبەشێك لە بابەتەکە، بۆ نموونە: پرسیارت لێ دەکرێت سەبارەت بە دزییەك کەکراوە لەو گەڕەکەدا،

[٦١] المغني عن حمل الأسفار، باب: الأول، في وجوب الأمر بالمعروف، رقم التخريج ٢٢٣٥: ٣٠٤٢ من حديث عمر بن الخطاب والطبراني في الأوسط من حديث أبي هريرة و كلاهما ضعيف وللترمذي حديث حذيفة نحوه إلا....، قال هذا حديث حسن.

ئەگـەر زانیاریـت لەسـەری هـەبێت و نـەیلێی گوناهبـار دەبیـت، شـاهێدییە کەدەیشاریەوە، ئەگەر پرسـیارت لێ بکرێـت سـەبارەت بـە دووکـەس زاڵـم و مەزڵوم کامیان زاڵم بوو کە بەشەڕ هاتن؟، کامیان مەزڵوم بـوو؟، لـەبازاڕ تـۆ بکەن بەشاهێدو بەناوبژیوان، کابرای زاڵم بـەزاڵم نـەزانی و مـەزڵوم بەمـەزڵوم نەزانی هەقیقەتەکە نـەڵێی و بیـشاریەوە، ئـەوە شـاهێدییەکەت شـاردۆتەوەو لەڕۆژی قیامەتدا پێی موحاسەبە دەکرێی، یان تەماشای هەق و ناهەق بکـەی، ناهەقت بەهەق لەقەڵەمـداو بەپێـچەوانەشەوە، بەڕاسـتی ئـەوە شـاهێدییەکی بەدرۆیەو ڕۆژی قیامەت لەسەری موحاسەبە دەکرێی، پێغەمبەر (علیه الـصلاة والسلام) دەفەرموێ: (مَنْ سُئِلَ عَن عِلمٍ فَكَتَمَهُ أَلجَمَهُ اللهُ بِلُجامٍ مِـن نـارٍ يَـوم القيامَة)[٦٢] واتە: هەرکەسێك پرسیارێکی لێ بکرێ سـەبارەت بـە مەسـەلەیەك یان بابەتێك بیشارێتەوەو نەیڵێ، هەقیقەتێکی لەلایە کەپرسیاری لێ دەکـرێ و نەیڵێ، ئەوە خوای گەورە بـە لـەغاوێکی ئـاگرین لـەڕۆژی قیامـەت لـەغاوی دەکات لەجەهەننەم، ئەو پرسیارە تەنها بۆ مامۆستایانی ئایینی نییـە، سـەیر نییـە کـە ئـەمڕۆ زۆر کـەس پرسـیاری لێ دەکرێـت سـەبارەت بـە بابـەتێك دەیشارێتەوەو هەقیقەتەکـە نـاڵێ جـا لەترسـی خۆیـەتی یـان لەترسـی هـەر مەسەلەحەتێکی خۆیەتی، نایڵێ!! بەلاّم بیر لەو فەرموودەیە ناکاتەوە (مَنْ سُئل عـن عِلـمٍ فَكَتَمَـه) کەسـێك پرسـیاری لێکـرا سـەبارەت بەمەسـەلەیەك و دەیشارێتەوە، (أَلجَمَهُ اللهُ بِلُجامٍ مِن نارٍ يَوم القيامَـة) واتە: خوا لەغاوی دەکات لەجەهەننەمدا بە لەغاوێکی ئاگرین.

خۆشەویستەکانم: شاهێدی قەت مەشێرنەوە، خـوای پـەروەردگار(جـل جلالـه) دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَادَةً عِنـدَهُ مِـنَ اللَّـهِ وَمَـا اللَّـهُ بِغَافِـلٍ عَمَّـا تَعْمَلُونَ﴾ (١٤٠) البقرة، واتە: کێ لەو کەسـە زاڵـم تـرە کەشـاهێدییەکی لایـەو

---

[٦٢] المستدرك على الصحيحين، كتاب العلم، رقم الحديث ٣٤٤

نایلێ و دەیشارێتەوە؟!، کێ لەو کەسە زاڵم ترە؟!، شاهێدیەکت لەلایە سەبارەت بە کەسێك، سەبارەت بە مەسەلەیەك، سەبارەت بە بابەتێك، بەهیچ شێوەیەك مەیشارەوە بیلێ و ڕایگەیەنە، لە لۆمەی لۆمەکاران مەترسێ!، وە لەعەیب و عاری خەڵك مەترسێ عەیبدارت بکەن، لەبەرخاتری خوا شاهێدیەکەت بلێ، خوای پەروەردگار (جل جلاله) دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَكْتُمُواْ الشَّهَادَةَ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ وَاللّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾ (٢٨٣) البقرة، واتە: شاهێدی مەشارنەوە، هەرکەسێك شاهێدی بشارێتەوە ئەوە خۆی گوناهبار کردووە.

**خۆشەویستەکانم:** لەباسی قەرزدا، خوای پەروەردگار (جل جلاله) دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى فَاكْتُبُوهُ وَلْيَكْتُب بَّيْنَكُمْ كَاتِبٌ بِالْعَدْلِ وَلاَ يَأْبَ كَاتِبٌ أَنْ يَكْتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ اللّهُ فَلْيَكْتُبْ وَلْيُمْلِلِ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ وَلْيَتَّقِ اللّهَ رَبَّهُ وَلاَ يَبْخَسْ مِنْهُ شَيْئًا فَإن كَانَ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ سَفِيهًا أَوْ ضَعِيفًا أَوْ لاَ يَسْتَطِيعُ أَن يُمِلَّ هُوَ فَلْيُمْلِلْ وَلِيُّهُ بِالْعَدْلِ وَاسْتَشْهِدُواْ شَهِيدَيْنِ من رِّجَالِكُمْ ....﴾ (٢٨٢) البقرة، واتە: ئەی ئیماندارینە ئەگەر قەرزتان دا بە یەکێك بۆ کاتێکی دیاریکراو با کاتبێك بینوسێ، ﴿وَلْيَكْتُب بَّيْنَكُمْ كَاتِبٌ بِالْعَدْلِ﴾ واتە: با کاتبێك بەعەدالەت لەنێوانتاندا بینوسێ، لەڕۆژی ئەوەندەی ئەوەندە، فلانە کەس ئەوەندە پارەیەی ئەوەندە ماڵەی بەقەرز دا بە فلانە کەس بۆ ئەوەندە ساڵە یان بۆ ئەوەندە ڕۆژە یان ئەوەندە مانگە، ﴿وَلاَ يَأْبَ كَاتِبٌ أَنْ يَكْتُبَ﴾ واتە: نابێ کاتب ڕێگر بێت لەنوسین، دەبێت بینوسێت، ﴿وَلْيَتَّقِ اللّهَ رَبَّهُ وَلاَ يَبْخَسْ مِنْهُ شَيْئًا﴾ واتە: دەبێت پارێز لەخوا بکات و بترسێ، وەکو خۆی بینوسێ هیچی لێ کەم نەکاتەوە، چۆنی پێدەڵێن ئاوا دەبێت بینوسێ، شاردنەوەی هیچ شتێك دروست نییە، دەزانن زۆربەی گیروگرفتەکان کە لەنێوان قەرزارو خاوەن قەرزدوە دروست دەبێت لەزەمەنی ئەمڕۆدا ئەوەیە کە نوسینیان لەنێواندا نییە؟!، کەسێك لەسەر بنەمای متمانە بەکەسێك قەرزێکی ئەداتێ بەبێ ئەوەی شاهیدێکی بۆ دابنێ، بەبێ ئەوەی کەسێك بینوسێتەوە، بۆیەش دوایی هەردووکیان توشی کێشە دەبن، یان لەسەر

ئەندازەی پارەکە توشی کێشە دەبن یان لەسەر ئەندازەی کاتەکە توشی کێشە دەبن یان هەر مانع دەبێ دەڵێ قەرزی نەداومێ و ڕاست نییە، بەڵام خوای پەروەردگار (جل جلاله) دەفەرموێ ﴿فَاكْتُبُوهُ﴾ واتە: بینوسن، وە بەئیمانداران دەفەرموێ، کەوابو پێویستە ئیمانداران لەو مەسەلەیەشدا ئاگادارین شت نەشارنەوە، ئەو کاتبە لەنێوانیاندا بینوسێ وەك پێویست شتیان لێ نەشارێتەوە.

لە مەسەلەی وەسیەتدا.. وەکو تەئکید، وەکو شتێکی گرنگ بە کابرای خاوەن وەسیەت و سەروەسیەتەکە خوای پەروەردگار (جل جلاله) ئەفەرموێ: ﴿فَمَن بَدَّلَهُ بَعْدَمَا سَمِعَهُ فَإِنَّمَا إِثْمُهُ عَلَى الَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُ إِنَّ اللّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ (١٨١) البقرة، واتە: کاتێك کەسێك تۆ دەکاتە سەروەسیەت، وەسیەت دەکات بۆ خەڵکێك بەتۆش دەڵێ کاکە تۆ سەر وەسیەت بە، بەهیچ شێوەیەك بۆت نییە ئەو وەسیەتە دەستکاری بکەی، تەنها مەگەر بێ شەرعیی بێت، کە بێ شەرعیش بوو ئەوە ئەو کاتە لەحزوری خۆیدا لەحاڵی حەیاتیدا پێی دەڵێی ئەوە بگۆڕە، ئەگەرنا خوای پەروەردگار (جل جلاله) ئەفەرموێ: ﴿فَمَن بَدَّلَهُ﴾ واتە: هەر کەسێك ئەو وەسیەتە بگۆڕێ، ﴿فَإِنَّمَا إِثْمُهُ عَلَى الَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُ﴾ واتە: گوناهەکەی لەسەر ئەو کەسانەیە کە دەیگۆڕن، نابێ بیشاریەوە، کەسێك ئەتۆ دەکات بەئەمینی وەسیەت، بەخاوەن ئەمانەتێك دەبێ وەکو خۆی ڕایگەیەنی و نەیشاریەوە.

سەباردەت بەنێوان ژن و مێرد، خوای پەروەردگار (جل جلاله) بە ئافرەت — خێزان- ئەفەرموێ: ﴿وَلاَ يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ اللّهُ فِي أَرْحَامِهِنَّ إِن كُنَّ يُؤْمِنَّ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَلِكَ إِنْ أَرَادُواْ إِصْلاَحًا وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكُيمٌ﴾ (٢٢٨) البقرة، واتە: حەڵاڵ نییە بۆ ئافرەتان کە تەڵاق دەدرێن ئەوەی کە لە ڕەحمیاندایە بیشارنەوە، وە مێردەکانیان شایستەترن بە گێڕانەوەیان لە عیددە دا ئەگەر ئاشتی و چاکەیان بوێ.

بۆیە وەكو پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) دوای وتارەكە فەرموی: (فَلْيُبلِّغ الشَّاهِد الغائِبْ) واتە: ئەوانەی كە ئامادەن، ئەو عیلمەی كەلێرە وەریانگرت با بەو كەسانە بڵێن كەلێرە نین، جا چ پیاو بن چ ئافرەت، بەڕاستی باوكی بەڕێز بەرپرسی لەمنداڵەكانت!، بەڕاستی بەرپرسی بەرامبەر بە خێزانەكەت!، برای بەڕێزم بەرپرسی بەرامبەر ماڵ و منداڵت!، ئەو شتەی كە فێری دەبی لەهەینی دا دەبێ بگەڕێیەوە پێی ڕابگەیەنی لەماڵەوە، نەو ئافرەتە چ دەزانێ ئەگەر تۆ شتێكی بۆ نەگێڕیەوە؟!، یان مەگەر لەڕادیۆو تەلەفزیۆن گوێی لێ ببێ، ئەگەرنا كوا ئەمڕۆ كۆڕێك بۆ ئافرەتان وەك زەمانی پێغەمبەرﷺ ئافرەتانی تێدا كۆ ببنەوەو پێغەمبەرﷺ ڕۆژێك بۆ ئافرەتان تەرخان بكات و قسەیان بۆ بكات، بەرپرسیاریەتی سەرشانی تۆیە برای بەڕێز، ئایا چەند جار جەنابت كە گەڕایتەوە ماڵەوە خێزانەكەی خۆت بانگ كردووە بڵێی خێزانەكەم وەرە ئەوەم گوێ لێ بوە لەمامۆستا با بۆت باس بكەم؟، چەند جار گەڕایەوە بانگت كردو پرسیارت لێكرد سەبارەت بە بابەتێك و پێی بڵێی وەرە بابزانم دەزانی یان نازانی یان چۆنی لێ حاڵی بوویت؟، چەند جار كە گەڕایەوە لە وتاری هەینی بۆ باوك و دایكی خۆت كە چاوەڕێت دەكەن لەماڵەوەو پەككەوتەن، شتێكت گێڕاوەتەوە؟، چەند جار منداڵەكانت بانگ كردوەو لەدەوری خۆت كۆكردونەتەوە لەماڵێ ئەوەی كە فێری بویت لەڕۆژی هەینی ڕایگەیەنی بە منداڵەكانت كە پەیوەندی بەوانەوە هەیە؟، ئەوە بەرپرسیاریەتی یە لەسەر شانی تۆ، بەرپرسیاریەتی یە كە تۆ دێیە جومعە كە واجبە لەسەر پیاوان و واجب نییە لەسەر ئافرەتان بۆ ئەوەیە تۆ كە گەڕایەوە ئەوەی كە دەیزانی پێیان ڕابگەیەنی، جا شاردنەوەی عیلم تەنها بۆ مامۆستایان نییە، هەموو خەڵكێكی مسوڵمان تاوانبارە لەوەی كە دەیزانێ لە كاروباری دین بەخێزانەكەی ڕانەگەیەنێ بە منداڵەكانی ڕانەگەیەنێ، بەخوشك و براكانی ڕانەگەیەنێ، بەدایك و باوكی ڕانەگەیەنێ، بەپیرو پەككەوتەكانی

ڕانەگەیەنێ، واجبی سەر شانتانە ئەگەرنا لەبابەتێکدا برایان باوکان دایکان خێزانەکان منداڵەکان هەڵە بکەن، تۆ فێرت نەکردبن، کەمتەرخەمیت تێدا کردبێ، تۆ تاوانباری دونیاو قیامەت دەبی!، با لەخوا بترسین، ئەو دینە ئەمانەتە بەسەر شانمانەوە بەڵکو خوای گەورە ڕەحمان پێبکات بۆ خۆمان با پیادەی بکەین بەپێی توانامان لەوەی کەدەیزانین لەبەر خاتری خوا، وە بەخەڵکیشی ڕابگەیەنین.

یارەببی خوایە زیاتر حاڵیمان بکەی لەدین، یارەببی خوایە حاڵیمان بکەی لەو ئیسلامە پاکەی کە خۆت ناردوتە، حاڵیمان بکەی لە سوننەتەکانی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)، خوایە لەسەر بنەمای ئیسلام و ئیمان بمانژیێنی و بمانمرێنی، خوایە شیفای نەخۆشیەکانمان بدەی، خوایە ڕەحم بە مردوەکانمان بکەی، خوایە هیدایەتی گەنجەکانمان بدەی، خوایە ئەو گەنجانەمان کە سەر لێ شێواون هیدایەتیان بدەی، یارەببی خوایە شیفای نەخۆشیەکانمان بۆ بێنی، خوایە میللەتەکەمان لەبەڵاو نارەحەتی و دەردەسەری بپارێزی، خوایە وڵاتەکەمان لە ئافات و بەڵاو موسیبەت بپارێزی، یارەببی خوایە عاقیبەتی عومرمان خێر بکەی، خوایە لەگوناهەکانی ڕابردومان خۆش بی، خوایە دەرگای خێرو ڕەحمەتمان لێ بکەیەوە، أمین.

أقول قولي هذا وأستغفر الله لي ولكم ولسائر المسلمين، فاستغفِروهُ إنَّه كان غَفَّاراً ،

أعوذ بالله من الشيطان الرجيم

{رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ} أمين.

# بەرپرسیاریەتی و چەند ڕێنموونیەك بۆ خوشكان

## بسم الله الرحمن الرحيم

إنَّ الحمد لله نحمده ونشكره ونستعفره ونستهديه، ونعوذ بالله مِن شرور أنفُسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضِلَّ له ومن يضلل فلا هادي له ، ونشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له ونشهد أنَّ سيدنا ونبينا محمداً عبده ورسوله، هذا الرسول الذي بلغ الرسالة وأدى الأمانة ونصح الأمة وجاهد في الله حق جهاده وتركنا على الحجة البيضاء، ليلها كنهارها، لايزيغ عنها إلا هالك صلواة الله وسلامه عليه وعلى أله وأصحابه، ومن تبعهم بإحسان الى يوم الدين ...، أما بعد يا عبادالله أوصيكم ونفسي أولاً بتقوى الله وطاعته، فإنّ اللهَ مع الذين اتقوا والذين هم محسنون، قال الله سبحانه وتعالى في كتابه الحكيم، بسم الله الرحمن الرحيم: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ (١) النساء.

ئیماندارانی بەڕێز، ئەی شوێنكەوتوانی پێغەمبەری ئەكرەم ﷺ، ئەی عاشقانی نوری خوداو عاشقانی دیداری پێغەمبەر ﷺ، سەلامی خوای پەروەردگارتان لێبێت، میهرەبانی خوا، برژێ بەسەر ئێوەو هەموو موسڵمانانی دونیا لەم ڕۆژە پیرۆزەدا.

ئیمانداران ... ئەو ئیسلامەی كەخوای گەورە ناردویەتی، بەرپرسیارێتی یە لەسەر شانی مرۆڤەكان، بەرپرسیارێتی یە بەگشتی، ئەمانەتێكە بەسەر شانی ئینسانەكانەوەیە، ئەمانەتیش بەڕاستی ڕاسپاردەیەكی بەنرخ و پڕ لە بەرپرسیاریەتیە، ئەگەر تەنها بەراورد بكەین لە ئەمانەتی ئینسانەكان، كە یەكێك ئەمانەتێكت لەلا دادەنێ، دوایی كاتێك دێت لێت وەردەگرێتەوە ئەگەر

کەموکورتیت تێدا ئـەنجام دابێـت، لێـت قـەبوڵ ناکـات و گلـەیی و گازانـدەت لێدەکات، دەبێت وەکو پێویست کە لەشوێنی تایبەتیت دانـاوە، وەکـو پێویـست بیدەیەوە، بۆت دەردەکەوێ کە ئەمانەتی خوای پەروەردگاریش (جل جلالە)، کـە ئیسلامەو لـەلای تـۆی دانـاوە، وە بۆتـۆی نـاردوە، بەرپرسـیارێتیەکەی زۆر زۆر قورسترە لەو ئەمانەتەی کەئینسانێك لای تۆی دادەنێ، خوای گەورە (جل جلالە) لەو ئیسلامە دەپێچێتەوە، لە پێغەمبەرﷺ دەپرسـێ سـەبارەت بەئوممەتەکـەی، سەبارەت بەو ئیسلام و قورئانەی کەبۆی نـاردوە، ئـەو دینـە ئەمانەتـە، بەسـەر هەموو ئینسانێکدا، بەرپرسیارێتی هەیە، یەکێك لەو بەرپرسیارێتی یە دەدرێتـە دایـك و بـاوك، بـاوك و دایـك لەبەرامبـەر منداڵەکانیانـدا بەرپرسـیاریەتێکی گەورەیان لەسەر شانە!، ئەمانەتێکی گەورەیان لەسەر شانە!، جا جـاری وا هەیـە باوك و دایك ئەمانەتەکـەیان جێبـەجێ دەکـەن، هـەر لـە سـەرەتای منـداڵێتی منداڵەکانیانـەوەگرنگی پێئـەدەن، لەتەمـەنی گـەورەیی دا لەبـەر دەسـتی منداڵەکانیان ئیسراحەت دەکەن، جاری واش هەیە گرنگی بەمنداڵەکانیان نادەن، ئەو دایك و باوکە دەردەسەری و سەرئێشە لەبەر دەستی منداڵەکانیانـدا دەبینـن کاتێـك کـە گـەورە دەبـن، خـوای پـەروەردگار (جـل جلالـە) سـەبارەت بـە بەرپرسیاریەتی دایك و بـاوك دەفـەرموێ: ﴿يَـا أَيُّهَـا الَّـذِينَ آمَنُـوا قُـوا أَنفُـسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَـا يَعْـصُونَ اللَّـهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ (٦) التحـريم، واتە: ئەی ئیماندارینە، خۆتـان و ماڵ و منداڵتان لەئاگر بپارێزن، ئەو ئاگرەی کە سوتەمەنیەکەی بـەردو خەڵکـە!، ئادەمیزادەکانن!، ﴿وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾، خوای گەورە (جل جلالە) سـەرەتا داوای خۆپاراستن لەئیماندارەکان دەکات بۆ خۆیان: (قُوا أَنفُسَكُمْ) نەفـسی خۆتـان بپارێزن لەئاگر، پاشان کێ؟ (وَأَهْلِيكُمْ) وە ماڵ ومنداڵیشتان!، ئەوانەی کە لـەژێر دەستی ئینسان دان، ئەوانەی کە لەژێر دەسـەڵاتی سـەرپەرشـتیەتی ئینـسان دان، ئەوانە ئەهلی ئینسانن، وە زۆرجار خزم و کەسیش هەر دەکەوێتە ژێـر عیبـارەتی

ئەو ئەهلە، خۆتان و خێزان و ماڵ و منداڵتان بپارێزن لەچی؟ (نَارًا) لەناگر، ناگرێك: ﴿وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾، سوتەمەنیەکەی چیە؟ (النَّاسُ): خەڵك، بەهۆی خەڵکەوە بڵێسەی ئاگرەکە زیاد دەبێت، ئاگرێك نیە بەدارو درەخت کرابێتەوە، بەنەوت بسوتێ، بەڵکو سوتەمەنیەکەی چیە؟ (النَّاسُ): خەڵکە بۆخۆی دەسوتێ و گڕوتین وبڵێسەی زیاد دەکات و دەبێتە سوتێنەری خەڵکەکەی تر، (وَالْحِجَارَةُ): بەرد، بەرد سوتێنەری ئینسانەکانە لەدۆزەخ، سوتەمەنیەو سوتێنەرە، بۆخۆی دەسوتێ و دەشسوتێنێ، جا ئاگرێك بێت لەبەرد بێت دەبێت ئەو ئاگرە چەندە بەتین بێت؟!، ﴿عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ﴾ واتە: لەسەر دۆزەخ، مەلائیکەتە دەرگاوانەکانی دۆزەخ ڕاوەستاون، ئەو مەلائیکەتانە (غِلَاظٌ شِدَادٌ): مەلائیکەتی ڕق و توندو تیژن، مەلائیکەتی وا کە کاتێك کە داوای ڕەحمیان لێدەکرێ ڕەحم بە دۆزەخیەکان ناکەن، وەختێ هاواریان بۆ دەکرێ ڕەحمیان پێناکەن!، چونکە فەرمانی خوا جێبەجێ دەکەن، ﴿لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ﴾ واتە: بێ فەرمانی خوا ناکەن، خوا چیان پێ بفەرموێ ناوا لەگەڵ دۆزەخیەکان دەجوڵێنەوە: ﴿وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾.

جا بەرپرسیاریەتی باوك و دایك قورسە!، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ، (الرَّجلُ راعٍ وهو مسؤلٌ عنْ رعيَتِهِ) واتە: پیاو چاودێرەو بەرپرسیاریشە لێی، ئەو خەڵکەی کە لەبەر دەستی دایە: منداڵەکانیەتی، خێزانیەتی، باوك و دایکیەتی..، کە لەماڵەوە سەرپەرشتیان دەکات بەرپرسیارە لێیان، بەرپرسیارە نەك هەر لەوەی کەخواردنیان بداتێ و جلوبەرگیان بۆ بکات، بەرپرسیارە لەدین و ئەخلاق و ئەدەب و ڕەوشتیان!!، (والمرأةُ راعيةٌ في بيتِ زوجِها وهي مَسؤلةٌ عن رَعيتِها) واتە: ئافرەتیش چاودێرە لەماڵی مێردەکەیدا، وە بەرپرسیارە لەوەی لەژێر دەستی دایە، ڕۆژی قیامەت باوك و دایك موحاسەبە دەکرێن سەبارەت بەمنداڵەکانیان، باوك سەردارو سەرۆکی ماڵە، دایکیش پەروەردەکەرو قوتابخانەیە لەماڵ، چۆن منداڵ پەروەردە بکات ئەو منداڵە ئاوای لێدەردەچێت!.

بەڵێ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ لەسەرەتادا بەدایك و باوك دەفەرموێ: (مُروا أولادكُم بِالصَّلاةِ لِسَبعٍ)[٦٣] واتە: فەرمان بەمنداڵەكانتان بكەن بەنوێژ كردن لەتەمەنی حەوت ساڵیی دا، بۆئەوەی ئەو منداڵە كاتێك كە گەورەبوو لێت نەبێتە بەلا و سەرت نەهێشێنێ، تەشقەڵەو كێشەت بۆ دروست نەكات، سەرگەردانت نەكات، لەدوایدا كە خەم و خەفەتی لەسەر بخۆی و چارەت پێنەكرێت، (مروا أولادكُم): فەرمان بەمنداڵەكانتان بكەن (كوڕبن یان كچ بن) بەنوێژ كردن لەتەمەنی حەوت ساڵیدا، ئەو دایك و باوكانەی كەئێستا لەبەر دەستی منداڵەكانیان نارەحەتن، كە بەقسەیان ناكەن، ئەنجامەكەی ئەوەیە كاتی خۆی بەمنداڵی گرنگییان پێنەداون!، كە دەفەرموێ لەتەمەنی حەوت ساڵیی نوێژیان پێ بكەن لەبەرئەوەیەكە نوێژ كۆڵەكەی دینە!، مانای وا نییە هەر فەرمانی پێدەكەن بەنوێژ، نەء، مانای وایە بەگرنگترین شت دەست پێدەكات كەنوێژە، ئینجا بە فەرزەكانی تر، بە خووڕەوشتی ئیسلامەتی، وردە وردە باوك و دایك لەگەڵ خۆی ڕادێنن، لەتەمەنی حەوت ساڵیەوە كە منداڵ (مُمیز) دەبێت، چاكەو خراپە لێك جیا دەكاتەوە، پاك و پیس لێك جیا دەكاتەوەو عەقڵ و شعوری بۆ پەیدا دەبێت، هەست بە داهاتوی خۆی دەكات، لەو كاتەوە دەبێت ڕێ نیشاندەری بۆ بكرێت لەلایەن باوك و دایكیەوە، بۆیەش دەفەرموێ: لە دە ساڵیشدا لێی بدەن، واتە لێی قەبوڵ نەكەن ئەگەر بەقسەی نەكردن، هەتا دە ساڵی ئەگەر لێشی نەدەن هەر ئامۆژگاری بكەن، بەڵام لە دە ساڵیدا دەبێت لێی بدەن، (وفَرِّقُوا بَينَهُما فِي المَضاجِع) واتە: جێیان لێك جیا بكەنەوە، كوڕو كچ با بەیەكەوە لەیەك ژووردا نەخەون، بەتایبەت لە دە ساڵ بەرەوژوور.

---

[٦٣] ((حدثنا مؤمل بن هشام يعني اليشكري ثنا إسماعيل عن سوار أبي حمزة قال أبو داود وهو سوار بن داود أبو حمزة المزني الصيرفي عن عمرو بن شعيب عن أبيه عن جده قال قال رسول الله صلى الله عليه وسلم مروا أولادكم بالصلاة وهم أبناء سبع سنين واضربوهم عليها وهم أبناء عشر وفرقوا بينهم في المضاجع))، سنن أبي داود. كتاب الصلاة، باب: متى يؤمر الغلام بالصلاة، رقم الحديث ٤٩٥.

خۆشەویستەکانم، زۆرجار باوك و دایك لەئەنجامی ئەوەی کە زۆر بەغەم - دڵی- منداڵەکانیانەوەن و دڵیان ناشکێنن توشی سەرگەردانی و ناخۆشی و نارەحەتی دەبن لە داهاتودا، هەرچی منداڵەکان بیانەوێ بۆیان جێبەجێ دەکەن: لەجلوبەرگدا، لەسەفەردا، لە خواردەمەنیدا، لەخانوبەرەدا، لەهەر شتێك کەمنداڵەکان حەزیان لێبێت دایك و باوك بۆیان جێبەجێ دەکەن، ناڵەوە زەرەری لێدەکەن لە دوارۆژدا، دایك و باوك دەبێت تەرازوو(میزان)ێك و هاوسەنگی یەك ڕەچاو بکەن نە زۆر بەقسەی منداڵەکان بکەن، وە نە هەر بەقسەیان نەکەن و (عطف و حنان) یان بۆیان نەبێت.

بۆیە کاتێك کە باوکێك سەرپەرشتی منداڵەکانی خۆی ناکات یان برسیان دەکات یان بارودۆخیان باش بەرێوە نابات گوناهبار دەبێت، وەکو پێغەمبەرﷺ فەرموی، (کَفَى بِالْمَرءِ إثْمًا ان يُضَيِّع مَن يَقوت)[٦٤] واتە: بەسە بۆ پیاو ئەو گوناهە کاتێك کە خەڵکێك سەرپەرشتی ماڵ و منداڵی خۆی دەکاو(قوت)[٦٥] یان نادات، برسییان دەکات، جاری وا هەیە ماڵ و منداڵ لە ئەنجامی برسییێتی دا توشی تاوان و گوناه دەبێت، جاری واش هەیە، لە ئەنجامی تێریی کە هەموو شتێکیان بەقسە دەکرێت توشی تاوان و گوناه دەبن، بۆیە دەبێ باوك و دایك هاوسەنگیەك ڕەچاو بکەن بۆ پەروەردە کردن و ڕاگرتنی منداڵەکانیان.

جا ئەگەر باوك و دایك بەغەم منداڵەکانیانەوە نەبن، لەدوارۆژدا بۆیان دەبنە بەلاَو سەرگەردانی، دوایی ئەو باوکە یان ئەو دایکە بەهۆی منداڵەکانیەوە توشی ئاگری دۆزەخ دەبێت، کە خوای گەورە (جل جلاله) پێی فەرموون: ﴿قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا﴾، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (ثلاثٌ لايَدخلونَ الجنَّة)[٦٦] واتە: سێ کەس ناچنە بەهەشت، یەکەم: (العاقُّ الوالِدَيهِ) ئەو کەسەی

---

[٦٤] المستدرك على الصحيحين، كتاب الزكاة، رقم الحديث ١٥١٥

[٦٥] قوت: ئەو برە خۆراکەیە کە ئینسان پێی تێردەبێ ودەژیێ.

[٦٦] مسند أحمد بن حنبل، مسند عبدالله بن مسعود، رقم الحديث ٦١٨٠

کە ئازاری دایك و باوکی خۆی بدات، ناچێتە بەهەشت با نوێژیش بکات و با ڕۆژووش بگرێت، با مسوڵمانیش بێت بەلاّم مادام ئازاری دایك و باوکی خۆی دەدات بەناهەق ئەوا فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەرە ﷺ کە ناچێتە بەهەشت، وە دووەمیان: (والدیُّوث) ئەو پیاوەی کە گوناه لەماڵەکەیان دەکرێ، ئافرەتەکەی یان کچەکەی یان خوشکەکەی خراپە دەکات لەماڵەوە، زینا دەکات یان لەگەڵ پیاوان بێ شەرعی ئەنجام دەدات بەهەر جۆرێك بێت، وە ئەو پیاوە چاوپۆشی لێدەکات هەوڵی چارەسەری بۆ نادات، کەمتەرخەمە لەبەرامبەر چارەسەری ئەو کێشەیەی کە لەماڵی خۆیدا هەیە، جا ئەگەر خێزانیەتی، ئەگەر کچیەتی، ئەگەر خوشکیەتی، ئەگەر دایکیەتی، خراپە لەماڵی خۆیاندا هەبێت، مەنعی نەکات و چاوپۆشی لێبکات، ئەوە پێی دەگوترێ (دیُّوث) کە ناچێتە بەهەشت، وە سێیەمیان فەرمووی: (ورَجِلَةُ النِّساء) ئەو ئافرەتەی خۆی بەپیاوان دەچوێنێ، جا لەجلوبەرگ دا بێت یان لەقسە کردندا بێت یاخود لە ڕەفتارو هەڵسوکەوتی ڕۆژانەی دابێت، ئافرەت ئافرەتەو پیاویش پیاوە!، لەعنەت لەو پیاوانە کراوە کەخۆیان دەشوبهێنن بە ئافرەتان وە لەعنەت لەو ئافرەتانەش کراوە کە خۆیان دەشوبهێنن بەپیاوان، بۆیە دەبێت ئەو سێ مەسەلەیە بەجددی باوك و دایکان لێی ئاگادار بن، بۆخۆشیان و بۆ ماڵ و منداڵەکانیشیان، جا من لەژێر تیشك و ڕۆشنایی ئەو بەرپرسیاریەتە قورسەدا کە لەسەر شانی باوك و دایکانە چەند ڕێنمونیەك پێشکەش بەخوشکان و دایکان دەکەم لەجیاتی باوك و دایکان، بۆ ئەوەی ان‌شاءاللە ڕێنوێنی بکەن، قسەکانم لەچەند خاڵێکدا کورت دەکەمەوە تایبەت بەخوشکان، بەلاّم وەنەبێ پیاوانیش تێیدا بەشدار نەبن، بەگشتی بۆ پیاوان وە تایبەتیش بۆ ئافرەتان، چونکە بەڕاستی هەم پیاوان پێویستیان بەکۆڕو کۆبونەوە هەیە شەوانە پیاوان پێکەوە دادەنیشن، لەسەر کەسابەت پێکەوە یەکتر دەبینن، لەکاتی نانخواردن پێکەوە نان دەخۆن، لەکاتی پشودا پێکەوە دادەنیشن، بەلاّم بەهەمان شێوە، ئافرەتانیش مافی ئەوەیان

هەیە کە بەیەکەوە دابنیشن و سەردانی یەکتری بکەن، سەردانی خزمەکان بکەن، لەموناسەباتی پرسەدا یان لەموناسەباتی گشتی دا، لەسەردان و زیارەت و سەفەردا، ئافرەتان بەیەکەوە بۆیان هەیە دابنیشن و کۆ ببنەوە، سەردانی یەکتری بکەن، بەلاّم با بزانین داب و دەستوری کۆبونەوەی ئافرەتان چیە؟،

چەند خاڵێك وەکو ڕێنمونی پێشکەش بە خوشکانی بەڕێزم دەکەم، لەجیاتی باوکان و دایکان، بەو ئومێدەی کە سودی لێببینن:

یەکەم: خوشکان و دایکانی بەڕێز، کە دادەنیشن لەماڵەوە یان لەدەرەوە یان لەهەر جێگایەك پێویستە شەرەف و کەرامەتی خۆیان و کەس و کاریان و مسوڵمانان بپارێزن، ئەو مەجلیسەی کە خوشكێك لەگەڵ خوشكێك کۆدەبێتەوە تێیدا یان کۆمەڵێك ئافرەت تێیدا کۆدەبنەوە لەسەردانێکدا، لەماوەی پشودا بۆقسە کردن بەیەکەوە ئەوەی کە زیاتر لەهەموو شت ڕەچاوی دەکەن پاراستنی شەرەف و کەرامەتە، کەدەڵێین پاراستنی شەرەف و کەرامەت، نیشانەی ئیسلام و ئیمانیی ئەو خوشکانەیە، چونکە شەرەف و کەرامەت نیشانەی سەربەرزی و ڕووسوری و ڕوو سپیەتی دونیاو قیامەتە!، ئەگەر یەکێك حەیای نەبێت، لەناو خەڵکدا شەرمەزارو وخەسارەتمەندە، ریسوایە، لەدونیاشدا حیسابی ڕۆیشتوەو لەقیامەتیشدا حیسابی هەر ڕۆیشتوە بۆیە پێویستە یەکەم شت حەیای خۆی بپارێزی.

حەیاو شەرەف و کەرامەتی چۆن دەپارێزیٚ؟ بەوە کە لەگەڵ پیاوی نامەحرەمدا لەمەجلیسدا کۆنەبێتەوە، لەهەر سەردانێکدا پێویستە ئەوە چاودێری بکات کە لەژورێکدا لەگەڵ پیاوان دانەنیشیٚ، لەشوێنێکدا لەگەڵ پیاوی نامەحرەم ڕانەوەستیٚ، چونکە دەبێتە هۆی گوناه بۆخۆی و بۆ ئەو پیاوەش، شەرەف و کەرامەتیش بەپارە ناکڕیٚ!، کەشەرەفی شکا بەهەموو دونیا بۆی ناگەڕێتەوە!، شەرەفی ئافرەتیش شەرەفی باوکە، شەرەفی برایە، شەرەفی خزم و کەسە، شەرەفی مێردەکەیەتی، بۆیە کەدەڵێین شەرەف و کەرامەتی خۆی بپارێزیٚ زامنی شەرەف و کەرامەتی باوك و براو مێردو کەسوکاریەتی، ئەگەر

ئافرەتێك لەشەرەف و کەرامەتدا سەربڵند بێت باوك و براو مێردەکەی و کەسوکاری هەموو پێی سەربڵندن، ئەگەر ئافرەتێکیش خوانەخواستە لەڕەوشت وئەخلاقدا نزم بێت ئەوا هەموو خزم و کەسوکاری پێی سەرشۆڕن، حەزناکەن باسی بکەن لەهیچ مەجلیسێکدا و خۆیان بەخزم و کەسی نازانن!، بۆیە یەکەم شت دەبێ خۆی لەپیاوانی نامەحرەم بپارێزێ، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (لا يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ إلاَّ مَعَ ذِي مَحْرَمٍ)[67] واتە: با هیچ پیاوێك لەگەڵ هیچ ئافرەتێکدا کۆنەبێتەوە مەگەر مەحرەمێکی خۆیانیان لەگەڵدابێت، بۆیە دەبێت پیاو و ئافرەت لەبەرامبەر یەکدا دانەنیشن و لەگەڵ یەك ڕانەوەستن، چونکە لە ئەنجامی لەگەڵ یەك ڕاوەستان و دانیشتن نەزەر دروست دەبێت، نەزەریش سەرەتای گوناهانە کە ئافرەتەکە زیاتر تێیدا کەمتەرخەم(مُقصر)ە چونکە ئەو هۆکاری نەزەرەکەیە، جاری وا هەیە ئافرەتەکە بۆخۆی نەزەر ناکات بەلاّم پیاوەکە نەزەر دەکات، جاری واش هەیە پیاوەکە بۆخۆی نەزەر ناکات بەلاّم ئافرەتەکە نەزەر دەکات.

پێغەمبەر ﷺ دوو خێزانی خۆی لەلا ڕاوەستابون، (عەبدوڵلاّی کوڕی ئومی مەکتوم) بەوێدا هات کە بانگدەر(مۆذن)ی بوو، کوێر بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: خۆتان داپۆشن!، وتیان ئەی پێغەمبەری خوا خۆ ئەوە عەبدوڵلاّیەو کوێرە!، نە دەمانبینێ و نە دەماناسێ ئێمە لێرە ڕاوەستاوین، فەرموی: (أَفَعَمْيَاوَانِ أَنْتُمَا أَلَسْتُمَا تُبْصِرَانِهِ؟)[68] ئایا ئێوە کوێرن؟، ئەی ئێوە نابیینن؟، ئەوە نەزەرە بۆ ئێوە، لەخێزانەکانی خۆی قەبوڵ نەکرد، کە عەبدوڵلاّ صەحابەیەکەو کوێرە بەلایاندا ڕەت دەبێت، فەرموی دەبێت خۆتان داپۆشن و

---

[67] صحيح البخاري، كتاب النكاح، باب: لايخلون رجل بإمرأة، رقم الحديث ٤٩٣٥

[68] صحيح إبن حبان، جزء ١٢، صفحة ٣٨٧، باب: ذكر الزجر عن أن تنظر المرأة الى الرجُل، رقم الحديث ٥٥٧٥

ئێوە نەزەر نەکەن، کەوابو نەزەر هەر بۆ پیاوان نیـە، بـۆ ئافرەتانیـشە، ئەگـەر بەچاوی نەزەر تەماشای پیاوان بکەن وەکو پیاوان گوناهیان دەگاتێ ئـەوانیش، چونکە خوای گەورە بەیەك شێوە ڕوو لە پیاوان و ئافرەتـان دەکـات بـۆ ئـەوەی کەنەزەر نەکرێت، خوای پەروەردگار (جل جلالە) دەفـەرموێ: ﴿وَقُـل لِّلْمُـؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ﴾ (٣٠) النـور، واتـە: ئـەی محمـد بەئیمانـداران بڵـێ بـا چاویان بگرنەوە لەئاستی ئافرەتی نامـەحرەم، (وَقُـل لِّلْمُؤْمِنَـاتِ يَغْضُـضْنَ مِـنْ أَبْصَارِهِنَّ) (٣١) النـور، واتە: وە بەئافرەتانیش بڵێ بـا چـاویان بگرنـەوە(نـزم بکەن) لەبەرامبەر پیاوی نامەحرەمدا، بۆ هەردوولا هەر نەزەرە.

دووەمیان: دانەنیشتن لەکۆڵان و سەر جـادەو ڕێگـاو بـان، لەڕاسـتیدا ئـەوە ئێستا نەك هەر خووی ئافرەتانە بـەڵکو خـووی پیاوانیـشە!، زۆرێـك لـەپیاوان لەسەر ڕێگا دادەنیشن حیسابی ئەوە ناکەن ئافرەت بەویدا ڕەت دەبێت یان پیاو بەویدا ڕەت دەبێت، خەڵکێك بەویدا ڕەت دەبێت کـەپێی ناخۆشـە لەسـەر ئـەو ڕێگایە گشتی یە دانیشتووی، ئەو ڕێگایە یان ئەو جادەیە مادام تایبـەت نیـە بەماڵەکەی تۆ، هەقی گشتی مسوڵمانانی تێدایە، بۆت نیە لەسەر ئـەو ڕێگـاو بانە دابنیشی با پیاویش بی، بۆت نیە لەسەر ئەو ڕێگاو بان وکـۆڵان و لەسـەر ئەو جادەیە ڕابوەستی، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (إِيَّاكُم والجُلُـوسَ في الطُّرُقَـات)[٦٩] ئاگادارتان دەکەمەوە ئەی صەحابەکان لەسەر ڕێگاو بان دانەنیـشن، (قـالوا یارسول اللە، ما لَنا بُدٌّ من مجالِسِنا نَتَحَدَّثُ فِيهَا) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا چارەمان نیە، لەسەر ڕیگـاو بـان دادەنیـشین چـونکە کەسـابەتمان لەسـەر ئـەو ڕیگایەیەو قسەی تێدا دەکەین، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (فأذا أَبَيتُم الاَّ المجلِسَ فاعطُوا الطريقَ حقَّـهُ) ئەگەر هەر دانیـشتن لەسـەر ڕێگـا هـەقی ڕێگـە بـدەن، گوتیان: (وَمَا حَقُّ الطَّرِيقِ يا رَسولَ اللە؟) هەقی ڕێگە چییە ئـەی پێغەمبـەری

---

[٦٩] صحيح البخاري، كتاب المظالم، باب: أفنية الدور والجلوس فيها، رقم الحديث ٢٣٣٣.

خوا ﷺ؟، فەرمووی: پێـنج شـتە، (غَـضُّ البَـصَرِ، وكَفُّ الأذى، وَرَدِّ الـسَّلامِ، والأمرُ بالَمعروفِ، والنَّهيُ عَنِ الُمنكَر) یەکەم: چاوت نزم بکەی لەبەرامبەر هـەر ئافرەتێکی نامەحرەم کەبەوێدا دێت، ئەوە بێگومان ئەگەر پیاو چاوی خۆی نـزم بکات دەبێت ئافرەتیش چاوی خۆی نزم بکات، بەلاّم دیارە ئەوە کە بـۆ پیـاوان دروست نەبێت لەسەر رێگاو بان و بەر دەرگاو کۆلاّن دابنیشن، بۆ ئافرەتان هەر دروست نیە!، ئەو خیطابە بۆ پیاوانە نەك بۆ ئافرەتان، دووەم: (وكَفُّ الأذى) کە لەوێ ڕاوەستاوە ئەزیەتی نـەبێت بـۆ هـیچ کەسـێك، سـێ یـەم: (وَرَدِّ الـسلامِ) سەلامی هەموو کەسـێك وەلاّم بداتــەوە، کاتێـك کـە یـەکێك دێـت سـەلامی لێدەکات وە یەکێك دێت قسەیەکی خۆشـی لەگـەڵ دەکـات وەلاّمـی بداتــەوە، چوارەم: (والأمـرُ بـالَمعروفِ) فـەرمان بەچـاکە بکـات، پێنجـەم: (والنَّهـيُ عَـنِ الُمنكَر)کاتێك کە خراپەیەکیشی بینی ڕێگری لێبکـاو بیگـۆڕێ بەچـاکە، واتـە فەرمان بەچاکەو ڕێگرتن لەخراپە.

جا ئەگەر ئینسانێك ناچاربوو و ئیشی لەسەر ئەو ڕێگایە بـوو دەبێـت ئـەو پێنج هەقە بدات ئەنجا دەتوانێ لەسەر ئەو ڕێگایە ڕابوەستێ و کارەکـەی خـۆی جێبەجێ بکات، جا ئەگەر ئەوە بۆ پیاوان دروست نەبێت بەڕاستی بۆ خوشکانی بەڕێز قەدەغەیە و حەرامە کە لەسەر ڕێگاوبان یان لەسـەر جادە یان لەبەر دەرگا دابنیشن، لەبەیانیەوە هەتا ئێوارە، باسی ئەم و ئەو یان باسی ئەم جیران و ئـەو جیران یان کێشەی فلاّن و کێشەی فیسار، خەڵکیش بەوێدا دێت دەبێت لەجیاتی ئەوەی ئافرەتان سەری خۆیان شۆڕ بکەن، خەڵکەکەی تر کە بەوێدا دێت سـەری خۆی ئەوی بکاو بەوێدا تێبپەڕێ!، لەبەرئەوە ئافرەتان نابێت لەسەر ڕێگاویـان و بەردەرگا دابنیشن.

سێیەم: ئەگەڕان بەدوای عـەیبی خەڵکـدا، بەخوشـکان دەڵـێم: خوشـکانی بەڕێز، دایکـانی خۆشـەویـست، کاتێـك کـە لەکۆبونەوەیەکـدا دادەنیشن یـان

لەسەردانێکدا بۆ لای خوشکەکانت، بۆ لای جیرانەکانت، بۆ لای خزمەکانت، بۆلای کۆمەڵێك مسوڵمان کەدادەنیشن هەوڵبدەن بەدوای عەیب و عاری خەڵکدا نەگەڕێن، باسی عەیبی خەڵك مەکەن!، کەبەداخەوە ئەوە نەك هەر عادەتی زۆرێك لەخوشکانە بەڵکو عادەتی زۆرێك لەپیاوانیشە!، دادەنیشێ نازانێ مەجلیسەکەی بەچی برازێنێتەوە، فکر دەکاتەوە: ئەرێ لە گەڕەکێدا کێ کێشەی هەیە بۆئەوەی کێشەی ئەو باس بکەن، کێ عەیبدار بووە لەو گەڕەکەی؟، بۆئەوەی عەیبەکەی ئەو باس بکەن، مەجلیسەکەی بەباسی کێ برازێننەوە؟، بەدوای عەیبی خەڵکدا گەڕان حەرامە، جا جاری واهەیە عەیبی باوکتە، عەیبی مێردەکەتە، یان عەیبی براتە یان عەیبی خزم و کەسوکارتە، ئافرەت بۆی نیە عەیبی خۆشی بگێڕێتەوە، چ جای عەیبی کەس و کارو خزم و مێردو خۆشەویست و مسوڵمانان!، وەهەروەها پیاویش بۆی نیە عەیبی خۆی و عەیبی خێزانی بگێڕێتەوە یان عەیبی خزم و کەسی بگێڕێتەوە، گوێ بگرن لەفەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە ئەفەرموێ: (كلُّ أُمّتي مُعافَى الاّ المُجاهِرين)[70] واتە: ئوممەت هەمووی قابیلی عەفووە، تەنها ئەوانە نەبن کە عەیبیان کەشف دەکەن، ئەوە کە ئینسان عەیبی خۆی کەشف بکات، ئەوانە کێن کەعەیبی خۆیان کەشف دەکەن؟، ئەفەرموێ: (وإنَّ مِنَ المجاهرةِ أن يَعمَلَ الرَّجُلُ باللَّيلِ عَمَلاً ثُم يُصبِح وَقَد سَتَرَهُ اللهُ عليه فيقولُ يافلان عَمِلتُ البارِحَةَ كَذا وكَذا) واتە: پیاوێك شەو کارێکی بێ شەرعیی کردووە هەڵدەستێتەوە بەیانی لەناو مەجلیسێك دانیشتووە، یان ئافرەتێکەو شەو کارێکی بێ شەرعیی کردووە، بەیانی هەڵدەستێتەوە لەگەڵ ئەوەی کەخوای گەورە پاراستویەتی و نهێنی ئەوی کەشف نەکردووە، ئەو بۆخۆی بەیانی لەناو ئەوکۆمەڵە خەڵکەدا نهێنی خۆی کەشف دەکات! دەڵێ فلانەکەس من دوێنێ ئاواو ئاوامکرد...، بێگومان خوای

[70] صحيح البخاري، كتاب الأدب، باب: ستر المؤمن على نفسه، رقم الحديث ٥٧٢١

گەورە (جل جلالە) بەو شتە لێی تووڕە دەبێت، جا ئەگەر پیاو بێت یان ئـافرەت بێت، ئەوە بەڕاستی بێ شەرعی یەو حەڕامە، نابێ بکرێ.

پاشان ئافرەتێك نابێـت نهێنـی نێـوان خـۆی و مێردەکـەی کەشـف بکـات هەروەکو چۆن پیاو بۆی نیە نهێنی نێوان خـۆی و خێزانەکـەی کەشـف بکـات، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (إنَّ مِن أشَرِّ النَّاسِ عِندَ اللهِ مَنزِلَةً يَومَ القِيامَةِ رَجُل يَفضِ الى المَرأة وتفضِ اليه ثُم ينشرُ سِرّها)[71]، ئەفەرموێ: خراپترین کەس لەلای خوا لەپلەو پایەدا ئەو کەسەیە شەو چۆتە لای خێزانی خۆی، بەیانی لای خـەڵك باسی دەکات، یان ئافرەت لەگـەڵ مێردەکـەی خـۆی ڕابیـواردوە، بـەیانی لای ئافرەتان باسی دەکات!، ئەوە خراپەو حەڕامە، ئەوە لەو کەسانەیە کـە لـەڕۆژی قیامەت لەپلەو پایەی نزمی بێ ڕێزو بێ نرخی ڕۆژی قیامــەتن، جـا پێویـستە هەم پیاو خۆی بپارێزێ، عەیبی خۆی و خێزانی، وە هەم ئافرەت عەیبی خۆی و مێردەکەی کەشـف نـەکات، چـونکە شـەرەف و کەرامــەتی خێـزان شــەرەف و کەرامەتی مێردەکەیەتی، شەرەف و کەرامەتی باوکیەتی، شـەرەف و کەرامەتی برایــەتی و خزمەکانیــەتی، وە هــەروەها پیـــاوێکیش شــەرەف و کەرامــەتی خێزانەکەی هی خۆی، وە هی خۆی هی خێزانەکەیەتی، تەواوکەری یەکن.

بــەڵێ، پاشــان ئاگــات لەشــەرەف و کەرامــەتی جیرانــەکان و خزمــەکان و مسولّمانان بێت، خوشکی بەڕێز هــەرگیز پێتخـۆش نـەبێت کاتێـك خوشـکان دادەنیشن با نەگەڕێن بیر بکەنەوە چ بابـەتێك ئـەمڕۆ پێویـستی بەباسـکردنەو مەجلیسەکەیانی پێ ببەنە سەر، سـەعاتێك و دوو سـەعات دابنیـشن، فلانـە مسولّمانێك، فلانە ئافرەتێك کە کێشەی هەیە لەگەڵ مێردەکەی، تەلاق دراوە، مارە براوە، یان عەیبێکیان تێدایـە، کـەپێیان ناخۆشـە بـاس بکرێـت باسـیان دەکرێت، هەر مـسولّمانێك پێی خۆش بێت لەناو مسولّماناندا کێـشەو ئـاژاوەو

[71] صحيح مسلم، كتاب النكاح، باب: ترك إفشاء سر المرأة، رقم الحديث ١٤٣٧

ناخۆشی بلاو بێتەوە، فەسادو بێئەخلاقی بلاوبێتەوە، ئەوە عەزابی بەئێش و بەئازاریان هەیە لەڕۆژی قیامەت، وە لەدونیاشدا خوا ڕیسوایان دەكات، خوای گەورە (جل جلاله) بەدەقی ئایەتی خۆی لەقورئانی پیرۆز لە سورەتی (النـور)دا نەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ الْفَاحِشَةُ فِي الَّذِينَ آمَنُوا لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ (١٩) النـور، واتە: ئەوانەی كەپێیان خۆشە خراپەو خراپەكاری(فاحِشة) لەناو ئیمانداراندا بلاوبێتەوە، سزای بەئێش و ئازاریان هەیە لەدونیاو لەقیامەتیش!، جا باپیاوان و ئافرەتان وریا بن حەز نەكەن بەبلاو بونەوەی فیتنەو ناخۆشی و فەسادو بێئەخلاقی و بەڕەلایی لەنێوان ئیمانداراندا، خوانەخواستە ئەگەر مسولمانێكیش هەلەیەكی لێ ڕوودا دەبێ بۆی بپۆشن، هەولبدرێ بە ئامۆژگاری چاك بكرێ، بۆنەوەی ئیسلام لەسەری قەرزار نەبێتەوە، بۆئەوەی مسولمانان لەسەری زەرەر نەكەن و سومعەی ئیسلام و مسولمانان پارێزراو بێت.

بەلێ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ هانمان دەدات، كە ئێمە نهێنی و عەیبی مسولمانان بپارێزین، دەفەرموێ: (لا يَسْتُرُ عَبدٌ عَبداً في الدُّنيا الاّ سَتَرَهُ اللّهُ في الدُّنيا والأخِرة)[٧٢]، واتە: هیچ عەبدێك عەیبی عەبدێك داناپۆشێ لەدونیادا مەگەر خوای گەورە (جل جلاله) لەدونیاو لەقیامەتیشدا عەیبەكانی دادەپۆشێت، مادام تۆ لەبەر خاتری خوا عەیبی مسولمانێكت پۆشیوە (چ پیاوە چ ئافرەت) خوای گەورە (جل جلاله) هەم لەدونیا وە هەم لەقیامەتیشدا عەیبەكانت دادەپۆشێ، وە شەرەف و كەرامەتت دەپارێزێ، وە هەركاتێك ویستت باسی عەیبی خەلك بكەی، بیر لەعەیبەكانی خۆت بكەوە!!، ئایا هەر ئینسانێك عەیبەكانی خۆی بێنێتە بەرچاوی خۆی، بۆی هەیە باسی عەیبی

---

[٧٢] صحيح مسلم، كتاب البر والصلة والأدب، باب: بشارة من ستر الله تعالى عيبه في الدنيا، رقم الحديث ٢٥٩٠

خەڵك بكات؟، بۆیە ئیبن مەسعود {ڕەزای خوای لەسەر بێت} صەحابەی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ، ئەفەرموێ: (أذا أَرَدتَ أَن تذكُرَ عيوبَ صاحِبك تذكَّر عُيوبَكْ) واتە: کاتێك ویستت عەیبی برای خۆت باس بکەی، بیر لە عەیبی خۆت بکەوەو بینە بەر چاوی خۆت!، بۆیە خوشکی بەڕێزیش لەمەجلیسدا لەگەڵ ئافرەتان کاتێك کە بیەوێ عەیبی کەسێك باس بکات با عەیبی خۆی بێنێتە بەرچاوی خۆی، نەوەك خوانەخواستە عەیبی جیرانەکەی یان عەیبی مسوڵمانێك لەگەڕەکەکەی یان لەفلانە عەشیرەت و هۆزو بنەماڵەیە باس بکات و مەجلیسەکەی پێ برازێنێتەوە.

پاشانیش خوشکی بەڕێز کەدادەنیشێ لەمەجلیسەکەدا دەبێت زمانی خۆی لە ئەزیەتدانی خەڵك بپارێزێ: جا چ بەغەیبەت بێت، چ بەبوختان بێت، چ بەدرۆ بێت، چ بە قسەهێنان و بردن(نميمة) بێت و ئەو گوناهباریەی توش ببێت، دەبێ خۆی لەو شتانە بپارێزێ، پێغەمبەرﷺ لەهەموو ئەوانە هەڕەشەمان لێدەکات، خوای گەورە (جل جلاله) پێش ئەوە سەبارەت بەغەیبەت دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا﴾ (١٢) الحجرات، واتە: هەندێکتان غەیبەتی هەندێکتان مەکەن، چ پیاوان چ ئافرەتان، غەیبەت کردن واتا باسکردنی یەکێك لەپاشملە بەشێوەیەك کە پێی ناخۆشبێ ﴿أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ﴾ (١٢) الحجرات، واتە: ئایا هەریەکێك لەئێوە پێی خۆشە گۆشتی براکەی بخوا بەمردوویی!، برایەکەت مردووەو هێشتا نەنێژراوەو لەگۆڕ نەنراوە، پێتخۆشە بچی گۆشتەکەی بخۆی؟! (فَكَرِهْتُمُوهُ): کە ئێوە حەزی پێناکەن و چەندە بێ لەزەتە؟، چونکە ناجورو ناڕێك و ناخۆشە، ئەوەندە ناخۆشە خوا بۆخۆی دەفەرموێ (فَكَرِهْتُمُوهُ): پێتان ناخۆشە!، جا کەپێتان ناخۆشە مانای وایە غەیبەتی یەکتریش مەکەن، غەیبەت ئەوەیە وەکو پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (أن تذكرَ أخاك بما يكرهُ)[٧٣]، واتە: بەشێوەیەك

[٧٣] فتح الباري، جزء ١٠: صفحة ٤٦٩، كتاب الأدب، باب: الغيبة وقول الله تعالى (ولا يغتب بعضكم بعضا...) أشير بأنه قول الإمام غزالي (رحمه الله).

باسی بکەی کە پێی ناخۆشە، پاشان پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (المُسلِمُ مَن سَلِمَ المُسلِمونَ مِن لِسانِه وَيَدِهِ)[٧٤] واتە: مسوڵمان ئەوەیە مسوڵمانان لەدەست و زمانی سەلامەت بن، (جا ئەگەر پیاوە یان ئافرەتە)، با سەنگی مەحەك لەلای تۆ ئەوە بێت، ئەگەر مسوڵمانان لەدەست و زمانت سەلامەت بوون ئەوە نیشانەی مسوڵمانەتی خۆتە، لەدەستت سەلامەت بن: واتا زەردرت بەدەست بۆیان نەبێت، خیانەتیان لێ نەکەیت، وە بەزمانیش: غەیبەت و بوختان و زەمی نەکەی، وە قسەی لەسەر نەکەی کە خوانەخواستە بەهۆی قسەکەی تۆوە زەرەری پێبکەوێ، نەشاهێدی بەدرۆی بۆ بدەی و نە بوختانی بۆ هەڵبەستی، لە کاتێکدا کەبوختان هەڵبەستن دەبێتە مایەی لەعنەتی خوا (جل جلالە): ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ لُعِنُوا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ (٢٣) النور، واتە: ئەو پیاوانە یان ئەو ئافرەتانەی کە زینا یاخود خراپە ئەدەنە پاڵ ئافرەتێکی صاڵیحە لەعنەتیان لێکراوە لەدونیاو لەقیامەتیش، مسوڵمان دەبێت زمانی خۆی بپارێزێ لەوەی کە ئافرەتێکی پاك تاوانبار بکات، چونکە بەهۆی ئەوەوە بەر لەعنەتی خوا دەکەوێ.

پاشان قسەهێنان و بردن، لەڕاستیدا ئەوەش کە نەمیمەی پێدەڵێن، گوناهی گەورەیە بۆیە پێغەمبەر ﷺ بەسەر دوو قەبردا ڕۆیشت[٧٥] فەرمووی: ئەو دوو کەسە لەناو ئەو دوو قەبرەدا ئازار دەدرێن، یەکێکیان لەبەر ئەوەیە کە خۆی لەمیز پاك نەکردۆتەوە، خۆی لەپشکەمیز نەپاراستوە، وە یەکێکیشیان بەهۆی

---

[٧٤] صحيح البخاري، كتاب الأيمان، باب: المسلم من سلم المسلمون من لسانه ويده، رقم الحديث ١٠

[٧٥] ((حدثنا عثمان قال حدثنا جرير عن منصور عن مجاهد عن بن عباس قال ثم مر النبي صلى الله عليه وسلم بحائط من حيطان المدينة أو مكة إنسانين يعذبان في قبورهما فقال النبي صلى الله عليه وسلم يعذبان وما يعذبان في كبير ثم قال بلى كان أحدهما لا يستتر من بوله وكان الاخر يمشي بالنميمة ثم دعا بجريدة فكسرها كسرتين فوضع على كل قبر منهما كسرة فقيل له يا رسول الله لم فعلت هذا قال لعله أن يخفف عنهما ما لم تيبسا أو إلى أن ييبسا باب ما جاء في غسل البول وقال النبي صلى الله عليه وسلم لصاحب القبر كان لا يستتر من بوله ولم يذكر سوى بول الناس))، صحيح البخاري، كتاب الوضوء، باب: من الكبائر أن لا يستتر من بوله، رقم الحديث ٢١٣.

ئەوەیە کەقسەی هێناوەو بردوە لەنێوان مسوڵماناندا، ئەوە لەبەر ئەو دوو شتانە هەریەکێکیان لەبەر سیفەتەکەی خۆی لەناو گۆڕەکەیدا سزا دەدرێت!.

جا بەڕێزان: جاری وا هەیە گوناهێکت پێ زۆر کەمە، بەلاّم بەهۆی ئەو گوناهەوە پێی توشی سزای ناو قەبرو سزای دواڕۆژ دەبیت، لەبەرئەوە ئاگادار بن و خۆتان بپارێزن.

خاڵی کۆتایی: کات بەفیڕۆ نەدان، کە بەداخەوە خوشکی وا هەیە دەچێت سێ سەعات لەگەڵ خوشکێك دادەنیشێ کات بەفیڕۆ دەدات، سوود لەکاتەکەی نابینێ، وە جاری وا هەیە بەشتی بێ شەرعیش دەیباتە سەر، بۆنمونە: خۆڕازاندنەوەی بێ شەرعیی..

یەك دوو شت هەیە حەز دەکەم بەخوشکانی بەڕێز بڵێم کە حەرامەو پێویستە خۆیانی لێبپارێزن: یەکەم: سەرو پرچ ڕەشکردن بەو سبوغەی کەئێستا لە بازاڕو لەشوێنەکان پەیدابووە، دیارە هەم بۆ پیاوان حەرامە، وە هەم بۆ ئافرەتانیش حەرامە، ئەبوبەکری صدیق{ڕەزای خوای لەسەر بێت} کاتێك فەتحی مەککە کرا، دەستی باوکی خۆی گرت، سەرو ڕیشی سپی بوو، هێنایە خزمەت پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) و مسوڵمان بوو، کاتێك کەمسوڵمان بوو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (غَيِّرها واجتَنِبُوا السَّواد)[٧٦]، واتە: سەرو پرچی ئەو- کە سپی بووە- بگۆڕن و بۆی جوان بکەن، بەلاّم خۆتان لەڕەش بپارێزن!، ئەوە فەرمودەی صەحیحە، حەرامە بۆ پیاوان، وەهەروەها بۆ ئافرەتانیش کەپرچیان بەڕەش سبوغ بکەن، لە حیکمەتێکدا نەبێت کەقازی و پێشەوای ئیمانداران ئەوە بەچاك بزانێت، بۆنمونە دەفەرموون: کاتێك کە کۆمەڵێك ڕیش سپی هاتنە مەیدانی جیهاد ، مەیدان ڕوبەڕوی دوژمن، قەیناکە ئەگەر سەرو پرچیان سبوغ بکەن، بۆئەوەی کە

---

[٧٦] صحيح المسلم، كتاب اللباس والزينة، باب: استحباب خضاب الشيب بالصفرة والحمرة، رقم الحديث ٢١٠٢

كافرەكان وابزانن ئەوانە گەنجن، ئەمـە كـاتێكی تایبەتـەو سـنورداره، وەكوچـۆن جلوبەرگی حەریر كە حەرامە پیاو لەبەری بكات، كاتێك كـە ئینـسان نەخۆشـی دەیگرێ، زانایان فەتوایان داوە كە ئەگـەر ئـەو قوماشـە ببێتـە مایـەی لادانـی نەخۆشیەكە، بۆی هەیە كاتیی لەبەری بكات، ئەگەرنا حەرامە.

دووەمین: پێویستە خۆیان لە{موو چاندن}بپارێزن، ئەوەكە مووی ئافرەتێك بڕنێتەوەو لەسەری ئافرەتێكی تر بیچێنێ، كە دیارە هەیە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (لَعَنَ اللهُ الواصِلَةَ والمَوصُولَة)[77] واتـە: خـوای گـەورە (جـل جلالـە) لەعنەتی كردوە لەو ئافرەتەی كە مووی دەڕنێتەوە لەسەری ئافرەتێك بۆ سـەری ئافرەتێكی تر، (والموصولة): وە ئەو ئافرەتەش كە خۆی ئامـادە دەكـات پرچـی ئافرەتێكی تر لەسەری بـچێنرێت، لەعنـەت لەهـەردوكیان كـراوە!، پاشـانیش دەفەرموێ، كوتان، ئەوە كە شوێنێك دەكوترێ و بەمەرەكەب شـوێنی ئاسـاری مەرەكەبەكەی تیدا دەمێنێتەوەو ناڕوا بەئاوو بەصابون، ئەوە كە بەدەرزی كونی دەكاو پاشان داخی دەكاو نازانم بەچ جۆرێك مـۆری دەكـاو دەیكـوتێ، بەهـەر ڕەنگێك بێت لەڕەنگەكان ئەوەش حەرامـە، بۆیـە پێغەمبـەر ﷺ لـە درێـژەی فەرمودەكەیدا دەفەرموێ: ... وەهەروەها خـوای گـەورە لەعنـەتی كـردوە لـە (الواشِمة والمُستَوشِمة): لەعنـەت كـراوە لـەو ئافرەتـەی كـەدەكوتێ و لـەوەش كەدەكوترێ!، مـسوڵمانان، ئافرەتـان پێویـستە خۆیـان لەوشـتانە بپـارێزن، وە هەروەها (والنَّامِصَةَ والمُتَنَمِّصَة) واتە: ئەو ئافرەتانەی برۆی خۆیـان –باریـك- دەكەن، برۆی خۆیان دەبڕن، بۆ جوان بـونی بـرۆ، ئەوانـەش پێغەمبـەر (علیـە الصلاة والسلام) دەفەرموێ، خوای گەورە (جـل جلالـە) لەعنـەتی لێكـردون، چۆن خەڵقی خوا دەگۆڕن؟، چۆن پلان و بەرنامەی خوای پـەروەردگار دەگـۆڕن؟،

---

[77] صحيح البخاري، كتاب اللباس، باب: الوصل في الشعر، رقم الحديث ٥٥٨٩

کە برۆی تۆی ئاوا دروست کردووەو تۆ بێنی بە جۆرێکی تر دەستکاری بکەی، بۆیە خوای گەورە (جل جلاله) دەفەرموێت: ﴿فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ اللّهِ وَمَن يَتَّخِذِ الشَّيْطَانَ وَلِيًّا مِّن دُونِ اللّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُّبِينًا﴾(١١٩) النساء، واتە: ئەوانەی کە دەیانەوێ خەڵقی خوا بگۆڕن، ئەوانە شەیتان زەفەریان پێدەبات، خەڵقی خوا لە: برۆ و لوت(کەپوو) و لە دداندا، کە خوای گەورە (جل جلاله) چۆنی دروست کردوی دوایی بیگۆڕی حەرامە، دەستکاری کردنی خەڵقی خوا حەرامە، وە هەروەها (والمتَفلّجَة) واتە: ئەو ئافرەتەی کە ددانەکانی خۆی چاك دەکات، نێوان ددانەکانی دەبڕێ، دەیانتراشێ وەکو نەجار، دەیانتراشێ بۆئەوەی شاش و جوان بن، ئەو ئافرەتەش بەهەمان شێوە دەکەوێتە بەر ئەو هەڕەشەی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام).

وە لەکۆتاییشدا دەڵێم: پێویستە خوشکانی بەڕێز، لەکۆبونەوەکانیاندا، لەدانیشتنیاندا، لەسەردانیاندا، ئاگایان لەعیبادەتەکانی خۆیان بێت، جاری وا هەیە نوێژی لەسەر تاخیر دەکەن، جاری وا هەیە بێ فەرمانی مێردەکانیان دەکەن، کابرای واهەیە لەئیش و کەسابەت هاتۆتەوە لەماڵەوە چاوەڕێی خێزانیەتی کەچی خێزانەکەی ڕۆیشتوە بۆ سەردان و دوو سەعات و سێ سەعاتی پێدەچێ، بەڕاستی ئەوە گوناهە تاوانباریە بەرامبەر خوا، تاوانباریە بەرامبەر بە مێردەکەی یان باوکێکی فەقیرحاڵ و پیرو بەستەزمانی بەجێهێشتوە یان دایکێکی پیری بەستەزمانی بەجێهێشتوە یان ئیشی خۆی و ماڵەکەی لەسەر فەوتاندوە یان ماڵ و منداڵی یان منداڵی ساوای بەجێهێشتوە، خوشکانی بەڕێز پێویستە لەو شتانەدا ئاگادربن چونکە تاوانباری هەر ئەوە نیە ئینسان نوێژێ نەکات!، بەڵکو قسوری هەبێت یان زوڵمی هەبێت بەرامبەر بە مێردەکەی، بەرامبەر بە باوکی، بەرامبەر بە دایکی، بەرامبەر بە منداڵەکانی، هەمووی هەر گوناهن، بۆئەوەی کە ئیستیفادە لەنوێژو ڕۆژوو و لەحەج و لە زەکات و لە عیبادەتەکانی تر وەربگرێ،

جا ئەوانەم تەنها بـۆ ئافرەتـان نـەبو بـەڵکو بـۆ پیاوانیـشە بەڕاسـتی، پێویـستە مەجلیسەکانمان بەبیرکردنەوەو قسەی خێر بەسەربەرین، پێغەمبـەر (علیـه الـصلاة والسـلام) دەفەرموێ: (مَن كَانَ يُؤمِنُ بِاللهِ وَاليومِ الأخِرِ فَليَقُل خَيراً أو ليصمُتْ)[78]، واتە: هەرکەسێك باوەڕی بەخواو بەڕۆژی قیامەت هەیە، یا قسەی خێر بکات یـان بێدەنگ بێت!، ئەگەر قسەی خێر نازانی یان بۆت نـاکرێ بێـدەنگ بیـت باشـترە، کەسێك پێت بڵێت : "چەندە مۆن و مرچە!"، باشترە لەوەی کـە قـسەیەك بکـەی لەقیامەت لەسەری قەرزار بیەوە، یا گوناهت پێنەگات باشترە.

خوای پەروەردگار عـاقیبەتی عـومری هەمـوو لایەکمان خێر بکات، یارەببی خوایە ئیصلاحی حاڵمان بکەی، یارەبی خوایە چاکەمان بۆ بێنیە پێش، لەخراپە بمانپارێزی، شیفای نەخۆشیەکانمان بێنی، خوایە دڵ و دەروغان بەنوری ئیـسلام و بەنوری ئیمان ڕونـاك بکەیتـەوە، لەسـەر بنـەمای ئیـسلام بمانـژیێنی، لەسـەر بنـەمای ئیـسلام بمـانمرێنی، خوایـە خۆشەویـستی خـوت و دینەکـەت و پێغەمبەرەکەت زیاتر لەدڵمانـدا جـێگیر بکـەی، هیدایـەتی مـاڵ و منـداڵمان بدەی، خوایە هەمـوو مـسوڵمانان لەژێر ستەمی بێ دینان لەهەموو دونیا ڕزگـار بکەی، یارەبی خوایە بمانپارێزی لەدەردو بەلاو ناخۆشی، خۆمان و ولاتەکەمان ، میللەتەکەمان لە دەردەسەری زەمانە بپارێزی، آمین.

أقول قولي هذا وأستغفر الله لكم ولسائر المسلمين، فاستغفِرُوهُ إنَّه كان غَفَّاراً ،

أعوذ بالله من الشيطان الرجيم

{رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ} آمين.

---

[78] صحيح البخاري، كتاب الأدب، باب: من كان يؤمن بالله واليوم الأخر...، رقم الحديث ٥٦٧٢

# کڕین و فرۆشتن و خۆپاراستن لە کەسابەتی حەڕام

## بسم الله الرحمن الرحيم

إنَّ الحمد لله نحمده ونشكره ونستعفره ونستهديه، ونعوذ بالله مِن شرور أنفُسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضِلَّ له ومن يضلل فلا هادي له ، ونشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له ونشهد أنَّ سيدنا ونبينا محمداً عبده ورسوله، هذا الرسول الذي بلغ الرسالة وأدى الأمانة ونصح الأُمة وجاهد في الله حق جهاده وتركنا على المحجة البيضاء، ليلها كنهارها، لايزيغ عنها إلا هالك صلواة الله وسلامه عليه وعلى أله وأصحابه، ومن تبعهم باحسان الى يوم الدين ...، أما بعد يا عبادالله أوصيكم ونفسي أولاً بتقوى الله وطاعته، فإنّ اللهَ مع الذين اتقوا والذين هم محسنون، قال الله سبحانه وتعالى في كتابه الحكيم، بسم الله الرحمن الرحيم: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ (١) النساء..

ئیماندارانی بەڕێز، شوێنکەوتوانی پێغەمبەری پێشەوامان محمد ﷺ، ڕەحمەتی خوای پەروەردگار، میهرەبانی و بەرەکەتی خوای پەروەردگار بڕژێ بەسەر ئێمەو هەموو موسوڵمانانی دونیا لەم ڕۆژە پیرۆزەدا، یارەببی خوایە ڕەحم بەحاڵی ئێمەو هەموو مسوڵمانانی دونیا بکەی، خوایە بەمسوڵمانی بمانژیێنی وە بەمسوڵمانی بمانمرێنی، خوایە لەگوناهی خۆمان و باوك و دایکمان و ماڵ و منداڵمان خۆش بیت، شیفای نەخۆشیەکانمان بێنی و لە مردوەکانمان خۆش بیت.

بەڕێزان... شەریعەتی ئیسلام، هەموو لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵگەی ئینسانی ڕەچاو کردووە، چارەسەری هەموو نەخۆشیەکانی دیاری کردووە، یەکێك لەو لایەنانەی کە خوای پەروەردگار (جل جلالە) زۆر گرنگی پێداوە

لەقورئانی پیرۆز، وە پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) لەفەرموودە پیرۆزو بەرێزەکانی شەریعەتی ئیسلام بەگشتی و زانا پایەبەرزەکانی ئیسلام زۆر گرنگییان پێداوە، بریتی یە لە چۆنیەتی هەڵسوکەوتی ئینسانەکان لەگەڵ یەکتری، وە لەناو ئەو لایەنەشدا چۆنیەتی موعامەلەو کەسابەت لەگەڵ یەکتریدا، ئایینی پیرۆزی ئیسلام کۆمەڵێك بنچینەی داناون بۆ ئینسانی مسوڵمان، بۆئەوەی بزانێ کامە کەسابەت حەڵاڵە، کامە موعامەلە حەڵاڵەو دەبێتە مایەی ڕەزابونی خواو وەدیهێنانی بەختەوەری دونیاو قیامەت و کامەشیان حەرامەو دەبێتە مایەی شەرمەزاری لای خوای پەروەردگار (جل جلالە) و مایەی سزا لە ڕۆژی قیامەت.

بەپێویستم زانی لە وتاری ئەمڕۆی هەینی دا هەمووومان لەخزمەتی ئەو بابەتە گرنگەدا بین، ئەوانەی کە گوێیان لێیە، ئەوانەش کەگوێیان لێنابێت پێیان ڕابگەیەنین وەکو بەرپرسیاریەتیەك، بابزانین ئەو کەسابەتە حەرامانە چین؟، ئەو موعامەلانە چین کە حەرامن و شەریعەتی ئیسلام نەهی لێکردوون؟، بۆ ئەوەی خۆیانی لێ بپارێزین، بۆ ئەوەی قەبری خۆمان پڕ لە ئاگر نەکەین، بۆ ئەوەی قیامەتی خۆمان لەخۆمان تێك نەدەین و وێرانی نەکەین، بۆ ئەوەی خۆمان خەجاڵەتی بەردەستی خوا نەکەین لەڕۆژی قیامەت، بۆ ئەوەی ماڵ و منداڵمان بە حەرام پەروەردە نەکەین، پارووی حەڵاڵیان پێ بدەین، نەك پارووی حەرام، لەبەرئەوەی بەداخەوە کە زۆربەی کەسابەتەکانی ئەمڕۆ، زۆربەی موعامەلەکانی ئەمڕۆ حەرامیان تێکەوتووە!، بۆیە بە پێویستم زانی لە وتاری ئەمڕۆدا باسی ئەو بابەتە بکەین.

پێش وەخت پێویستە بزانین معامەلەی حەڵاڵ کامەیە؟! بنچینەکانی موعامەلەی حەڵاڵ کامانەن؟، زانایان دەفەرمون: بنچینەکانی موعامەلەی حەڵاڵ بریتین لە شەش شت، هەموو موعامەلەیەك کە حەڵاڵ بێت، شەش ڕوکنی هەیە، چۆن ئینسان دەچێتە حەج، دەبێ ڕوکنەکانی حەج جێبەجێ بکات

ئەوجا حەجەکەی تەواوە، دەبێ لەکڕین و فرۆشتنیشدا ئەو شەش ڕوکنانە جێبەجێ بکەی، ئینجا موعامەلەکەت ڕاستە:

یەکەم: (طهارة العين)، پاکی ئەو شتەی کەدەیفرۆشی یان دەیکڕی، لەزاتی خۆیدا ئەو شتە دەبێت پاك بێت، کەدەیفرۆشی یان دەیکڕی، دووەم: (الإنتفاع به) سود لێ بینین، شتێك بفرۆشی سودی لێ نەبینرێ و بێ کەڵك بێت، موعامەلەکە ڕاست نابێت، شتێك بکڕی، سودی لێ نەبینرێ، کڕین و فرۆشتنی ئەو کەلوپەلە حەلاڵ نیە، سێ یەم: (مُلكية العاقد له) واتە: ئەو کەسەی کە ئەیفرۆشێ دەبێ موڵکی خۆی بێت، کەسێك شتێك دەفرۆشێ دەبێت موڵکی خۆی بێت، موڵکی هیچ کەسی تر نەبێت با دینارێکیش بێت، یان وەکیلی خاوەن موڵك بێت، چوارەم: (القدرةُ على تسليمهِ) واتە: دەبێ بتوانێ ئەو کەلوپەلەی کە فرۆشیار دەیفرۆشێ، تەسلیمی موشتەری بکات، ئەگەر نەتوانێ تەسلیمی بکات ئەوە فرۆشتنەکە دروست نابێت، وە پێنجەم: بریتی یە لەوە کە (کون المبيع مقبوضاً) واتە: ئەو شتە دەبێت بگاتە ژێر دەستی موشتەری و بتوانێ دەسەلاتی بەسەردا بشکێ و وەریگرێ، وە هەروەها تەعبیرو شێوازێك کڕین و فرۆشتنەکە بگەیەنێ و دیاری بکات.

جا خۆشەویستەکانم، ئەو بابەتە زۆر هەڵدەگرێ بەلاّم ئێمە وەك گوڵبژێرێك بۆ سەردەمی خۆمان یان ئەوانەی کە پێویستە بیانزانین ژمارەیەك لەو موعامەلەو ژمارەیەك لەو کەسابەتانە دەستنیشان دەکەین کە حەرامە یان پێویستە خۆیان لێبپارێزین، بۆ ئەوەی کە نەبێتە مایەی توڕەبوونی خودا (جل جلاله) باسیان دەکەین:

یەکەم: غەش و خیانەت لە موعامەلەدا، بە عیبارەتێکی تر: شاردنەوەی عەیبەکانی ئەو کەلوپەلەی کەدەیفرۆشی، بێگومان ئەوانە کۆمەڵێك جۆرو شێوازو کۆمەڵێك نموونەی هەن، غەش بەشێوەیەکی گشتی حەرامە، ئەگەر چەند نموونەیەك باس بکەین بۆ زیاتر حاڵی بون: پیاوێك دەیەوێ خانوەکەی

بفرۆشێ، ئەو خانوە لەلای موشتەری زۆر مەدح دەكات، دەڵێ ئەو خانوە تەملیكەو، ئەو خاوە تاپۆیەو بناغەكەی وایەو سەرەكەی وایەو حاڵی وایەو حیسابی وایە!. لەڕاستیشدا كێشەی لەسەرەو وانییە!، ئەوە غەشە، یان خانوەكەی كۆن بووە بۆئەوەی بیفرۆشێتەوە بە پارەیەكی چاك، دێت تەعمیرێكی دەكاو ئەو دەرزو ئەو شەق بوون و ئەو هەموو خراپەكاری و ئەوانەی كە لەخانوەكەدا دیارن، سوغێكیان لێئەداو تەعمیرێكی هاكەزایی و بەسێنایی دەكاو پاشان بە پارەیەكی چاك دەیفرۆشێتەوە، كابرای كڕیاریش وا دەزانێ خانووەكە تازە دروستكراوەو هیچ عەیبی نین، لەناكاو پاشی مانگێك، پاشی ساڵێك دەردەكەوێ كە خانوەكەی هەموو شەقی بردوەو بناغەكەی وێران بووە، وە عەیبەكانی وردە وردە بەدەر دەكەون، ئەوەش غەشەو حەرامە، یان لەكڕین و فرۆشتندا بەتایبەت مێوەجات ئەوە كە كابرای فرۆشیار(بائع) شتە چاكەكان لەسەرەوە دادەنێ وە شتە خراپەكان لەژێرەوە دادەنێ، تەماتە دەفرۆشێ سەری سندوقە تەماتەكەی هی چاكی لێدانێ و هی ژێرەوەش خراپەكان بێت، پیكەبێك شووتی هەیە، شووتیە باشەكان لەسەرەوە دانێت و خراپەكان لەژێرەوە بن و یان خیارو تەرۆزی بێنێ بەهەمان شێوە یان هەر كەلوپەلێكی هەیە بیفرۆشێ، چاكەكان و باشەكانی لەسەرەوە دادەنێ بۆ ڕازاندنەوەی یان لەدوكانێك هێشووە ترێی چاك و جوان و ڕێكوپێك لەپێشەوە دادەنێ، دوایش كەكابرا دێت لەژێرەوە بۆی لەتەرازوو دەكات و بۆی دەكێشێ، ئەوە غەشەو حەرامە، پارەكەی لێ حەرام دەبێت، یان شتێك دەفرۆشێتەوە سەرەكەی یان ڕواڵەتەكەی هیچ عەیبی نیە، بەڵام لەناوەڕۆكدا عەیبدارە، پێغەمبەر ﷺ بە بازاڕی مەدینەدا ڕۆیشت، بینی كۆ گەنمێك هەڵدرابویەوە، ئەویش دەستی لەناو ڕاكرد، دەستی تەڕ بوو، كە دەستی كێشایەوە بە خاوەنەكەی فەرموو: ئەوە چی یە؟، گوتی: (أَصَابَتْهُ السَّماء يارسول الله)[٧٩]: باران لێی داوە ئەی پێغەمبەری خوا،

[٧٩] صحيح المسلم، كتاب الأيمان، باب: قول النبيﷺ من غشنا فليس منا، رقم الحديث ١٠٢

پێغەمبەرﷺ فەرموی: (أفَلا جَعلتَهُ فَوقَ الطَّعامِ كَي يَراهُ النَّاس) واتە: ئەوە بۆ -کە تەڕبووە- لەسەرەوەت دانەناوە تا خەڵك ببینێ و بزانێ تەڕە؟، دوایی فەرموی: (مَنْ غشَّ فلَيسَ مِنّي) هەر کەسێك غەش بکات لەئێمە نیە، لەشوێنێکەوتوانی ئێمە نیە، کەوابو غەش کردن خیانەتکردنە لە موعامەلە، لە کڕیار، ئەوەش حەرامەو پارەکەش حەرام دەکات، وە ئەو هەڕەشەی پێغەمبەر ﷺ دەمانگرێتەوە کە فەرموی: (لا يَحِلُّ لِمُسلِمٍ بَاعَ مِن أخيهِ شَيئاً بيعاً فيهِ عَيبٌ إلاّ بَيَّنَهُ)[80] واتە: حەلاڵ نییە و دروست نییە بۆ ئینسانی مسوڵمان شتێك بفرۆشێ و عەیبێکی تێدابێ و ئاشکرای نەکات. هەر شتێك دەفرۆشی پێویستە بڵێی ئەو عەیبەی تێدایە، بۆ ئەوەی ئینسانەکە بزانێ و شارەزا بێت، یان سەیارەیەو کۆنەیەو دەیەوێ بیفرۆشێ، هەڵدەستێت سبوغێکی دەکاو تۆزێکی تەعمیرات و دەسکاریەکی دەکاو پاشان دەبات لە پیشانگا(معرض) دەیفرۆشێتەوەو کابرای پێ هەڵدەخەڵەتێنێ، وە کۆمەڵێك پارەی لێوەردەگرێ، دوای هەفتەیەك مانگێك ئەوجار دەزانێ ئەو سەیارەیە ناوەڕۆکەکەی چۆنە؟، کە بەداخەوە زۆرێك لەمسوڵمانەکان ئەمڕۆ تووشی ئەو دەردە بوون، توشی ئەو نەخۆشیە بوون، وا دەزانن هەر ئەوەندە بەسە کە پارەکەیان بێتە دەست تیدی نازانن عاقیبەتی ئەو پارەیە چیە؟!، ئەو پارەیان لێدەبێت بە ئاگر لەڕۆژی قیامەت یان نا؟!، حەلاڵە یان حەرامە؟!، دەچێتە قورگی منداڵەکان و خێزانەکەی و ئەوان قازانجی لێدەکەن یان زەرەر؟!، نازانین لەولاتی خۆمان ئەو شتە بووە یان نا ان شاءالله نەبووە، بەلاّم بیستراوە کە لەلایەن مریشك فرۆشەکان، ئەو مریشکە فەقیرو بەستەزمانە، ئاوی سوێری دەدەنێ یان شتی سوێر کراوی دەدەنێ بۆ ئەوەی ئاو زۆر بخواتەوەو گرن بێ لەسەر تەرازوو یان لەکاتی فرۆشتندا، دان و دانەوێڵەی زۆر دەداتێ بۆئەوەی قورس بێت، چونکە ئەگەر هەر یەکێکیان غەرامێکیشی بچێتە سەرو گرانبێ، ئەوە بۆ ئەو کێشان و

---

[80] سنن ابن ماجة، كتاب التجارات، باب: من باع عيب فاليبينه، رقم الحديث ٢٢٤٦

پێوانەیە زۆرە!، ئەوە لەو شێوازەیە کە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) نەهی لێکردووە، یان هەر حەیوانێك پێش ئەوەی بیبەیە مەیدان، قەڵەوی بکەی لەماڵەوە، ئەو ڕۆژەی کە ئەتەوێ بیبەیت زۆر خواردنی پێبدەیت بۆ ئەوەی بەرچاو بێت و دیار بێت، یان مانگایەك دەبەیت بیفرۆشی، ئەو ڕۆژە شیری گوانەکانی نەدۆشی بۆئەوەی لە مەیدانی حەیوانات، پێی بڵێن ئەو مانگایە زۆر چاکەو زۆر شیردەردەو شیری زۆری تێدایە، یان ئەو ئاشەی کە ئاوێ دەگێڕی - وەکو لەشەرعدا باسکراوە- ئاوەکەی بگریەوە، ئەو کاتەی کە موشتەری ئاشەکە دێت، ئاوەکەی بەردەیەوەو بۆ ئەوەی جوان بسوڕێ و بڵێن ئاشێکی چاکە!، یان کابرای سەعات چاکەرەوە، هەڵدەستێت سەعات بۆ کەسێك چاك دەکاتەوە، پاش هەفتەیەك تێکدەچێ، یان تەلەفزیۆن چاککەرەوە شاشەکەی فول دەکات بۆئەوەی عەیبی پێوە دیار نەمێنێت، پاش ماوەیەك مانگێك بەدیار دەکەوێت کە شاشەکەی فول کراوە، بۆ خۆی دەزانێ چی لێکردووە، بەڵام کابرای هەژار لێنازانێت، دوایی بۆی دەردەکەوێ کە ئەوە کاتییە و لێی کەشف دەبێت، ئەوانە هەموو غەشن.

یان پارەی دوو ڕەقەم، کە ئەمڕۆ بەداخەوە ئەو فێڵ و فرتە زۆرە، پارەی دوو ڕەقەمەو لەناو شەددەی پارەکانی دەخا، بۆ کابرای دەباو پێی دەدات یان پێی دەڵێ یان پێی ناڵێ، ئەگەر پێی نەڵێ ئەوە هەر قەباحەتێکی گەورە ترە، ئەگەر پێشی دەڵێ و ڕازی دەبێ، ئەوەش هەر گوناهەو حەرامە، پارەیەك دوو ڕەقەم بێت با بەکابراش بڵێ ئەو پارە دوو ڕەقەمە، چونکە لێرەوە ئەو بەرێی دەکات، بەڵێ لەناو شەددەی پارەکاندا دەڕوا، بەڵام دەچێتەوە بانق و دووبارە جارێکی تر دێتەوە ناو خەڵك و فەرمانبەرو کارمەندەکان، جارێکی تر دێتەوە سەرو گوێلاکی خەڵك، لەبەرئەوە ئەگەر پارەی دوو ڕەقەم بێت یان ئەگەر پارەیەك بێت لایەکی دڕاو بێت، ئەوە ئەو پارەیە جیا بکرێتەوە چاکە، چونکە ڕۆژێك دێت هەردێتەوە سەر ئەو خەڵکەو دیسان دەگەڕێتەوەو دابەش دەبێتەوە، بۆیە

ئەوەش بەڕاستی حەڕامە، ئـەوەش گوناهـە، ئـەوەش فێڵـە، تـۆ پـارەی چـاك وەردەگری، بەلاّم پارەی خراپ دەگێڕیەوە بۆ خەڵك.

شتێکی تر کە بەداخەوە لەناو کۆمەڵگای ئێمەدا بـەدی دەکرێـت، ئـەویش ئەوەیە پارەی بەقەرز دەدا، لەبەرامبەردا مانگانە شـتێك وەردەگـرێ، بۆنموونـە: ئەندازەیەك پارە بەقەرز دەداتە کەسێك، ئەو کەسە ڕۆژانە برە پارەیەکی دەداتێ وە پارەکەش هەر لەشوێنی خۆیەتی؛ واتە: کـابرا دەڵـێ ئەندازەیـەکم بەقـەرز پێبدە، هەموو ڕۆژێ ئەمن پارەیەکت دەدەمێ، دوایش کەی هـەموو پارەکـەت ویستەوە من دەتدەمەوە، ئەوە حەڕامەو ڕیبایە، یان دەڵـێ بـۆ مـاوەی شـەش مانگ پانزە هەزارم بدێ، ئەو کاتە هەژدە هەزار دینـارت دەدەمـەوە. ئـەوەش حەڕامەو ڕیبایە، ئەو ڕیبایەی کە چەندین فەرمودەی پێغەمبەرﷺ و چـەندین ئایەتی قورئانی لەسەر هاتوون، ئەو ڕیبایـەی کـە پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێ: بچوکترین بەشیان، وەکو ئەوە وایە ئینسان دایکـی خـۆی مـارە بکـات!؛ ئـەو ڕیبایەی کە ئەمڕۆ لە بانقەکاندا زۆرە، ئەو ڕیبایەی کە ئەمڕۆ خەڵك هەستیشی پێناکات لەبەرئەوەی پرسی نەکردووە لای مامۆستایەك بڵێ ئـەو موعامەلـەی کەدەیکەم حەلاڵە یان حەڕامە!.

سێیەم: ئەوە کە بەناو ڕەهـن کردنـە، بـەلاّم ڕەهنـی هـەقیقی نیـە، ڕەهـن لەئیسلامدا حەلاڵە، بەلاّم ئەوە کـە کـابرا بێـت پـارە بەقـەرز بداتـە کەسـێك لەبەرامبەردا شتێك وەردەگرێ لێی، دوایی سودی لێدەبینێت یـان خانوویـەکی لێوەردەگرێ و بۆ خۆی دەچێتە ناو خانووەکەو دوایش دەبێ پارەکەشی بەتەواوی بداتەوەو ئیستیفادەشی لە خانووەکە کردوە!، ئەوە حەڕامە، کابرایەك پێویستی بە پارەیە، کوڕەکـەی دەنێـرێ بـۆ هەنـدەران، پـارەی لەکەسـێك وەردەگـرێ و خانویەکی دەداتێ بە ڕەهن لەلای بێت، بـەلاّم نابێـت کـابرای خـاوەن پارەکـە بچێتە ناو خانووەکە، بەڵێ خانووەکە لەژێر دەستی دایـە، وە هـەرکاتێك داوای پارەکەی کردو قەرزدارەکـە نـەیبوو ئـەوە خـاوەن پارەکـە دەتـوانێ خانووەکـە

بفرۆشێ و پارەی خۆی لێ هەڵگرێ، بەڵام نابێت ئیستیفادە لەو خانوە وەربگرێ، جا ئێستا جۆرێکی تریش هەیە بەداخەوە کە هەر خاوەنی خانووەکە لەناو خانوەکە دایە، بەڵام کابرای خاوەن پارەکە دەڵێ، قەیناکە بۆخۆت لەناوی دابە بەڵام دەبێ مانگانە کرێم بدەیێ، دوایی پارەکەی خۆی هەموو هەر لێوەردەگرێتەوە، ئەوەش ڕیبایەو حەرامە.

چوارەمینیان: بریتیە لە شاردنەوەی کەلوپەل (إحتِکار)، ئەوە کە لەوتارێکدا بەدوورو درێژی باسمان کردووە، ئیحتیکار: بریتی یە لەهەلگرتنی کەلوپەلی بازاڕ، بازرگانێك (تاجر) کەلوپەلی بازاڕ هەڵبگرێ، جا هەندێك لە زانایان دەفەرموون: تەنها {قوت} بۆ ئیحتیکار حەرامە، هەندێکیش دەفەرمون هەموو مەسلەحەتێکی مسوڵمانان حەرامە دەستی بەسەردا بگیرێ، بۆیە هەموو ئەو کەلو پەلانەی کە هەڵدەگیرێن بەمەبەستی بەقیمەت بوون، دوایی لە گرانیی دا لەکاتێکی وادا کە لەبازاڕ کەم دەبێت، دوای ئەوەی کە بەقیمەت دەبێت، ئەو دێت شتەکانی خۆی دەخاتە ڕوو، لەماڵێ و لە مەخزەنەکان دەیهێنێتە دەرێ و دەیفرۆشێتەوە: ئەودش حەرامەو ئیحتیکارە، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: (لا یَحتَکِرُ إلاَّ خَاطِئ)[81] واتە: ئەوەی کە ئیحتیکار دەکات - شت هەڵدەگرێ بە مەبەستی گرانبون و بەقیمەتبون، دوایی بە قیمەتێکی گران بیفرۆشێتەوە- ئەوە گوناهبارەو تاوانی کردووە.

پێنجەمیان: بۆ برا شوفێرەکانمان، لەکەسابەتی حەرام بریتی یە لە کەلوپەلی حەرام بارکردن، مادده سڕکەرو بێهۆشکەرەکان، ئەوە کە ئینسانێك شوفێرەو نازانێ چی بارکردووە، ناپرسێ حەلاڵە یان حەرام، مەشروب بێت هەر باری دەکاو مەوادی بێهۆشکەرو سڕکەر بێت هەر باری دەکات، هەتا کەسانێك کە بۆ شوێنی خراپ دەچن، بۆ کاری خراپ دەچن، هەر باریان دەکاو دەیانبات،

[81] صحيح مسلم، كتاب المساقاة، باب: تحريم الإحتكار، رقم الحديث ١٦٠٥

ئەوەش حەرامە، هەموو ئەو گوناهەش کە ئەوانە دەیکەن کە سواری ئەو سەیارەیە دەبن بۆ ئەو شوێنە، لە هەموو گوناهەکان شوفێرەکە بەشدار دەبێت، چونکە ئەو هۆکارەو بردوونی بۆ ئەو شوێنە!، خوای پەروەردگار (جل جلالە) دەفەرموێ: ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَاتَّقُواْ اللّهَ إِنَّ اللّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ (٢) المائدة، واتە: هاوکاری یەکتری بکەن لەسەر چاکەو پارێزی، هاوکاری یەکتری مەکەن لەسەر گوناهو تاوانکاری، کەسێك بۆ کارێکی خراپ دەڕوات بۆ شوێنێك، نابێت بیگەیەنی، کەسێك شتێکی حەرامی پێیە، بۆ شوێنێك دەیبات نابێت بیگەیەنی، ئەگەرنا تۆش لەهەموو قومە مەشروبێکی ئەو کابرای مەشروبخۆرە کە دەیخواتەوە، گوناهبار دەبیت، تۆ گەیاندووتە ئەو شوێنە!، چونکە پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) فەرموی: (لَعَنَ اللهُ الخَمر)[٨٢] واتە: خوا لەعنەتی لە مەشروب -خەمر- کردووە، (وشارِبَها): ئەو کەسەی کە ئەیخواتەوە، (وساقیها): ئەو کەسەی کە دەیگێڕێ بۆ ئەوانەی کە ئەیخۆنەوە، (وبائعها): ئەوەی کە ئەیفرۆشێ، (وَمُبتاعَها): ئەو کەسەی کەپێی دەفرۆشرێ، (وعاصِرها): ئەوەی کە دروستی دەکات، (ومُعتَصِرَها): ئەو کەسەی کە بۆی دروست دەکرێ، (وحامِلَها): ئەوەی کە هەڵیدەگرێ و دەیگوازێتەوە، (والمحمولةُ الیه): وە ئەوەش کەبۆی دەگوازرێتەوەو نەقڵ دەکرێ و لەدوکان دائەنرێ، ئەوانە هەموویان نەعلەتیان لێکراوە.

شەشەمینیان: کڕین و فرۆشتن لە مزگەوت، زۆر جار موعامەلە لەمزگەوت دەکرێ، ئەوەش حەرامە، موعامەلەکردن لەمزگەوت حەرامە، لەسەر ڕای زۆربەی زانایان حەرامە، چونکە پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) فەرموی: (أذا رأیتُم مَن یَبیعُ أو یبتَع في المسجِدِ فَقُل: لا أربَحَ اللهُ تِجارَتَكَ)[٨٣] واتە:

---

[٨٢] المستدرك على الصحيحين، كتاب البيوع، رقم الحديث ٢٢٣٥

[٨٣] المستدرك على الصحيحين، كتاب البيوع، رقم الحديث ٢٣٣٩

ئەگەر بینیتان کەسێك موعامەلە دەکات لەمزگـەوت، شـتێك دەفرۆشـێ یـان شتێك دەکرێ، پێی بڵێن: خوا قازانج نەخاتە نـاو بازرگانیەکـەت و بەرەکـەتی لێهەڵگرێ، دەبێ وای پێبڵێی!، چونکە مزگەوت بـۆ ئـەوە دروسـت نـەکراوە!، هەروەکو چۆن دروست نیە لەمزگەوت بـۆ شـتێك کـە ون بـووە بـانگ بکـرێ، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فـەرموی: (مَـنْ سَـمِعَ رَجُـلاً يَـنْشُدُ ضَـالةً في المَسجِدِ فَلیقُل: لا رادَّها اللهُ الیـكَ)[٨٤] واتە: ئەگەر بینیـتان کەسێك لە مزگـەوت بانگ دەکات، بڵێت فلاڵن شتم لێ ون بووەو خەڵکینە کێ دۆزیویەتیـەوە؟، یـان هـەر کەسـێك دۆزیـەوە بیهێنێتـەوە مزگـەوت، پێـی بڵـێن: یـارەببی خوایـە نەیدۆزیەوە، چونکە مزگەوت بۆ ئەو شتە دروست نەکراوە.

حەوتەمینیـشیان: سـەیارەی دزیـاری و بـێ ژمـارە، کـە ئـەمرۆ زۆرە لـە بازارەکاندا، کڕین و فرۆشتنی پێدەکرێ، کە ئەگەر بزانێ ئەو سەیارەیە ئەصـڵی نیەو بنچینـەی نییە، لـەکوێوە هـاتووە؟ چـۆن هـاتووە؟، ئـەوە بەڕاسـتی ئـەو موعامەلەیە ڕاست نییەو خۆ لەو موعامەلە بپـارێزن چـونکە دروسـت نییـە، مادام نازانێ ئەوە لەکوێ هاتووەو گومـانی لەسـەرە، مـادام نـازانێ ئەصـل و بنچینـەی چییە؟، دروست نیە ئەو سەیارەیە بکڕدرێ و بفرۆشرێ.

هەشتەم لەو موعامەلەو کەسابەتانەی کە دروست نین: فرۆشتنی بـەروبومی کشتوکاڵی پێش ئەوەی بەرەکەی دەرکەوێ، ئینسانێك زەویـەك کـە کردویـەتی بەگەنم بیفرۆشێ بەر لەوەی کە گەنمەکـە بگـاتێ و بزانـێ بەروبومەکـەی دێتـە بەرهەم یان نا، ئەوە حەرامە، تەنها بەمەرجی ئەوە نەبێت کە شینایی و گیا بۆ حەیوانات ببڕێتەوەو بەکاری بهێنـێ، ئـەوە جیایـە یـان فرۆشـتنی بـەروبومی باغێك، کەهێشتا بەروبومەکەی نەهاتۆتەبـەر، نەگـەیوە یـان پـێش گەیـشتن

[٨٤] صحیح مسـلم، کتاب المساجد، باب: النهي عن نشد الظالة في المسجد، رقم الحديث ٥٦٨

نەگەیشتۆتە قۆناغی پێش گەیشتن، نەگیشتۆتە تام وەرگرتن و مزرەمەنی، فرۆشتنی هەر بەروبومێك لەو حاڵەتانەدا، پێش ئەوەی بگاتە ئەو وادەی کە خەریکە دەگاتەبەر، ئەوە دروست نییەو حەرامە، چونکە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بە یەکێکی فەرموو: (أرأيتَ إن مَنَعَ اللهُ الثَّمَرَةَ)[85] ئایا ئەگەر خوای گەورە (جل جلاله) بەروبومی ئەو باخچەیە، بەروبومی ئەو زەویە نەهێنێتە بەرهەم (بِمَ يأخذُ احَدُكُمْ مالَ أخيهِ)؟ فەرموی: باشە بەهۆی چیەوە ئەو پارەیە وەردەگرێ؟، ئەگەر بەروبومەکە خوای گەورە (جل جلاله) نەیهێنێت ئەو پارەیە لەبەرامبەری چیدا لە برایەکەی خۆی وەردەگرێ ؟، کەوابو هەتا بەروبومەکە دیارو روون نەبێت دروست نیە، ئەوە ئەو بەروبومە نابێت بکڕدرێ.

ئینجا کارکردن و نیشتەجێ بوون و مانەوە لەولاتێکی بێ باوەڕو لەولاتی کافراندا، تەنها بۆ ئەوەی کەخۆی و خاو خێزانی لەوێ بێت. لەژێر سایەو سیبەری قانونی کافراندا، ئەوە دروست نیە، بەلاّم لەحاڵەتێکی زەروردا بۆ نەخۆشی دەچێ یان لەحاڵەتێکدا کە دەنێردرێ بۆ جێبەجێکردنی کارێك و بگەڕێتەوە، یان لەحاڵەتێکدا کە بۆ خوێندنێ دەچێ کەئەو خوێندنە لەولاتی ئێمە نییە، بۆ زانست وەدستهێنانێك دەچێ، لەحاڵەتێکدا کە ئێژنەیەکەو دەچێ و مەبەستێکی هەیە، بۆ مەسڵەحەتی میللەتەکەی دەچێ ئەوە جیایە، وە ئەوانەش کە خەڵکی بە قاچاغی دەبەن، پارەیان لێوەردەگرن، ئەو کەسابەتەش دروست نییە چونکە سەفەرەکە مەترسی تێدایەو زۆربەی ئەو خەڵکەشی کە دەڕوا بۆ هەندەران لەوێ سەرگەردان دەبێت!، هەموو ئەو گوناهەی کە خەڵکێك دەیکات لەدەرەوە، ئەو کەسەی کە خەڵك دەبات لێردوە بۆ ئەوێ لەگوناهەکانیان بەشدار دەبێت، چونکە ئەویش هۆکارە بەوە کە ئەو خەڵکە دەڕوا بۆ دەرەوە، ڕێ ئاسانییان بۆ دەکات، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)

---

[85] صحيح البخاري، كتاب البيوع، باب: إذا باع الثمار قبل أن يبدو صلاحها. رقم الحديث ٢٠٨٦

دەفەرموێ: (مَنْ دلَّ على خيرٍ فَلَهُ مِثلُ أجرِ فاعِلهِ)[86] واتە: هەر کەسێك ببێتـە مایەی چاکەیەك، وەکو ئەو کەسەی چاکەکە دەکات خێری بۆ دەچێت، وە هـەر کەسێك ببێتە مایەی خراپەیەك وەکو ئەو کەسەی کە خراپەکە دەکات خراپـەی بۆ دەچێ (کە مفهومی موخالەفەی فەرمودەکە وایە) (مَنْ سَـنَّ سُـنَّةً حَسَنَةً في الإسلامِ فَلَهُ أجرُها وأجرُ مَنْ عَمَلَ بِها من بَعدِهِ من غَيرِ أن يَنقُصَ مِـن أجـورِهِم شَيئاً)[87] واتە: هەر کەسێك کارو ڕێگایـەکی چـاك بەکەسـێك یـان بەخـەڵکێك نیشان بدا، وەکو ئەو کەسانەی چاکە دەکەن خێری بۆ دێت، بەڵام هەر کەسـێك ڕێگایەکی خراپ بەخەڵك نیشان بدا، ئەوە وەکو ئەوانەی خراپە دەکەن ئـەویش گوناهەکەی بۆ دێت.

جا کەسێك ببێتـە ڕێ نیشاندەر بۆ ئەوەی خەڵك ببات بۆ هەنـدەران، خـەڵك لەگەڵ خۆی ببات و لە وڵاتاندا لـەناو خراپـەو خراپـەکاری (فِسق و فجـور) دا بەجێیان بهێڵێ، ئەوە هەموو گوناهێك کەلەوێ دەیکەن ئـەو لێـرە لـە هـەموو گوناهێکیاندا بەشداری دەکات کە هاوکـاری کـردوون، تەنانـەت ئـەو بـاوك و دایکانەش کە پشتگیری کوڕەکانیان دەکەن بڕۆن بۆ ئەوێ ئەو گوناهانە بکـەن، ئەوانیش لەو گوناهانەدا بەشدار دەبن.

خاڵی دەیەم: ئەوانـەی بـەدوای شـتی مەترسـیدار دا دەگـەڕێن، بـۆ نمونـە: وەدەستهێنانی مەوادی تی ئێن تی(TNT) و هەڵگرتنەوەی لوغم و ئەوانە، کە بەمەبەستی پارە پەیدا کـردن بێـت، لەکاتێکـدا چـاکی لێ نـەزانێت، هـەروا لەخۆیەوە بچێتە ناو بابەتەکەو بچێتە ناو کارەکەو لێی نەزانێ مەترسی فەوتانی خۆی و سەرو ماڵی خۆی زیاتر بێت، ئەو کاتە حەرامە ئەو وەزیفەیە بکـات وە ئەو پارەیەش لەو شوێنەدا وەدەست بهێنێت.

[86] صحيح مسلم، كتاب الأمارة، باب: فصل إعانة الغازي..، رقم الحديث ١٨٩٣

[87] المسند المستخرج على صحيح مسلم، كتاب الزكاة، باب: الصدقة ووجوبها، رقم الحديث ٢٢٧٧

خاڵی پانزە: دروستکردنی هەیکەل و موجەسەمات{شێوەکاری} . ئەوەش وەزیفەیەکی حەرامە، جا هی ئینسان بێت یان هی حەیوان، کە بەداخەوە زۆر کەس تەنانەت لەماڵەکانیشدا هەڵیدەواسن، پێشانگاکانیان پێ دەرازێننەوە بۆ جوانی ماڵ و رازاندنەوەی ماڵ، ئەو موجەسەماتانە، ئەو هەیکەلانە، ئەگەر هەیکەلی کەوێکە، کۆترێکە، ئەسپێکە، شتێکە کە لەشوێنێکدا دایدەنێت، بۆ ئەوەی کە ماڵەکەی پێ برازێنێتەوە، ئەوەش حەرامە، ئەوەش کەدروستی دەکات خۆی توشی حەرام دەکات، پێغەمبەریش (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: ئەو کەسەی کە ئەوە دروست دەکات، لە رۆژی قیامەت داوای لێدەکرێت رۆحی بەبەردا بکا بەلآم ناشتوانیٚ!.

زانایان (خوا لێیان رازی بێت) کەلوپەلی یاری پێکردنی منداڵەکانیان جیاکردۆتەوە، کەیاری پێدەکەن لەماڵەوە، بەلآم ئەوەی کە بۆ جوانی لەسەر تاق و دیوار هەڵبواسرێ، ئەوەش دروست نییە؛ دیارە مەبەستیشمان رەسمی فۆتۆگرافی نیە، کە ئەویش هەندێك لەزانایان دەفەرموون هەر حەرامە، بەلآم ئەوە ئیختیلافی تێدایە، هەندێك دەفەرموون کێشەی تێدا نییە، بەلآم رەسمی بەسێبەرو بە هەیکەل، ئەوە دیارە خیلافی تێدا نییەو دروست نییە.

کەسابەتێکی تری حەرام بریتییە لە فرۆشتنی جگەرە، کە زانایان ئەفەرمون: جگەرەکێشان حەرامەو کڕین و فرۆشتنیشی دروست نییە، جا هەندێك کەس ئەگەر عوزر و بیانوو(مبرر) بەوە بۆخۆی بێنێتەوە بڵێ: ئەها مامۆستا فلآن جگەرە دەکێشێ، ئەوە عوزر نییە!، ئەوە دەقی رای زانایان و قسەی زانایان با ئینسان تەماشا بکات، نەك فلآنە مامۆستا لەبەرئەوەی جگەرە دەکێشێ، - حاشای مامۆستایان و زانایانی ئایینی- زۆر مامۆستا هەیە کاری پێچەوانەی دینی خوا ئەنجام ئەدات، بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی ئەو کارە چاکە لەبەرئەوەی مامۆستا دەیکات!، جگەرە هەم زەرەری گیانی ئینسانی تێدایەو هەم زەرەری ماڵی ئینسانی تێدایەو وەهەم زەرەری خەڵکیشی تێدایە، جا چ شتێك کە

پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) زەرەری تێدا بینیبێت بـۆ خـەڵك و بـۆ مـاڵ و منداڵی، قەدەغەی كردووە؟، ئایا ئەگەر ئەو جگەرەیـە لەسـەردەمی پێغەمبـەر (علیه الصلاة والـسـلام) بوویایە قەدەغەی نەدەكرد؟!، ئایا ئەو كەسانەی قەدەغـە نەكرد كە شتی بۆن ناخۆش دەخۆن بێنە مزگەوت؟، مەگەر جگەرە بۆنی ناخۆشتر نیە؟!، لەبەرئەوە موعامەلەكردنیش بەجگەرە، تەنانەت كردنی تـوتن لـە زەوی و زاردا، لەسەر ڕای زۆر لەزانایان دروست نییە، چونكە دروستكردنیەتی و هۆكـارن بۆ ئەو كەسانەی كە جگەرە نەكێشن، پێویـستە خـۆی لێبپـارێزن، پێغەمبـەریش (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: (لا ضَرَرَ ولا ضِرارْ).

خاڵی چواردە: فرۆشتنی شتێك لەسەر فرۆشـتنی كەسـێكی تـر، ئـەوە كـە ئینسـانێك شتێكی فرۆشتووە بەكەسێك، یەكێك بچێ بەوكەسە كڕیارە بڵێ لێـی مەكڕە من بە هەرزانتر دەتـدەمێ، ئـەو موعامەلەیـەش حەرامـە، یـان كـڕین لەسەر كڕینی كەسـێكی تر، ئەوە كە ئینـسـان بـچێ بـە فرۆشـیارەكە بڵـێ كـە شتێكی بەفلانە كەس فرۆشتووە، پێی مەفرۆشە من بە پارەیـەكی باشـتر لێـت دەكڕم، ئەوە هەردوكیان حەرامن، شەریعەتی ئیسـلام بەجوانی ڕونی كردونەتەوە لە دەقەكانی شـەرعدا.

خاڵی شانزە: تۆمارگـاو ڤیـدیۆ خانـەكان بەداخـەوە ئـەمڕۆ زۆریـان دەوری خراپیان هەیە، بۆ بڵاوكردنەوەی فیلمی ڕووت و قوت و بـەرەڵایی و بێئـابڕویی ئافرەتانی ئەوروپا دێنن لێرە بۆمان دەخەنـە ڕوو و دێـنن لەبەرامبـەر منداڵی مسولمانان و عائیلەی مـسولمانان دەخەنـە ڕوو، زۆر كەسـی ڕەوشـت نزمن بەداخەوە كە لەزۆر شوێنان فیلمی خـراپ دەخەنەسـەر سـی دی، بـەڵكو لەدەوروبەر وەربگیرێ و خەڵك تەماشای بكات، بۆخۆی بێ ئەخلاقـەو دەیـەوێ خەڵكیش توشی ڕەوشت نزمی و بێ ئەخلاقی بكات، خـوای پـەروەردگار (جـل جلاله) بۆ ئەو جۆرە كەسـانە سزای داناوە لەدونیاو لەقیامەت، خوا دەفـەرموێ (جل جلاله): ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ الْفَاحِشَةُ فِي الَّـذِينَ آمَنُـوا لَهُـمْ عَـذَابٌ

أَلِيمٌ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ (١٩) النـور، واتـه: ئەوانـەی کەدەیانـەوێ خراپـە لـەناو مـسوڵمانان بلاوبێتـەوە سـزای بـەئێش و بەئازاریان هەیە لەدونیاو لەقیامەت، ریسواییان بۆ هەیـە، رێـزو حورمـەتم بـۆ هەموو ئەو تۆمارگاو هـەموو ئـەو ڤیدیۆخانانـەی کـە کـاری چـاك دەکـەن و لەخزمەتی رەوشتی باش دان، بەلام هەندێکیان بەداخەوە!، لەشارەکاندا دەوریان دەوری خراپە گێرانە، بـەوە کـەفیلمی خـراپ و فیلمـی خیلاعـی و گـۆرانی و هەلپەرکێ و رەقس و سەمای ئافرەتان تۆمار دەکەن و بـەناو خەلکیـدا بـلاوی دەکەنەوە، نازانن هەر نەزەرێك لەهەر ماڵێك هـەر کەسـێك بیکـات گوناهێـك دەگەرێتەوە بۆ ئەو کەسە کە تۆماری کردووە.

خاڵی حەڤدە: وەزیفەی ئافرەتێك یاخود وەزیفەی کاری ئافرەتێك کـە لـەناو شوێنێك دابێت شوێنی ئەو نەبێت، لەناو کۆمەلـە پیـاوێکی خـراپ. وەزیفـەی ئافرەتێکی مـسولمان کە لەدینی خۆی ئەمین نەبێت، لەئەخلاق و رەوشتی خـۆی ئەمین نەبێت، ئەوە شەرعی نییـە، ئـەو موعامەلەیـە یـاخود ئـەو کەسـابەتە شەرعی نییە، وە بەهەمان شێوە پیـاوێکی دینـدار لـەناو کۆمـەلێك ئـافرەتی ســافیرەو بــەرەلا کــارو وەزیفــەو موعامەلەکـەی خـۆی بەرێوەبـەرێ، ئـەو موعامەلەیەش لەو شوێنەدا دروست نییەو پێویستە ئەو پیاوە لەوێ نەبێت.

هەژدەیەم: فرۆشتنی چەك و کەلوپەلی شەر بەکەسانێکی خراپ و ئاژاوەگێر، سیلاح دووسەر (ذوالحدّين)ە بۆ چاکە بـەکاردێ و بـۆ خراپـەش بـەکاردێت، تـۆ خەنجەرێك یان سیلاحێك، چەقۆیەك یان هەر کەلوپـەلێکی تـری شـەر بفرۆشـی بەکەسێك کە خراپەگێر بێ، فیتنەگێر بێت، شەرانگێز بێت، ئەوە حەرامە پێـی دەفرۆشی، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) نەهی لێکردوە.

خاڵی نۆزدەیەم: کرین و فرۆشتن لەکاتی بانگی نوێژی هەینی دا، خوا دەفـەرموێ (جل جلاله): ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِي لِلصَّلَاةِ مِن يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ (٩) الجمعة، واتـه: ئەگـەر بـانگی

نوێژی جومعە درا وەرن بۆ نوێژو کڕین و فرۆشتن بەجێبهێڵن، خـوا دەفـەرموێ (جـل جلاله) ﴿وَذَرُوا الْبَيْعَ﴾: کڕین و فرۆشتن بەجێبهێڵن، بەڵام لەو کاتـەدا کەئینـسانەکان هەر واز لەکڕین و فرۆشتن ناهێنن، ئەوە خۆیـان توشـی حـەڕام کـردوەو لەسـەر ڕای زۆربەی زانایان ئەو موعامەلانە حەرامیان تێدەکەوێ و دروست نین.

خـاڵی بیـست: پـێش لێگـرتن، ئـەوە کـە ئینـسانێك لەهـەولێرەوە بێـت کەلوپەلێکی پێیە بۆ بازاڕی شارەکەمان، کەسێك بێـت لـەدەروازەی شـار یـان پێش ئەوەی بگاتەوە شار ڕێگای پێبگرێت، پێی بڵێ: وەرە مـن بەوەنـدە لێـت دەکڕم!، ئەو کابرای کەدەیهێنێتەوە نازانێ چ باسـە لـەبازاڕی ئێـرەو بەچـەندە، ئەوەش کەلێرە دەڕوا لەسەر ڕێگا لێی دەکڕێ دەزانـێ بەچـەندە، بەقیمـەتێکی هەرزان لێی دەکـڕێ بۆئـەوەی بۆخـۆی بێـت لێـرە لـەبازاڕ بـە قـازانجێکی زۆر بیفرۆشێتەوە، ئەوەش حەرامە.

بیست و یەکەم: (بيع العين)، ئەوەش لەشەرعدا کـە باسـکراوە دەفـەرموێ: جۆرێکە کە کەسێك پێویستی بەپارەیە، پارەشی نییـە شـتی پێبکـڕێ، پارەی نییـە بـۆ ئـەو مەبەسـتەی کـە هەیـەتی بـەکاری بهێنـێ، پارەی پـێ دەوێ، هەڵدەستێ لەمەجلیسێکدا شتێك لەکابرایەك دەکڕێ بـۆ نموونـە بـە دە هـەزار دینار، هەر لەو مەجلیسەدا پێی دەفرۆشێتەوە بەنۆ هەزار دینار، بۆ ئەوەی نـۆ هەزارەکەی وەرگرێ، ئەوەش حەرامە.

بیست و سێهەم و کۆتایی: وەزیفەی کەسێك -پیاو بێت یان ئـافرەت- لەگـەڵ کەسـێکی زاڵـم و سـتەمکاردا، کـەنازانێ ئـەو زاڵـم و سـتەمکارە چ دەکـات، لەگەڵێدایە بەس بۆ مەبەستی پارە وەرگرتن و مووچە، سەری مـانگ مووچـەکەی لێوەردەگرێ و ئیدی لەهەموو گوناهەکانی ئەو ئینسانەشدا کـەزاڵم و سـتەمکارە، خراپەکارە، بەشدار دەبێت، ئەو وەزیفەیەش دروست نییەو شەریعەتی ئیسلام نەهی لێکردووە، ئایەتی قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَرْكَنُواْ إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ النَّـارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ اللّهِ مِنْ أَوْلِيَاء ثُمَّ لاَ تُنصَرُونَ﴾ (١١٣) هود، واتە: مەیل بەلای ئینسـانی زاڵم دا مەکەن، ئەگەرنا ئاگرتان تووش دەبێت.

بەڵێ خۆشەویستەکانم: ئەوانە بیست و سێ حاڵەت و کەسابەت و موعامەلە بوون کە شەریعەتی ئیسلام ڕێگای پێنەداون، نەهی لێکردوون، پێویستە مسوڵمانان دەرسی لێ وەرگرن و لەوانە دوورکەونەوە، وە هەروەها زۆری تر..، وەکو: بەشداریکردن لە یانەسیب کەپارەی ئەداو بەحیسابی خۆی شتی بۆ دەردەچێ، ئەوەش حەرامە، وە زۆرێك کە ئێمە باسی ناکەین لێرە، وەکو فرۆشتنی مەشروبات و کەسابەتی ڕێگری و کۆمەڵێك مەسائیل، فرقەی مۆسیقاو زورنا لێدان و تەپڵی وەشاندن و....هتد.

لەخوای پەروەردگار (جل جلالە) دەپاڕێینەوەو دەڵێین: یارەببی خوایە لەهەموو ئەو کارو موعامەلانە بمانپارێزی کە حەرامن، یارەببی خوایە خۆمان و ماڵ و منداڵمان لەپارەی حەرام و لەماڵی حەرام بپارێزی، یارەببی خوایە خۆمان و ماڵ و منداڵمان وە مسوڵمانان بەگشتی لەحەرام بپارێزی، خوایە بۆ هەرچی حەلاڵە تەوفیقمان بدەی بۆ ئەوەی وەدەستی بێنین، وە هەرچی حەرامە تەوفیقمان بدەی بۆ ئەوەی بیناسین و خۆمانی لێ دوور بگرین، یارەببی خوایە بەماڵی حەلاڵ دەوڵەمەندمان بکەی، یارەببی خوایە بەماڵی حەلاڵ پەروەردەمان بکەی، بمانپارێزی لە پارەی حەرام، لەموعامەلەی حەرام، لەکەسابەتی حەرام، أمین، خوایە شیفای نەخۆشیەکانمان بێنی، خوایە لەمردووی هەموو لایەکمان خۆشبی، ڕەحم بەدایك و باوکمان بکەی، خوایە ڕەحم بەماڵ و منداڵمان بکەی، هیدایەتمان بدەی زیاتر بۆئەوەی بتوانین زیاتر خواپەرستی بکەین، یارب العالمین.

أقول قولي هذا وأستغفر الله لي ولكم ولسائر المسلمين، فاستغفِرُوهُ إنَّه كان غَفَّاراً ،

أعوذ بالله من الشيطان الرجيم

{رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ} أمين.

## سوێندخواردن و شایەدی دانی بەدرۆ

### بسم الله الرحمن الرحيم

إنَّ الحمد لله نحمده ونشكره ونستغفره ونستهديه، ونعوذ بالله من شرور أنفُسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضلَّ له ومن يضلل فلا هادي له ، ونشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له ونشهد أنَّ سيدنا ونبينا محمدا عبده ورسوله، هذا الرسول الذي بلغ الرسالة وأدى الأمانة ونصح الأمة وجاهد في الله حق جهاده وتركنا على الحجة البيضاء، ليلها كنهارها، لايزيغ عنها إلا هالك صلواة الله وسلامه عليه وعلى أله وأصحابه، ومن تبعهم بإحسان الى يوم الدين ...، أما بعد يا عبادالله أوصيكم ونفسي أولاً بتقوى الله وطاعته. فإنَّ اللهَ مع الذين اتقوا والذين هم محسنون، قال الله سبحانه وتعالى في كتابه الحكيم، بسم الله الرحمن الرحيم: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ (١) النساء.

ئیمانداره بەرێزەکان، ئەی ئومەتی پێغەمبەری محمد ﷺ، صەڵات وسەلامی خوای گەورەی لەسەربێ، ڕەحمەت و بەزەیی و میهرەبانی خوای پەروەردگار(جل جلاله) برژێ بەسەر ئێمەو هەموو مسوڵمانانی دونیا لەم ڕۆژە پیرۆزەدا، لەخوای گەورە دەپاڕێینەوە دەڵێین یاڕەببی خوایە ئاخیری عومرمان خێر بکەی، خوایە ئاخیری کردەوەکانمان پێش دەرچوونمان لەدونیادا لەسەر خێر بێ، خوایە بەمسوڵمانی بامرێنی ئەو ڕۆژەی کە ئەجەلمان دێت، خوایە ئێمەش و هەموو مسوڵمانانی دونیا لەناخۆشی و دەردەسەریەکان بپارێزی، لەمردووەکانمان خۆشبی، وە شیفای نەخۆشیەکانمان بێنی، یاڕەببی خوایە ڕەحم بەنەخۆشەکانمان

بكەی، یارەببی خوایە هیدایەتی خۆمان و ماڵ و منداڵمان زیاتر بدەی، خوایە هیدایەتی گەنجەكانمان زیاتر بدەی، رەحم بەپیرەكانمان بكەی، آمین.

بەرێزەكان، ئایینی پیرۆزی ئیسلام دابەش بووە بۆ چەند بەشێك، كە بریتی یە لە عەقیدەو باوەڕ و عیبادەت و خواپەرستی، بەشی سێیەمیان بریتی یە لە ئەخلاق، كە تەواوكەری هەردوو بەشەكەی تریانە كە عەقیدەو عیبادەتەكانن، لەناو عەقیدەدا، وە لەناو عیبادەتدا، وە لەناو بەشی ئەخلاقدا كۆمەڵێك بنەماو بنچینە هەن كە خوای پەروەردگار(جل جلالە) هیدایەتی ئیماندارەكانی داوەو ئینسانەكانی ڕێنمونی كردوون بۆ ئەو بنەمایانە، كە ئەگەر هەر ئینسانێك دەستی پێوە بگرێ ڕێگای سەعادەت دەگرێتەبەرو دەڕوا بۆ بەهەشت!.

هەر ئینسانێكیش فەرامۆشیان بكات ئەوە ئۆباڵەكەی لەملی خۆیەتی و توشی سزا دەبێت، جا ئێمە لە وتاری ئەمڕۆی هەینی دا باس لە دوو خەسڵەت دەكەین لەبەشی ئەخلاق و خوو ڕەوشتدا كە هەردووكیان پێچەوانەی ڕەوشتە چاكەكانن! بەداخەوە ئەمڕۆ لە كۆمەڵگەی كوردەواری خۆماندا دوو دیاردەی ناشرین و خراپ زۆر هەستیان پێدەكرێ، دوو سیفەتی زۆرخراپ لەناو مسوڵمانانندا دەبینرێن، ئەوەی كە خۆشیان لێ دەپارێزێ زۆر كەمە!، ئەو دوو سیفەتە خراپەش یەكێكیان سوێند خواردنە بەدرۆ، دووەمیشیان شاهێدی دانە بەدرۆ، دیارە هەریەك لەمانە گوناهی گەورەن بەڵآم پێش ئەوەی بچینە سەر ئەو دوو خاڵە گرنگە، پێویستە هەندێك شت بزانین:

گومانی تێدا نییە زمان كە نیعمەتی خوایە (جل جلالە) و داویەتی بەئینسان، ئەو زمانەش ئینسانی بۆ بەهەشتێ ڕادەكێشێ یان بۆ جەهەننەمێ!، وەكو زانایەكی عەرەب دەڵێ: (سَلامةُ الإنسانِ في حِفظِ اللِّسانِ) سەلامەتی ئینسانی لە پاراستنی زماندایە، كوردیش وتەنی: زمان بەلآی سەرە!، بەڕاستی زمان بەلآی سەرە لەدونیاشدا زۆرجار وە لە قیامەتیشدا، چونكە زۆركەس بەهۆی زمانەوە لەدونیا توشی بەلآو موصیبەت و كێشەو دەردەسەری دەبێ،

بەهۆی قسەیەکەوە کە لە زمانی دەردەچێ و بیری لێناکاتەوە، کە غەمی بۆ ناخوا، قسەیەك کە دەیکا فکری لێناکاتەوە چ دەڵێ؟، بۆ کێ دەیکا؟، بۆچی دەیڵێ؟، وە لە قیامەتیشدا سەرگەردانی ئەوە دەبێ کە کۆمەڵێك قسەی کردووە لەدونیا لەسەر ئەو قسانە موحاسەبە دەکرێ کە لە قسەکردنەکانی دا ڕەچاوی شەرعی نەکردووە، بە هۆی ئەو قسانەوە کە لە دونیادا کردوونی، ئەو زمانەی لێ بووە بە بەلا لە ڕۆژی قیامەت، درۆی پێ کردووەو غەیبەتی ئەوی کردووەو جوێنی بە ئەو داوەو بوهتانی بۆ ئەو هەڵبەستووە، جاسوسی لەسەر ئەم و ئەو کردووەو قسەی هێناوەو بردووەو نەمیمەی کردوە، شاهێدی بەدرۆی داوەو سوێندی بەدرۆی خواردووەو لەغوی پێکردوە بەو زمانە...!.

ئەو زمانە خێری زۆر پێوەن!، بەلام شەڕیشی زۆر پێوەن!، بۆیە کەسانێك کە زمانیان لەشەڕ ناپارێزن سوود لە خێرەکانیشیان وەرناگرن، وەکو زۆر لە ئایەتەکانی قورئان و زۆر لەفەرمودەکانی پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) دەمانترسێنن و ئاماژە بەوە دەکەن.هەر قسەیەك لەو زمانە دەردەچێ خوا دەینوسێ: ﴿مَا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾ (١٨) ق، واتە: ئینسان هیچ قسەیەك ناکا مەگەر چاودێرێکی بەسەرەوەیەو ئامادەی نووسینە، هەر قسەیەك لە زمان دەرچێ دەینوسێ، خوا ئەفەرموێ موراقیبێکی لەسەرە، جا دەبێ ئینسان ڕۆژێ چەند قسە بکات؟!، مانگێ چەند قسان بکات!، ساڵێ چەند قسان بکات!، لە عومری دا چەند قسەی کردبن!!، ئایا دەبێ چەند قسەی خێری کردبن؟ وە چەندی شەڕی کردبن؟، چەند قسەی باش و چەندی خراپ؟، خۆ ئەگەر خوا ڕەحمان پێ نەکا قەت لەبەر ئەو زمانە ڕزگارمان نابێت!، بۆیە پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) بەیەکێك لەصەحابەکانی فەرموی: (كُفَّ عَنْكَ هـذا)[88]

---

[88] فیض القدیر، جزء ١، صفحة ٤٨٨، یقول الطیبي في شرح حدیث (ولیحفظ البطن وما حوی):
..جعل الرأس وعاء وظرفا لکل ما لا ینبغي من رذائل الأخلاق کالفم والعین والأذن وما یتصل بها وأمر أن یصونها کأنه قیل کف عنك لسانك فلا تنطق به إلا خیرا.

فەرمووی ئەوە(زمان) بپارێزە!، زمانت بپارێزە، سەرکەوتن و نەجاتی تۆ، دوای عیبادەتەکانت بە زمانەوەیە، بەڵام ژێرکەوتنت دوای عیبادەتەکانیش بەهۆی زمانەوەیە ئەگەر لەشەڕ بەکاری بێنی، کەواتە هەرچەندە زمان زۆر کاری چاکەی پێ دەکرێن بەڵام چەندین گوناهیشی پێدەکرێن کە زۆربەیان گوناهی گەورەن.

خۆشەویستەکانم: هەروەکو چۆن پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەمانترسێنێ لەوە کە ئەگەر ئینسان بەڕۆژوو بێ، بەڵام واز لە قسەی خراپ و لە درۆ نەهێنێ ڕۆژووی بۆ قەبوڵ نابێ، هەروەها باقی عیبادەتەکانیش بەهەمان شێوەن، پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: (مَنْ لَم يَدَع قَولَ الزّورِ والعَمَلَ بهِ فَلَيْسَ للهِ حاجةٌ في أن يَدَعَ طَعامَهُ وَشَرابَهُ)[٨٩] واتە: هەرکەسێك واز لەقسەی درۆو زمان شڕی نەهێنێ، خوا پێویستی بەوە نییە ئەوکەسە واز لە خواردن و خواردنەوە بێنێ و خۆی برسی و تینوو بکا، مانای وایە ئەگەر کەسێك بەڕۆژووش بێ، بەڵام زمانی سەلامەت نەبێ، خوا ڕۆژووەکەی لێ وەرناگرێ چونکە دەبێ ئینسان هەموو ئەندامەکانی بەڕۆژو بن، نەك ئینسان هەر مەعیدەی بەڕۆژووبێ لە خواردن و خواردنەوە، بەڵکو دەبێ چاویشت بەڕۆژوو بێ و دەستیشت بەڕۆژوو بێ و قاچەکانیشت بەڕۆژوو بن بۆ شوێنی خراپیان پێ نەڕۆی، وە دڵیشت بەڕۆژوو بێ بەرنامەی خراپی پێ دانەنێی و، وەهەروەها زمان و گوێچکەو هەموو ئەندامەکانی تر..، بۆیە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) ئەفەرموێ: (مَنْ كانَ يؤمِنُ باللهِ واليَوم الاخِرِ فَلْيَقُل خَيْراً أو لِيَصْمُت) واتە: هەر کەسێك باوەڕی بەخواو بە ڕۆژی قیامەت هەیە یان با قسەی خێر بکات یان با بێدەنگ بێ، لەناو کوردەواری خۆماندا ئەگەر کەسێك قسە نەکات یان بێدەنگ بێ سەرزەنشتکراوەو خەڵك ڕقی لێیەتی، دەڵێن ئینسانێکی مۆنە!، بەڵام کەسێك زۆر قسە بکات مەدحی دەکرێ!، شانازی

---

[٨٩] صحيح البخاري، كتاب الصوم، باب: من لم يدع قول الزور، رقم الحديث ١٨٠٤

پێوە دەکرێ دەڵێن مەجلیسی خۆشە!، بەپێچەوانەی ئەو فەرمودەی پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) کە ئەفەرموێ: هەرکەسێك باوەڕی بەخواو بەڕۆژی قیامەت هەیە، باوەڕی بەموحاسەبەی ڕۆژی قیامەت هەیە کە لەسەر هەموو قسەکان لێپێچانەوە هەیە، با یان قسەی خێر بکات یان بێدەنگ بێ، ئینسانیش کەم وایە هەموو کاتێك قسەی خێری بەدەم دابێت!، بۆیە زۆرجار بێدەنگی باشترە لەوە کە ئینسان قسە دەکات و بیری لێناکاتەوە و نازانێ سەرئەنجامەکەی بۆ کوێ دەبێ؟، زۆرن ئەو کەسانەی مەجلیس خۆش دەکەن، شەوانە، ڕۆژانە، خەڵکیان لێ دەئاڵێ بۆ ئەوەی قسەی خۆشیان بۆ بکات، بۆ ئەوەی حیکایەت و سەرگوزەشتەیان بۆ بگێڕێتەوەو فەخرو شانازیشی پێوە دەکات، حیکایەت هەڵدەبەستێ، درۆو دەلەسە هەڵدەبەستێ، پەند هەڵدەبەستێ، کۆمەڵێك قسە هەڵدەبەستێ بۆ ئەوەی خەڵك پێی پێبکەنن؛ ئەو جۆرە کەسانەمان زۆرن، وە ئەوانەشمان زۆرن کە پێیان پێدەکەنن، تەماشاکەن پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (وَيْلٌ لِلذي يُحَدِّثُ بالحديث لِيَضحَكَ بِهِ القَومُ فيَكذِبُ وَيْلٌ لهُ وَيْلٌ لهُ)[٩٠] ئەفەرموێ: (وَيلٌ) کە سزایەکی جەهەننەمە، بۆ ئەو کەسانەی کە قسە دەکەن، حیکایەت دەکەن، لەناو خەڵك دادەنیشن و مەجلیسی بەقسان خۆش دەکەن، بۆئەوەی خەڵکیان پێ پێبکەنێ، لەکاتێکدا قسەکانیان درۆیە، فەرموی: (وَيْلٌ لهُ وَيْلٌ لهُ) سێ جار فەرموی: ئەو شوێنەی جەهەننەم، ئەو عەزابەی جەهەننەم بۆ ئەو کەسەیە کە لەناو خەڵك دائەنیشێ، قسان دەکا، قسەی ڕاست و خراپ تێکەڵ دەکات، حیکایەتی پڕو پوچ و بێسەرو شوێن دەگێڕێتەوە، بەسەرهاتی بێ مەعنا دەگێڕێتەوە، بۆ ئەوەی خەڵکی پێ پێبکەنێ، مەجلیسی پێخۆش کات، وە ئەوانەش کە پێی پێئەکەنن بێگومان

[٩٠] المستدرك على الصحيحين، كتاب الأيمان، رقم الحديث ١٤٢

گوناهبار دەبن و شەریکن لەو تاوانەی کەئەو ئینسانە دەیکات، ئەم فەرمودەیە داوودو ترمذی و نەسائی و بەیهەقی گێڕاویانەتەوە، وە خـوای پـەروەردگار(جـل جلالە) ئەوەندە نەفرینی لە درۆ و درۆزنان کردووە، ئەفـەرموێ: ﴿الا لَعْنَـةُ اللّـهِ عَلَی الْكَاذِبِينَ﴾ (٦١) آل عمران، واتە: ئاگاداربن ئەوانەی کە درۆزنن بێبەشن لە ڕەحمی خوا، لەعنەتی خوا لەوانە بێ کەدرۆ دەکەن، کە درۆزنـن، ئەگـەر ئـەوە حاڵی ئەو کەسانە بێ کە درۆ دەکەن، ئەی دەبێ حاڵی ئەو کەسـانە چـۆن بێـت کەسوێند بەدرۆ دەخۆن!!، دەبێ حاڵی ئەو کەسانە چۆن بـێ کەشـاهێدی بـەدرۆ دەدەن!!، پێش ئەوەی بچینە سەر ئـەو دوو خاڵـەو بەتایبـەت باسـیان بکـەین پێویستە ئەوە بزانین کە سوێند تـەنها بـە نـاو و سـیفەتەکانی خـوا دەخـورێ، بەداخەوە تا ئێستاش خەڵکی ئێمە مسوڵمانانیش هەتا زانایەکانیش بەداخـەوە کە هەندێکیان خۆناپارێزن لە سوێند خواردن بەغەیری خوا!، سوێند یان بەزاتی خوا یان بەسیفەتەکانی، بە (الله)، (الرَّحمن)، (الرَّحیم) جل جلالە، هـەتا نـەوەدو نۆ ناوەکەی..، ئینجا قورئانیش یەکێکـە لەسـیفەتەکانی خـوا، چـونکە وتـەی خوا(کلامُ الله) یە، ئەگەرنا سوێند بە پێغەمبەرﷺ، سوێند بەکەعبە، سـوێند بەسەری شێخ، سوێند بەگۆڕی شەهیدان، سوێند بەسـەری فـلاَن یـان بەسـەری ئەولاد یان بەسەری باوکم، ئەوانە هەمووی حەرامە!، هەمووی ناڕەوا(باطـل)ە، نەك هەر ئینسـان خێری ناگاتێ بەڵکو گوناهی دەگاتێ، حەرامـە، حـەرامێکی کردووە، چونکە هیچ شتێك نایەتە ڕێزی خودای گەورە تا سـوێندی پێبخـورێ، سـوێندن خواردن مانایەکەی ئەوە دەگەیەنێ کەئەو شـتەی سـوێندی پێـدەخۆی، شتێکی گەورەیە، چۆن دەبـێ خـوای پـەروەردگار بێنیـە ڕیـزی مـەخلوقات!!، کەسوێندی پێبخورێ، بۆیـە تـەنها سـوێند بـەخواو بەسـیفەتەکانی دەخـورێ، هەرکەسێك بڵێ بەسـەری پێغەمبـەر (علیـە الـصلاة والـسلام) ئـەوە گونـاهی کردووە!، حەرامێکی کردووە، یـان بەسـەری شـێخ یـان بەسـەری حـاجی یـان

بەسەری کورم یان بەسەری باوکم یان بەگۆڕی شەهید فلانـی، ئەوانـە هـەمووی حەرامە، تەنانەت (کَعبَةُ الله) لەسەر ڕووی زەوی لەهـەموو شـوێنێك پیرۆزتـرە بەلاّم دروست نییە سوێندی پیّ بخوریّ!.

جۆرەکانی سوێند: سوێند چەند جۆرێکن، پێویستە بزانین، پێش ئـەوەی کـە باسی سوێندی بەدرۆ بکەین.یەکـەمیان: سـوێندی (لغـو) هەیـە، کـە زانایـان دەفەرمون ئەوە کە بەسەر زمانی ئینسان دادێت، ئینسان ئاگای لیّ نییە، وەکو کەدەڵیّ: وەلاّ نایەم، وەلاّ ناچم، وەلاّ ناخۆم، ئەوە کە بەسەر زمـانی ئینـسان دا دێت و ئاگای لێنیە، بەدڵ ئیرادەی نەکردووە، ئـەوە سـوێندی (لغـو)ە، خـوای پەروەردگار لێی ناگریّ، خوای پەروەردگار (جل جلاله) دەفەرمویّ: ﴿لاَّ يُؤَاخِذُكُمُ اللّهُ بِاللَّغْوِ فِيَ أَيْمَانِكُمْ وَلَكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ وَاللّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ (٢٢٥) البقرة، واتە: خودا لێتان نـاگریّ کەسـوێندێك بەسـەر زمانتـان دابێـت ئیرادەی دڵی لەگەڵدا نەبیّ و ئاگاتان لێنـەبیّ و تـەنها زمانتـان بیڵـیّ، بـەڵکو سوێندێك حیسابی بۆ دەکریّ کە بەدڵ و مەبەست بخوریّ.

جۆری دووەمی سوێند: سوێندی دامـەزراو(مُنعَقِدة)ی پێـدەڵێن ئـەوە کـە سوێند بەخوا بیّ لەسەر شتێك کەلە داهاتوودا بتەویّ بیکەی یان لەسەر شـتێك کە لە داهاتوودا بتەویّ نەیکەی، ئـەوەش ئەگـەر بیـشکێنی دەبـیّ کـەفارەتی بدەی، ئەگەر سوێندەکەت نەگەیەنیە سەر دەبیّ کـەفارەتی بـدەی، جـا زانایـان دەفەرموون شکاندنی ئەو سوێندە چـوار جـۆری هەیـە: یەکـەمیان: شـکاندنی واجبە، واتە پێویستە سوێندەکە بشکێنی!، ئەوە کە سـوێند بخـۆی بڵێـی ئـەو واجبە جێبەجیّ ناکەم یان ئەو گوناهە دەکەم، ئەوە واجبە سوێندەکەت بشکێنی و کەفارەتیش بدەی! دووەمیان: ئەوەیە کە واجبە بیگەیەنیە سـەرو سـوێندەکە نەشکێنی، ئەوە کەئینسان بڵیّ، وەلاّهی ئەمن نوێژی عـەسر دەبـیّ لـە وەختـی خۆیدا بکەم یان مـانگی ڕەمەزانیّ بەڕۆژوو بم، ئەوە دەبیّ بیبەیـە سـەرو نـابیّ سوێندەکە بشکێنی چونکە عیبادەتەو واجبە، سیّ یەمیان: ئەوەیە کە شکاندنی

باشترە لە گەیاندنە سەری، ئەوە کە ئینسان بڵێ سوێند بەخوا لەگەڵ فلانە کەسی مسوڵماندا قسە ناکەم، ئەوە پێویستە سوێندەکەت بشکێنی چونکە قسە نەکردن لەگەڵ مسوڵماندا گوناهە، بۆیە پێویستە بیشکێنی و کەفارەتیش بدەی، چوارەمیشیان: ئەوەیە کە لەسەر شتێکی ڕێ پێدراو(مُباح) سوێندێ بخوا، بڵێ ئەو خواردنە ناخۆم یان ئەو سەردانە ئەمڕۆ ناکەم، ئەوە بەکەیفی خۆیەتی ئەتوانێ بیشکێنێ و ئەتوانێ بیباتە سەر، ئەو چوار جۆرە سوێندە پێویستە ئەگەر سوێندەکەی شکاند کەفارەتی بدا.

کەفارەتەکەی چی یە؟: خوای پەروەردگار (جل جلاله) دەفەرموێ: ﴿فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ﴾ (٨٩) المائدە، واتە: هەرکەسێك سوێندی خواردو سوێندەکەی نەبردە سەر -سوێندەکەی شکاند- کەفارەتەکەی ئەوەیە یان خواردنی دە کەسی فەقیر بدات، ژەمێك دەکەسی فەقیر بەخواردنێکی گونجاو نان بدا، یان جلێکیان بۆ بکا لەجیاتی خواردنەکە، یان بەندەیەك ئازاد بکات، عەبدێك ئازاد بکات، هەریەکێك لەو سێیانە بەکەیفی خۆیەتی، ئەگەر ئەوانەشی پێنەکرا ئەوە سێ ڕۆژان بەڕۆژوو بێ، لەجیاتی هەر سوێندێك کە خواردوویەتی بەلاّم نەیگەیاندۆتە سەرو دەیەوێ بیشکێنێ.ئایا ئێمەی مسوڵمان چەندە خۆمان پاراستووە لەو سوێندانە!، چەندە سوێندی وا دەخۆین و ئاگاشمان لەکەفارەتەکەی هەر نییە، خۆ ئەگەر ڕۆژێ یەك سوێندمان خواردبێ مانگێ دەکاتە سی(٣٠) ڕۆژ!، ئەگەر هەر ڕۆژێك سێ ڕۆژانی بۆ بەڕۆژوو بین، دەکاتە نەوەد(٩٠) ڕۆژ، واتە مانگێ نەوەد ڕۆژوومان دەکەوێتە سەر کە بەڕۆژوو ببین، ئێمە مانگی ڕەمەزانێمان بەزەحمەت بۆ دەگیرێ، هەتا ڕەمەزان تەواو دەبێ ناڕەحەت دەبین، ئەی بۆچی خۆمان لەو سوێندانە ناپارێزین کە کەفارەتیان لەسەرە؟!، ئەوەندە سوێند دەخۆین و ئەوەندە کەفارەتمان دەکەوێتە سەرێ کە دوایی بەسەرو ماڵمان لێ دەرناچین، بۆیە خوای گەورە ئەو عقوبەیەی داناوە.

خۆشەویستەکانم، جۆری سێیەمیان: کە بابەتی ئێمەیەو بەتایبەتی تـر باسـی دەکەم پێی دەگوترێ (اليَمينُ الغَمُوس) واتە: سوێندی بـەدرۆ کـە خاوەنەکـەی لـە گوناهدا نقوم دەکات، سوێندی بەدرۆ چییە؟ ئەوەیە کـە ئینـسانێك سـوێند بخـوا لەسەر کارێکی ڕابردوو، لەسەر حاڵەتێکی ڕابردوو، بەلاّم درۆی تێدا بکات، ئـەو سوێندەش دیـارە یەکێکـە لەگوناهـە گـەورەکان وەك عـەرەق خواردنـەوە، ئـەو سوێندەی کە وەکو زینا یەکێکە لە گوناهە گەورەکان!، ئەو سـوێندەی کـە وەکـو ڕیبا وایە!، ئەو سوێندەی کە وەکو ڕیا وایە!، ئەو سوێندەی کـە وەکـو خـواردنی ماڵی هەتیوان وایە!، ئەو سوێندەی کە وەکو ڕاکردن لە مەیدانی جەنگ و جیهاد وایە!، ئەو سوێندەی کە لەڕیزی شـەریك بڕیـاردان بۆخـوای پـەروەردگارو قـەتڵی نەفسی حەڕام ڕیزکراوە!، ئەو سوێندەی کە وەکو ئەزیەتدانی باوك و دایك وایـە!، ئەوە سوێندی بەدرۆیە!، لەسەر حاڵەتێکی ڕابردوو وە لەسەر کـارێکی ڕابـردووە، سوێند دەخۆی بەلاّم ئیعتیمادیش لەسەر درۆ دەکەی، سوێندەکەت بەدرۆیە.

بۆیە خۆشەویستەکانم، لە پێغەمبەریان پرسـی ﷺ، فـەرموویان: گوناهـە گەورەکان کامانەن؟، (ئەوە کۆمەڵێك فەرموودە هەیە لەسـەر گونـاهی گـەورە ئێمە لێرەدا هەر ئەو فەرمودە باس دەکەین کە پەیوەندی بـە سـوێند خـواردنی بەدرۆ هەیە)، فەرمووی: (الكَبائرُ اْلاشراكُ بالله وَعقوق الوالِدَين وقَتـلُ الـنَّفس والـيَمينُ الغَمُـوس)[91] ئـەو فەرمودەیـە ئیمـامی بوخـاری ڕیوایـەتی کـردووە، فەرموی: گوناهـە گـەورەکان بـریتین لـە شـەریك بڕیـاردان بۆخـوا -بەهـەمو جۆرەکانیەوە- (کە لەوتارێکی ڕابردوودا باسمان کردووە)، وە ئەزیەتدانی باوك و دایك، ئەزیەتدانی باوك و دایك بە دووەم گوناهی گەورە هـاتووە دوای شـەریك بڕیاردان بۆ خوا!!، بۆیە ئەگەر کەسێك خاوەنی نوێژ بـێ و خـاوەنی ڕۆژو بـێ و

[91] صحيح البخاري، كتاب الأيمان والنذور، باب: اليمين الغموس، رقم الحديث ٦٢٩٨

خاوەنی زەکات و حەجیش بێ بەڵام باوك و دایکی خۆی ئەزیەت دابێ، دەبێ بزانێ کە گوناهێکی گەورەی ئەنجامداوە، بەداخەوە زۆرکەس پێی ئیعتیادیە ئەزیەتی دایك و باوك بدات و گوێ نەداتە رەتی دایك و باوکی و دڵیان، ئەزیەتیان نەدات، بۆیە دەبێ بزانێ کە ئەزیەتدانی دایك و باوك گەورەترە لە زۆر گوناهی دیکەی گەورە.

ئینجا کوشتنی نەفسێك بەناهەق، نەفسێکی مسوڵمان بەناهەق بکوژی ئەوەش گوناهێکی گەورەیە، کە پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) لەریزی ئەوانەدا هێناویەتی، خوای گەورەش (جل جلالە) ئایەتی لەسەر هێناوەتەوەو کە ئەو کەسەی بەناهەق مسوڵمانێك بکوژێ دەچێتە جەهەننەم، وەتێیدا دەمێنێتەوە!، فەرموی گوناهی چوارەمیان: سوێند خواردنی بەدرۆ لەسەر حاڵەتێك یان ئەمرێکی رابردوو، بەڵام درۆبێت کە ئەوە نقومی گوناهی دەکات، ئەوەش بەچەند جۆرێکە بۆئەوەی زیاتر لێی حاڵی بین:

یەکەمیان: مەسەلەی وەکو ئامادەبون و ئامادەنەبون، وەك ئەوەی ئینسان بڵێ: وەڵاهی ئەمن لەفلان شوێنەی لەکاتی روودانی ئەو حادیسەیەدا من ئامادە بووم، لەوێش نەبوبێ، ئەوە پێی دەگوترێ (اليَمينُ الغَمُوس) ئەوەیە کە گوناهی گەورەیەو لەریزی ئەو گوناهە گەورانەدا باسکراوە، بڵێ وەڵاهی من ئامادە بووم لەوێ، بەڵام لەوێش نەبوبێ و درۆ بکات، یان بڵێ وەڵاهی ئەمن لەوێ نەبووم، لەکاتێکدا لەوێ بووبێ یان بڵێ وەڵاهی فلانە کەس لەوێ بوو، لەکاتێکدا لەوێ نەبوبێ، یان وەڵاهی لەوێ نەبوو، لەکاتێکدا لەوێ بوبێ، ئەوانە پێیان دەگوترێ (سوێندی بەدرۆ)، یان لەکرین و فرۆشتندا، بڵێ وەڵاهی بە ئەوەندەم کریوە، کە هەمویان پەیوەندیان بەرابردووەوە هەیە، سوێندی بەدرۆ ئەوە کەپەیوەندی بەرابردووەوە بێت، بڵێ وەڵاهی بەئەوەندەم کریوە، کەچی بە جۆرێکی تر کریبێ، یان بە ئەوەندەم نەکریوە، کەچی بە ئەوەندەی کریبێ، یان فلانە کەس بەئەوەندەی کریوە یان فلانە کەس بەوەندەی نەکریوە، یان

حادیسەیەك ڕوویداوە، بڵێی وەڵاهی بینیم بەو شێوە بوو، بەڵام بەشێوەیەکی تر بووا، ئەوانە هەمووی بەسوێندی بەدرۆ دەژمێـردرێن و گوناهی گەورەن، جا وەسفی کارێك بکات، وەسفی شتێك بکا لەڕابردوو، سوێندی لەسەر بخوا، واش نەبێ، یان بڵێ وەڵاهی ئاگام لەو شتە هەیە، ئاگام لەو شتە هەبوو، بەڵام لەڕاستیدا ئاگاشی لێ نەبوبێ، ئەوەش بێگومان دیارە سوێندی بەدرۆیەو لەگوناهی گەورەیە.

جا خۆشەویستەکانم، ئەو سوێندەی کەگوتمان لەو گوناهانە گەورەترە، وە لەگوناهە گەورەکانە، پێویستە ئێمەی مسوڵمان خۆی لێ بپارێزین، چونکە بەڕاستی جاری وا هەیە سوێندێك کە بەدڵمان دادێت، بەسەر زمانمان دادێت، بەگوناهی گچکەی دەزانین، ماڵوێرانی دونیاو قیامەت دەبین!، قەبری خۆمان پڕ ئاگر دەکەین!، بۆیە دەبێ خۆمان بپارێزین و ئەوانەش کە خۆیانی لێناپارێزن پێیان بڵێین.

مەسەلەیەکی دیکە کە باسی بکەین، بریتییە لە **مەسەلەی شاهێدیدانی بەدرۆ:**

دیارە ئەوەش یەکێکە لەگوناهە گەورەکان، پرسیاریان لە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) کرد لەبارەی گوناهە گەورەکان، فەرمووی: (الشِّرْكُ باللّه، وقَتلُ النَّفس، وَعقوقُ الوالِدَين، وَكانَ مُتَّكِئاً فَجَلَسَ وقالَ الا وَقَولُ الزّورِ وَشَهادَةُ الزّورْ)[92] واتە: لە گوناهە گەورەکان: هاوبەش بڕیاردان بۆخوا، ئەزیەتدانی باوك و دایك، کوشتنی مسوڵمانێك بەناهەق یان کوشتنی خۆت بەناهەق، چونکە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرموی: هەرکەسێك خۆی بەشتێك بکوژێ بەناهەق- کەخۆ کوشتن بێگومان حەرامە- ئەوە بەو شتە لەجەهەنەمدا بەبەردەوامی خۆی دەکوژێتەوە!، جا بەهەرشتێك خۆی کوشتبێ لەدونیا!، وەکو ئەوە وایە کەسێکی مسوڵمانی کوشتبێ، مادام نەفسێکی کوشتووە، نەفسی

[92] صحيح البخاري، كتاب الأدب، باب: عقوق الوالدين، رقم الحديث ٥٦٣١

خۆی بێ یان کەسێکی تر بێت، ئـەوە بێگومـان لەقیامەتـدا ئـاوا پێـی ئـازار دەدرێتەوە، ئەوەش لەگوناهە گەورەکانە.

پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) پاڵی دابۆوە کـە ئـەو سـێیەی ژمـاردن، هەڵسـاوەو دانیـشت فـەرموی: ئاگـاداربن وە قـسەی درۆو شـەهادەتی درۆ، شەهادەت بەدرۆ ئـەوەش لەتاوانـە گەورەکانـە!، ئـەو صـەحابەیە دەفـەرموێ، بەردەوام دوبارەی دەکردەوە ئەو قسەیە هەتا خۆزگـەمان خواسـت دەمـانگوت خۆزگە پێغەمبەر ﷺ بێدەنگ دەبوو!!، هەر دوبارەی دەکـردەوەو دەیفـەرموو: شاهێدی بـەدرۆ، شـاهێدی بـەدرۆ، ئەوەنـدە بەگـەورەی دەزانـی چـەند جـاران دووبارەی کردەوە، هەتا تەئکیدی لەسەر بکاتەوە بۆ مسوڵمانان.

جا شاهێدی بەدرۆ چەند جۆرێکە:

یەکەمیان: ئەوە کە ئینسان بۆخۆی شاهێدی بەدرۆ بدات، دووەمیـان: ئـەوە کە تەئییدی کەسێك بکات کە شاهێدی بەدرۆ ئەدات، ئەوەی یەکـەمیان چـەند حاڵەتێکە:

حاڵەتی یەکەمیان، کە پێناسـەی خەڵکێك دەکات یان لێی دەپرسن سەبارەت بە دووکەس، سـەبارەت بە دوو دێ یان دوو جەماعەت، لێی بپرسن کامە کەس باشترە، فلانە کەست پێ چاکترە یان فلانە کەس، ئەو ئینسانە شـاهێدی بـدات بڵێ فلانە کەسم پێ چاکترە، لەکاتێکدا کە ئەویان خراپتر بێت لەئەوی تر، ئەوە شاهێدی بەدرۆیە، ئەوە کە ئینسان کەسێکی خراپـەکار بـەرز بکاتـەوە بەسـەر کەسێکی چاکەکاردا، کەسێکی گونجاوتر بـە خـەراپتر تەماشـا بکـات بەسـەر کەسێکی خراپەکاردا، ئەوە شاهێدی بەدرۆیە کـە دەشـزانی وانییـە، ئینـسانی مسـوڵمان دەبێ هەق بڵێ، خاوەنی {هەق بێژی} بێت، نابێ دەست بۆ کەسـانی خراپ و خراپەکار لەسینگ بداو بەپیاوی چاك لە قەڵـەمیان بـدا، بۆیـە دەبـێ ئیسلام هەقی داوەتە کێ ئەوکەسەش ئەوە بڵێ، هەتا ئەگـەر خـاوەن کێـشەش بن، دوو کەس خاوەنی کێشە بن یەکیان خاوەن هەق بـێ و ئـەوی تـر خـاوەنی

ناهەق بێ، دەبێ بڵێ ئەوەیان خاوەن هەقەو ئەوەشیان خاوەنی ناهەقە، ئەوەیان ڕاستی کردووەو ئەوەشیان هەڵەی کردووە، ئەگەرنا شاهێدی بەدرۆیە لەسەری ئەگەر بەناهەق و پێچەوانەی هەق شاهێدی یەکە بدات، وە لەسەری بە گوناهە گەورەکان دەنوسرێت.

حاڵەتی دووەم: ئەوەیە کە شاهێدی ئەدات لەسەر شتێك کە ئاگای لێ نییە، پێم خۆشە سەرنج بدەن کە دوو حاڵەت هەیە بەڕاستی بەتایبەتی لە مەحکەمەکاندا خەڵك زۆر تێیدا بەسەهوو چووەو زۆریش تێیدا تاوانبارە!: کەسێك دەچێتە مەحکەمە عەقدی زەواجی هەیە، شاهێدی لەماڵەوە لەگەڵ خۆی نەبردووە، لەوێ داوای شاهێدی لێدەکەن ئەویش هەر لەناو مەحکەمە چاوی خۆی دەگێڕێ و دوو کەسی خزم یان دوو کەسی ناسیار ئەدۆزێتەوەو دەڵێ سلام علیکم و چۆنن چاکن، چاکە ئێوە لێرەن و وەرن کاکە شاهێدیم بۆ بدەن حاڵ و قەزیەیەکی وایە، ئەوانیش بەبێ ئەوەی ئاگایان لێبێ ئەو ئینسانە ژنی هێناوە یان نەیهێناوە، بەبێ ئەوەی بزانن ئەوەی کە لەگەڵی دایە خێزانیەتی یان نا، بەڵێ دەیناسن، بەڵێ لەوانەیە خەڵکی یەك دێ بن، بەڵێ لەوانەیە ناسیارو برادەرو جیرانەتی بیست ساڵیان پێشتر پێکەوە بووبێ، بەلاّم ئێستا نازانن کە ئەوە خێزانیەتی لەگەڵی دایە، یەکسەر دەچن دەڵێن زۆر ئاسانە شاهێدی بۆ ئەدەن کە ئەوە خێزانیەتی و لەگەڵی دایە، ئەوەش یەکێکە لەجۆرەکانی شاهێدی بەدرۆ!، بۆچی؟! بەڵێ سیقەمان بەو کەسە هەیە کە لەگەڵی دا ڕۆیشتووین، لەوانەیە کابرا بڵێ ئەگەر بڵێی کاکە نایێم شاهێدیت بۆنادەم، بڵێ کاکە جا سیقەت بەمن نیە کە ئەوە خێزانمە؟، بەڵێ کاکە من سیقەم پێت هەیە بەلاّم ئەمن نازانم ئەوە خێزانتە یان نا، کێ دەڵێ ئەوە ئافرەتێکی تر نییە؟!، کێ دەڵێ تۆ ژنت هێناوە من نەمزانیوە، لەبەرئەوە با سیقەشم پێت هەبێ، مادام ئاگام لەزەواجی تۆ نییە، مادام ئاگام لە ژن مارەکردن و گواستنەوەی تۆ نییە، مادام ئاگام لێ نییە تۆ ماڵی خۆت داناوەو خاوەن خێزانی نایێم

شاهێدیت بۆ نادەم، با براشم بێ، چونکە شاهێدییەکەت لەسەر حاڵەتێکە کە ئاگام لێ نیە، زانیاریم دەربارەی نییە، شاهێدی چیم پێدەدەی؟!، بڵێم چی؟! بڵێم ئەوە خێزانیەتی ئاگاشم لێی نییە!، چۆن دەبێ شتی وا؟! لەکاتێکدا هی وا هەیە شارو مەملەکەتێکیشیان لەیەك جیاوازە، بەڵام هەر لەبەرئەوەی ناسیاریەتی شاهێدی بۆ ئەدات، ئەوە حەرامەو دروست نییە، ئەوە شاهێدی بەدرۆیە ئەگەر بێ عیلم شاهێدی بۆ بدا، ئەوە جۆرێکە لەشاهێدیەکان.

جۆرێکی تر هەر لەو شوێنانەدا بەدی دەکرێ، ئەوە کە کابرایەك کێشەیەکی هەیە لەگەڵ کەسێك، یان دەیەوێ زەویەکەی تاپۆ بکات یان خانووەکەی تاپۆ بکات، یان کێشەکەی لەگەڵ کەسێك ببڕێنێتەوە، پێویستی بەدوو شاهێدان هەیە، دێتە دەرەوە دوو کەسان دەکات بەشاهێد، ئەوانەش بەبێ عیلم لەسەر سیقەی کابرا دەچن شاهێدی بۆ ئەدەن یان لەوە خراپتر بەپارە دەچن شاهێدی بۆ ئەدەن، نازانن هەقە یان ناهەقە!!، بەڵام پارەی لێوەردەگرن و شاهێدیەکی بەناهەقیش دەدەن، ئەو پارەش وەردەگرن، نازانن بەو پارەیە خۆیان ماڵویران دەکەن لەقیامەت.

بەڵێ خۆشەویستەکانم: حاڵەتێکی تر ئەوە کە ئینسان بچێ شاهێدی بدا لەسەر بابەتێك کە زانیاری دەربارەی نەبێت یان زانیاری دەربارەی هەیە بەڵام بە ئەنقەست ناهەق دەکات بەهەق، وە هەقیش دەکات بەناهەق!، دوو کەس بەشەڕ هاتوون، مەحکەمەیان دەکرێ، یەکیان دوو شاهێدان دەبا یان ئەوی تریان دوو شاهێدان دێنێ، ئەو شاهیدانە بەناهەقەکەی دەڵێن هەقە، بە هەقەکەش دەڵێن ناهەقە!، یان ئاگاشیان لێ نییە بەڵام شاهێدییەکەی ئەدەن و یەکیان بەهەق دەزانن و ئەوی تریش بەناهەق دەزانن!، ئەوە بێگومان هەموویان لەو بەشە دائەنرێن کە (شَهادَةَ الزّورْ)ە، کە گوناهی گەورەن.

خۆشەویستەکانم، جۆری دووەمیان: ئەوە کە ئینسان تەئییدی کەسێك بکات شاهێدی بەدرۆ بدات، کەسێك لە مەجلیسێك دانیشتووە شاهێدی بەدرۆ

ئەدات، باسی بابەتێکی ڕابردوو دەکات، لەناکاو ئاوڕێك ئەداتەوە بەلای چەپ و بەلای ڕاست و دەڵێ فلانەکەس وانەبوو؟، ئەویش بەبێ ئەوەی بزانێ وابوو یان وانەبوو، دەڵێ: بەڵێ وابوو!، ئەو بەڵێ یە شاهێدی بەدرۆیە لەسەر بابەتێك کە ئاگای لێ نییە، تەئیید کردنی کەسێکە کە شاهێدی بەدرۆ ئەدات، جا ئەگەر شاهێدی بەدرۆشی نەبێ، بەلام ئەو ئاگای لێنەبێ بۆ ئەو هەر دەبێتە شاهێدی بەدرۆ!، چونکە با ئەوەی کە قسە دەکات ئاگاشی لێبێ و شاهێدیەکەی بەدرۆ نەبێ، بەلام ئەوەی کە ڕاستەوخۆ دەڵێ بەڵێ وایەو ئاگاشی لێ نییە، ئەوە بۆی دەبێتە شاهێدی بەدرۆ!، ئایا چەند کەسمان ئێمە لە مەجلیسەکان کە دائەنیشین و خەڵکێك قسان دەکاو قسە دەگێڕێتەوەو لەفلان کارەساتێك وابوو لەفلان شوێنەی یان لە سەفەری فلانی وابوو، لەفلان بابەتەی وابوو، لەناکاو ئاوڕێك دەداتەوەو دەڵێ، وانەبوو فلانەکەس؟، کەگوایە ئەویش لەسەفەری لەگەڵی دابووە، لەکێشەکەی لەگەڵی دابووە، خۆ لەوانەیە لەگەڵی دابووبێ بەلام ئاگاداری بابەتەکەی نەبێ، بۆیە دەڵێ بەڵێ وابوو!، ئەو بەڵێ یە گوناهە و زۆری لەسەر حیسابە!، ئەو بەڵێ یە قەبری پڕ لەئاگر دەکات ئەگەر ئاگای لێنەبێ و ئەگەر شاهێدیەکەی لەسەر نەزانین بێت!، ئەو بەڵێ یە ئاسان نییە!، وشەیەکە بەلام (شَهادَةُ الزّورْ)ە!، بەلام ئەو گوناهەیە کە خوای پەروەردگار (جل جلالە) مەنعی کردوەو وەسفی مسوڵمانان بەوە دەکات کە خۆیان لەو گوناهە دەپارێزن، دەفەرموێ ﴿وَالَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ الزُّورَ وَإِذَا مَرُّوا بِاللَّغْوِ مَرُّوا كِرَامًا﴾ (٧٢) الفرقان، واتە: مسوڵمانی ڕاستەقینە ئەوەیە کەشاهێدی بەدرۆ نادات و ئەوەی کەدەیڵێ هەقە، ئەگەر شتێك ئاگای لێنەبێ قسەی لەسەر ناکات.

بەڵێ خۆشەویستەکانم، حاڵەتێکی تریشی هەر لە شاهێدی ناڕاستەوخۆ ئەوەیە، کەوا تەئیدی کەسێك دەکات کە شاهێدی بەدرۆ ئەدات، سەری بۆ دەلەقێنێ، زۆرجار لە مەجلیسێك پیاوێك قسەیەك دەکات، قسە دەگێڕێتەوە بۆ مەجلیسێك، ئەوی بەرامبەریشی سەری بۆ دەلەقێنێ!، کەئەنەما تۆ ڕاست

دەکەی، فکری لێنەکردۆتەوە ئەوە تەئیدە!، مانای وایە فلان کەس ڕاست دەکات، ئەوە ڕازیبونێکی ئیقراریە!، چۆن لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) سوننەتی پێغەمبەر سێ جۆرە: یان گوفتاری(قولی)یە، یان ڕەفتاری(فعلی)یە، یان ئاماژەیی(إقرار)یە، واتە پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) سێ جۆر سوننەتی هەیە، قسەیەك کەخۆی فەرمویێتی ئەوە سوننەتە، ئیشێك کەخۆی کردبێتی و صەحابەکان تەماشایان کردبێ ئەوە سوننەتە، شتێك کە لەبەر چاوی ئەودا کرابێ و بێدەنگی لێکردبێ، ئەوە سوننەتی ئیقراریەو ئیقرار پێکردنەو پێ ڕازیبونە، جا تۆ کە کەسێك قسە دەکات لەمەجلیسێ و سەری بۆ دەلەقێنێ مانای وایە پێی ڕازی، جا ئەگەر گوناهبێ لەگوناهەکەی بەشداری، ئەگەر ڕاستیش بێ لە ڕاستیەکەی و لەخێرەکەی بەشداری.

خۆشەویستەکانم، بۆیە ئەوانە هەمووی حیساباتیان لەسەرە، سوێندی بەدرۆ، شاهێدی بەدرۆ، پێویستە خۆمانی لێبپارێزین، لەگوناهە گەورەکانیشن کەبەداخەوە زۆرجار کەمتەرخەمیمان کردووە لەو قەزیانەدا، بەتایبەتی لە مەسەلەی شاهێدیداندا، بۆیە دەڵێین: ئەگەر کەسێك داوای شاهێدی لێکردی بۆ هەر بابەتێك، با نزیکترین کەسیشت بێ، یا خۆشەویسترین کەسیشت بێت، ئەگەر ئاگات لە بابەتەکەی نەبوو، مەچۆ لەگەڵی دا شاهێدی بۆ مەدە با لێت عاجز بێت بەڵام خوا لێت تورە نەبێت، چونکە ئاگات لەقەزیەیەك نەبێت شاهێدی بۆ بدەی، شاهێدی لەسەر بدەی، ئەوە شاهێدی بەدرۆیە.

هەر بۆ ترساندنمان لەوە پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) دەفەرموێ: (لَنْ تَزولَ قَدَمَ شاهِدَ الزُّورِ حتّى يوجِب اللّهُ لهُ النّار)[٩٣] دەفەرموێ: ڕۆژی قیامەت ئەو کەسەی کە لەدونیایێ شاهێدی بەدرۆ داوە پێی لەمەیدانی مەحشەرێ لاناچن دوای زیندوبوونەوە، هەتا خوای گەورە ئاگری بۆ واجب نەکات!، دەبێ بە ئەندازەی ئەو

[٩٣] سنن ابن ماجة، كتاب الأحكام، باب: شهادة الزور، رقم الحديث ٢٣٧٣

تاوانە ئاگر بچێژێ، چونکە هەقی کردوە بەناهەق!، ئینسانێك هەق بکا بەناهەق، سزای جەهەننەمە، پیاوی چاك بەخراپ لەقەڵەم داو پیاوی خراپ بەچاك لەقەڵەم بدا، دەست بۆ پیاوی خراپ لەسینگی بدا، بڵێ تۆ پیاوی چاکی و ناوریش لەپیاوی چاك و فەقیر نەداتەوە، ئەوە جەزاکەیەتی!، شاهێدی بەدرۆ بدا لەسەر ئەوە کەتاگای لەبابەتێك نەبووە، عیلم و خەبەری بەشتێك نەبووە، بۆخۆی بۆ ڕەزابونی خەڵکێك بۆ وەدەستهێنانیماڵی دونیا، بۆ وەدەستهێنانی مەنسەب و مەکسەبێك، شاهێدی بەدرۆ ئەدات، ئەوە جەزاکەیەتی!.

جا کۆتایی وتارەکەم بەفەرمودەیەکی پێغەمبەر ﷺ دەهێنم کە تاکە ڕێگای نەجاتی ئێمەی ئینسانی مسوڵمان تەنها لەوە دایە، وەگەیشتنمان بەمەنزڵی هەتا هەتایی لای ڕەزابونی خوای گەورە (جل جلالە) کە بەهەشتە تەنها ئەوەیە!، ئەوە کە زمانمان بپارێزین لەدرۆ، لە ناڕاستی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (انا زَعيمٌ ببيتٍ في وَسَطِ الجنّةِ لِمَنْ تَرَكَ الكذبَ وهو مازح)[٩٤]

فەرموی: من کەفیلی ئەوەم، زامنی قەسرێکی ناوەڕاستی بەهەشتم بۆ ئەو کەسانەی لەبەر خاتری خوا زمانی خۆیان لەدرۆ دەپارێزن با بەگاڵتەش بێت!، واتە درۆی بەگاڵتەش نابێت، جا بائێمەش زمانی خۆمان بپارێزین، کە زمان پاراستنمان دەبێتە مایەی پاراستنی سەرمان، پاراستنی سیمامان، پاراستنی سومعەمان لەدونیاشدا، وە دەمانگەیەنێ بە بەختەوەری قیامەت و ڕەزابونی خوای پەروەردگار (جل جلالە).

یاڕەببی خوایە ڕاستیمان پێببەخشی، یاڕەببی خوایە (صدق و صفا)مان پێببەخشی، خوایە لەدرۆ بمانپارێزی، لە بوهتان بمانپارێزی، لەغەیبەت بمانپارێزی، لەجاسوسی بمانپارێزی، لەقسە هێنان و بردن بمانپارێزی، لەشاهێدیدانی بەدرۆ بمانپارێزی، لەسوێند خواردنی بەدرۆ بمانپارێزی، خوایە لەجوێن و قسەی خراپ

---

[٩٤] معجم الأوسط للطبراني، باب: من اسمه ابراهيم، رقم الحديث ٨٧٨

بمانپارێزی، یارەببی خوایە ئێمەو هەموو مسوڵمانانی دونیا، یارەببی خوایە هیدایەتی ماڵ و منداڵمان بدەی، خوایە شیفای نەخۆشیەکانمان بێنی، یارەببی خوایە عاقیبەتی عومرمان خێر بکەی، خوایە ژیانی هەموو مسوڵمانان لەدونیا لە دەردەسەری و بەلاو نەگبەتی و نارەحەتی بپارێزی، یارەببی خوایە بەمسوڵمانی بمانژێنی، وە بەمسوڵمانی بمانمرێنی، ئامین.

أقول قولي هذا وأستغفر الله لي ولكم ولسائر المسلمين، فاستغفِرُوهُ إنَّه كان غَفَّاراً ،

أعوذ بالله من الشيطان الرجيم

{رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ} أمين.

# نیشانه بچووکەکانی قیامەت

## (١)

### بسم الله الرحمن الرحيم

إنَّ الحمد لله نحمده ونشكره ونستغفره ونستهديه، ونعوذ بالله من شرور أنفُسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضلَّ له ومن يضلل فلا هادي له ، ونشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له ونشهد أنَّ سيدنا ونبينا محمداً عبده ورسوله، هذا الرسول الذي بلغ الرسالة وأدى الأمانة ونصح الأمة وجاهد في الله حق جهاده وتركنا على الحجة البيضاء، ليلها كنهارها، لايزيغ عنها إلا هالِك صلواة الله وسلامه عليه وعلى أله وأصحابه، ومن تبعهم باحسان الى يوم الدين ...، أما بعد يا عبادالله أوصيكم ونفسي أولاً بتقوى الله وطاعته، فإنّ اللهَ مع الذين اتقوا والذين هم محسنون، قال الله سبحانه وتعالى في كتابه الحكيم، بسم الله الرحمن الرحيم: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ (١) النساء.

برایانی بەڕێز، مسوڵمانانی خۆشەویست، شوێنکەوتوانی پێغەمبەری پێشەوا حەزرەتی محمد المصطفى ﷺ، ئەمڕۆ لە ڕۆژگاری ژیانی ئادەمیزاد دا، لەبەر مەشغەڵەت و خەریك بوونمان بە كاروباری ژیانی دونیا، خەریك بوونمان بەكۆكردنەوەی سامان و بەكاروباری ماڵ و منداڵ و كێشەو گرفتەكانی دونیا وپێداویستییەكانی دونیا زۆر شتی گرنگمان لەبیر چۆتەوە!، زۆر شتی نادیارو غەیب كە چاوەڕێمان دەكات ئاگامان لێی نیە، بەداخەوە!، ئێمەی ئینسان بێ ئاگاین لەڕووداوی ترسناك، لەڕووداوی گەورە كە ڕۆژ بە ڕۆژ لێی نزیك دەبینەوە.

یەكێك لەوڕووداوە گەورانە تێكچوونی دونیایە، كە ئێمە ئاگامان لێی نیە، نازانین و بیری لێناكەینەوە، ئەم دونیایە تەمەنێكی هەیە، سەرەتاو كۆتاییێكی

هەیە، ئەو دونیایە هەروانابێ، ئەو سەیارەو قەسرو پارەو سەروەت و سامان و ماڵ و منداڵ و خزم و عەشیرەت و هەموو ئەو پێداویستیانەی ژیان هەر بەردەوام نابن، ڕۆژێك دێ ئەو دونیایە تێك دەچێ، ئەو دونیایە نامێنێ، خوای پەروەردگار پێمان دەفەرموێ: ﴿اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مُّعْرِضُونَ﴾ (١) الأنبياء، حیسابی خەڵك نزیك بۆتەوە، ئەو خەڵکەش غافڵە، ئەو خەڵکە بێ ئاگایەو نازانێ و بێ خەبەرە، (مُّعْرِضُونَ): پشتیان لە ئیسلام کردووە، پشتیان لە دینی خوا کردووە، بێ خەبەر لەوەی حیسابیان زۆر نزیکە!.

بەڕێزان دیارە ژیانی دونیا کۆتایی هەیە، قیامەتمان لە پێشە، حیسابمان لەپێشە، ئەو ژیانەی دونیا هەروەکو خۆی نابێ ڕۆژێك دێ ئەو دونیایە تێك دەچێ و عومری تەواو دەبێ، ئاسمانەکانیش دەپێچرێنەوە، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ نَطْوِي السَّمَاء كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُ﴾ (١٠٤) الأنبياء: ئاسمانەکان دەپێچینەوە وەکو سیجلی کتاب، ئەو ئەرزەش نامێنێ، ئەو چیاو دەشت و بەرو بەحرە نامێنێ، ئەو ئینسانە نامێنێ، ڕۆژێك دێ خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿لِّمَنِ الْمُلْكُ الْيَوْمَ﴾ (١٦) غافر، ئەو موڵکە هی کێیە؟!، کەس نییە وەڵام بداتەوە!!، هەر خۆی دەفەرموێت: ﴿لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ﴾ (١٦) غافر، تەنها بۆخوایەکی خاوەن دەستەڵاتە، ئاسمانەکان و زەوی کەسی تێدا نامێنێ، بێجگە لە خوا (جل جلالە)، مەلائیکەتەکانیش نامێنن!، ئینسان و جنۆکە هیچیان نامێنن، جا بابزانین ئەو ڕووداوە گەورەیە لە پێشمانە، چاوەڕێمان دەکات، نازانین بەیانی یە یا مانگێکی تر، یا ساڵێکی ترە، یا دەساڵی تر، یا هەزار ساڵ و زیاتر لەوە..، بەڕێزان، هاتنی قیامەت کۆمەڵێك نیشانەی هەن، نیشانەی گەورە، وە نیشانەی بچوك، بە ئیزنی خوای پەروەردگار، لەوتاری ئەمڕۆدا هەندێ لە نیشانەکانی- دونیا تێکچوون و- قیامەت باس دەکەین، نیشانە بچوکەکان، وە خوا پشتیوان بێ لە دوو وتاراندا نیشانە بچوکەکانی قیامەت تەواو دەکەین و، ئەگەر خوا عومر بداو باقی بێ،

لە وتـارێکی تریـشدا دەچـینە خزمـەتی نیـشانە گـەورەکانی ڕۆژی قیامـەت، بۆئەوەی هەنـدێ بێداربینـەوە، هەنـدێك ئاگامـان لـە خۆمـان بـێ، هەنـدێك وشیاربینەوە و بـزانین قیامـەتمان لـە پێـشە، قیامـەت نزیـك بـووە، هەنـدێك عەلاماتی قیامـەت هـاتوون و بەسەرچـوون ئاگامـان لێیـان نیـە!، بـەکورتی بەسەریاندا تێدەپەڕین بزانین ئەو عەلاماتە گچکانە چین، کەهاتوون و تێپـەڕیون یان نەهاتوون و ئێستا چاوەڕێمان دەکەن.

خۆشەویستەکانم، یەکێ لە نیـشانە بـچووکەکان هـاتنی پێغەمبـەرە ﷺ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (بُعِثتُ أنا والسَّاعَةَ كَهاتَين)[٩٥] فـەرمووی: مـن و قیامەت ئاوا بەیەکەوە هاتووین، (وَضمَّ اصبُعَيه السَّبابَة والوسطَى): هـەردوو پەنجـەکانی شـایەتمان و پەنجـەی ناوەراسـتی بەیەکـەوەنان و فـەرمووی: مـن و قیامەت ئاوا بەیە کەوە هاتووین- بەجووت-، کەوابوو قیامەت ، لەگەڵ هاتنی پێغەمبەرەﷺ و زۆر نزیکە، چونکە پێغەمبەری ئاخیر زەمانـە، دونیـا نـاخیر زەمانیەتی، ئێمە ئاگامان لێی نیە، ئـەوە لـە فەرموودەیەکـدا کـە موسـلیم و بوخاری ڕیوایەتیان کـردووە، خۆشەویـستەکانم: لەپێغەمبـەرﷺ دەپرسـن: بـۆ پێناکەنی؟، فەرمووی چۆن پێبکەنم تەماشائەکەم ئەو فریشتەیەی دانـراوە فـوو بکا بە کەرەنادا بۆ دونیا تێکچوون کە مـەئمووری خـوای پـەروەردگارە، ئـاوا دەمی پێوە ناوەو، چاوی بەرز کردۆتەوەو تەماشائەکات کەی خوای پەروەردگار فەرمانی پێدەدات!، ئاوا قیامەت نزیکە لەگەڵ هاتنی پێەمبەرﷺ!!.

دووە میان: لە عەلامەتە بچووکەکان، وەفاتی پێغـەمبەرەﷺ، ئەوەشیان لە فەرموودەیەکی صەحیح دا کەفەرمووی: (ياعَوفَ ابنُ ماكِ احفظ خلالاً ستاً بَين يَدَيّ السَّاعة احداهُن مَوتي)[٩٦]، فەرمووی: ئەی عەوفی کـوڕی مالیـك، شـەش شتان بزانە لەبەریان بکەو ئاگات لێیان بێ پێش ئەوەی قیامەت بێ ئەو شەشـە

[٩٥] صحيح البخاري، كتاب التفسير، باب: تفسير سورة (والنازعات)، رقم الحديث ٤٦٥
[٩٦] صحيح ابن حبان، باب: ذكر الأخبار عن فتح المسلمين ببيت المقدس، رقم الحديث ٦٦٧٥

دێنەپیش و ڕوودەدەن، یەکێ لەوانە مردنی منە، بەڵێ هاتنی پێغەمبەر ﷺ لەنیشانەکانی قیامەتە، وە وەفاتی پێغەمبەریش ﷺ لە نیشانەکانی قیامەتە!.

سێیەمینیان: فەتحکردنی {بیتُ المَقدَّس}، کە پێغەمبەرﷺ لەدرێژەی فەرموودەکەدا فەرمووی: (ثُمَّ فَتحُ بَیتِ المَقدَّس) فەرمووی: -لەپاش مردنی من- فەتح کردنی {بیتُ المَقدَّس}ـە، کەبەڵێ لەساڵی ١٨ کۆچیدا عومەری کوڕی خطاب {خوالێی ڕازیبێ} فەتحی کردووە، بەڵێ ئەوە سێ لەنیشانەکانی بچووك لەنیشانەکانی ڕۆژی قیامەت هاتوون و تێپەڕیوون.

چوارەم: نیشانە لەنیشانە بچووکەکانی ڕۆژی قیامەت، پەیدابوونی کەسانێکن کە بەدرۆ خۆیان دەکەنە پێغەمبەر، خۆیان دەکەنە نێردراوی خوا، کە پێغەمبەر ﷺلە حەدیسێکی صەحیحدا کە ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی دەکا دەفەرمووێ: (لاتَقُومُ السَّاعَة حَتَّي یبعَثُ الدَّجالون كَذَّابون، قریبٌ مِن ثَلاثین، كُلُّهُم یَزعُمُ أنَّه رسولُ الله)[97]، نەفەرمووێ: قیامەت دانایێ هەتا نزیکەی سی(٣٠) کەس پەیدا نەبن کە هەموویان دەجالن و زۆر درۆزنن، ئەوانە نزیکەی سی کەس دەبن لە هەر زەمەنێکدا یەکە یە کە پەیدادەبن و، ئەوانە هەریەکەیان پێیان وایە پێغەمبەری خوایە، بەڵێ هەرلەدوای پێغەمبەر ﷺ موسەیلەمەی کذاب پەیدابوو کەپێی وابوو پێغەمبەری خوایە، هەتا ئەبوبەکری صدیق {خوالێی ڕازیبێ} جەنگی لەگەڵ کردن، بەڵێ دوای ئەوەش زۆرێتر پەیدابووە، دەکرێ بڵێین لەو جۆرە کەسانە زۆرێکیان هاتوون و زۆرێکیشیان ماون!.

خۆشەویستەکانم: نیشانەی پێنجەم ئەوەیە: ئوممەتی ئیسلام پارچە پارچە دەبێ، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (سَتفترَق أُمَّتي على ثَلاثَة وَسَبعینَ فِرقَة كُلُّهُم في النَّار إلاَّ واحداً)[98]، فەرمووی: ئوممەتی من پارچە پارچە دەبێ دەبێتە حەفتاو

---

[97] صحیح البخاري کتاب الفتن، باب: خروج النار..، رقم الحدیث ٦٧٠٤

[98] معجم الأوسط للطبراني، باب: من اسمه محمود، رقم الحدیث ٧٨٤٠

سێ (٧٣) فیرقە، هەموویان بۆ دۆزەخن تەنها یەکیان نەبێ، فەرموویان ئەی پێغەمبەری خوا ئەو فیرقەی کەدەچێ بۆبەهەشت کێیە ؟، ئەو حەفتاو دووەی کە دەچن بۆ دۆزەخ، ئەوانە ناتوانین لەبەر بکەین، بەلاّم بابزانین ئەوەیان کامەیە کەدەچێ بۆبەهەشت !! فەرمووی: (... مَا أنـا عَلَيـهِ وأَصحابي): ئەوانە ئەو کەسانەن لەسەر ئەو ڕێیەن کە من و هاوەڵەکانم لەسەرین، ئەوانە دەچن بۆ بەهەشت!، فیرقە بەو مانایە نایێ کۆمەڵ کۆمەڵ، فیرقە بەمانای بیرو بۆ چوون دێ، بۆیە دەبێ ئێمە بزانین ڕەوشت و ڕێبازی پێغەمبەرﷺچۆن بووە، ڕەوشتی ئەصحابە بەڕێزەکان چۆن بووەو دەستیان پێوە بگرین، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ( عَلَيكُم بِسُنَّتي وَسُنَّةِ الخُلَفاءِ الرَّاشِدينَ المَهدِيِّين)[٩٩] : ناگاتان لەسوننەتەکانی من و ڕێ و شوێنی من بێ، وە ناگاتان لەڕێ و شوێنی خەلیفەکانی ڕاشیدین بێ، (عَضُّوا عَلَيها بِالنَّواجِذ): بەددانەکانتان چاك بیگرن.

برابەڕێزەکان، مسوڵمانانی خۆشەویست: ڕزگاربوونی ئینسان لەدونیاو لە قیامەت ، بەگرتنی ڕیبازی پێغەمبەرە ﷺ، ڕێو شوێنی پێغەمبەر ون مەکەن، (مَن أحيى سُنَّتي فَقَد أَحَبَّني)[١٠٠]، فەرمووی هەرکەسێك سوننەتی من زیندووکاتەوە لەوەختێکا کەدەمرێ، ئەوا منی خۆشدەوێ: (وَمَن أَحَبَّني كانَ مَعِيَ فِي الجَنَّة)، هەرکەسێکیش منی خۆش بوێ لەگەڵ مندایە لەبەهەشت،

---

[٩٩] المستدرك على الصحيحين، كتاب العلم، رقم الحديث ٣٢٩

[١٠٠] ((حدثنا مسلم بن حاتم الانصاري، قال: حدثنا محمد بن عبدالله الانصاري، عن أبيه: عن علي بن زيد، عن سعيد بن المسيب، قال: قال أنس بن مالك: قال لي رسول الله (صلي الله عليه وسلم): ((يا بُنيَ إن قَدَرتَ أن تُصبِحَ وَ تُمسِيَ لَيسَ فِي قلبِكَ غِشٌ لاحَدِ فافعَل)) ثُمَ قال لي:((يا بُنيَ وذالك من سُنتي، ومَن أحيا سُنَتي فَقَد أحبَنِي ومَن أحبَنِي كانَ مَعِيَ فِي الجَنة))، وفي الحديث قصة طويلة، هذا حديث حسن غريب من هذا الوجه وضعفه الالباني.

سنن الترمذي، كتاب العلم عن رسول الله (صلي الله عليه وسلم)، باب: ما جاء في الاخذ بالسُنة واجتناب البدع، صفحة ٦٠٣، رقم الحديث ٢٦٧٨.

جائەگەر دەمانەوێ بچینە بەهەشت، دەبێ پێغەمبەرمانﷺ خۆش بوێ!، بۆئەوەی بزانین پێغەمبەرمان خۆش دەوێ یاننا !! دەبێ شوێن پێیەکانی هەڵگرین، سوننەتەکانی جێ بەجێ کەین، بۆئەوەی ڕاست کەین کە پێغەمبەرمان خۆش دەوێ، بەڵێ فەرمووی: (كُلُّ أُمَّتي يَدخُلُونَ الجَنَّةَ إلاَّ مَن أبى)[١٠١]، هەموو ئوممەتی من دەچێتە بەهەشتێ تەنها کەسێك نەبێ کە ڕێگر(مانع) دەبێ!! ، فەرموویان: (ومَن يَأبى يَارَسول الله؟) ، کێ هەیە مانع بێ ئەی پێغەمبەری خوا؟؟ فەرمووی: (مَن أطاعَني دَخَلَ الجَنَّةَ وَمَن عَصاني فَقَد أبى): کەسێك گوێ ڕایەڵی من بکا دەچێتە بەهەشت، وەکەسێکیش گوێ ڕایەڵی من نەکا ئەوەیە مانع دەبێ!، جا با گوێڕایەڵی پێغەمبەر بکەین ﷺ، کەڕۆژی قیامەت دڵسۆزی ئەوپێغەمبەرە خۆشەویستە بۆ ئێمە دەردەکەوێ، کاتێك کە قیامەت دادێ هەموو ئینسانێك ڕاست دەبێتەوە لەمەیدانی مەحشەر، هاواردەکا (نفسي .. نفسي): ئەی هاوار بۆخۆم، ئەی هاوار بۆخۆم!، تەنها پێغەمبەر نەبێ ﷺ، کەزیندوو دەبێتەوە هاواردەکا (أُمَّتي .. أُمَّتي): ئوممەتی خۆم، ئوممەتی خۆم..، ئەگەر نا هەموو ئینسانەکان بۆخۆیان هاواردەکەن، ئەوە ڕەحم و بەزەیی پێغەمبەرە ﷺ بۆ ئوممەتەکەی، بەلام ئوممەتەکەی زۆر بێ ئاگایە!، ئێمە زۆر بێ ئاگاین، زۆر غافڵین، زۆر دوورین لەڕەوشتەکانی پێغەمبەرﷺ، زۆر دوورین لەسوننەتی پێغەمبەرەوەﷺ، ئەگەر نیزیك بین دەبێ لێی لانەدەین و خۆشەویستمان ئەوبێ، بەڵێ خۆشەویستەکانم، دەبێ وریابین سوننەتی پێغەمبەر ﷺبەرنەدەین.

---

[١٠١] صحيح البخاري، كتاب الأعتصام بالكتاب والسنة، باب: الأقتداء بسنن رسول الله، رقم الحديث ٦٨٥٢

خاڵی شەشەم: کوشتنی بەبێ هۆ زۆر دەبێ!، خەڵك زۆر دەکوژرێ و نازانێ هۆکار(سبب) چییە!، گوێ بگرن لە فەرموودەی پێغەمبەرﷺ کە بوخاری ریوایەتی کردووە، فەرمووی: (وَالذي نَفسِي بِيَدِهِ لا تَذهَبُ الدُّنيا حَتَّي يَأتي عَلَى النَّاسِ يَومٌ لايَدري القاتِلُ فِيمَ قَتَل وَلايَدري المَقتُولُ فيم قُتِل)[102]، فەرمووی سوێندم بەوزاتەی گیانی منی بەدەستە، دونیا ناڕوات هەتا ڕۆژێك بەسەر خەڵکدا نەیێت قاتل نازانێ کەسێکی لەبەرچی کوشتووە!، وەکابرای کوژراویش نازانێ لەبەرچی کوژراوە!، دەبێت ئەورۆژە بێت!، ئەورۆژەش ئەتوانین بڵێین ئێستایە کە زۆرکەس خەڵك دەکوژێ نازانێ لەبەرچی دەیکوژێ، ئەگەر لەبەر پارە دەیکوژێ زۆر هەرزانە، وائەزانی چۆلەکەیەکی کوشتووە!، ئەگەر لەبەر مەسڵەحەتێکی دونیا بێ، ئەگەر لەبەر هەواو هەوەسی خۆی بێ، ئەگەر لەبەر هەر مەبەست وغەرەزێك بێ، خەڵك کوشتن زۆر ئاسان بووە!، بەڵێ خۆشەویستەکانم ئەوەش یەکێکە لە عەلاماتی قیامەت.

حەوتەمیان: زەمەن نزیك دەبێتەوە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّي يَتَقارَبُ الزَّمانُ فَتَكُونُ السَّنةُ كالشَّهرِ، والشَّهرُ كالجُمعةِ، والجُمعةُ كَاليَوم)[103]، فەرمووی: قیامەت دانایێ، هەتا وای لێ نەیێ زەمانەکان لێك نزیك دەبنەوە، بەجۆرێك ساڵ وەکومانگی لێدێ، مانگ وەکو جومعەی لێدێ، جومعە وەکو ڕۆژێکی لێدێ، زۆرچاك دیقەت بگرن و فکری لێ بکەنەوە، ئێستاش دەبینین زۆرجاران کە تەماشائەکەین ساڵ زۆر بەسەریعی دەڕوات، جومعە زۆر بەسەریعی دەڕوات، هەروادەکەین دەڵێین جومعە هاتەوە، هەروادەکەین دەڵێین فلانەکەس عومری پانزەساڵە، پانزە ساڵە لە فلانە شوێنەیە، یان ئەوەندەساڵە ماڵی لە فلانە شوێنەیە، یان تەماشادەکەین ڕۆژ

---

[102] صحيح المسلم، كتاب الفتن، باب: لاتقوم الساعة حتى يمر الرجل بقبر الرجل، رقم الحديث ٢٩٠٨

[103] سنن الترمذي، كتاب الزهد، باب: ماجاء في تقارب الزمان، رقم الحديث ٢٣٣٢

بەسەریعی دەگاتە ئێوارە، یـان تەماشـادەکەین گەنجـەکان زوو ریـشیان سـپی دەبێ!، سەریان سپی دەبێ!، ئەوە هەمووی لە عەلاماتی قیامەتە، زەمـەن زۆر سەریع بووە، زەمەن زۆر زۆر بەردو پـێش دەچـێ و ئێمـە ئاگامـان لێـی نیـە، هەروادەکەین کابرا پیردەبێ، وادەکەی کابرا ساڵێك تەواو دەکات، هەروادەکـەی کابرا دەگاتەوە جومعەی داهاتوو و ئاگای لێی نیە و وا چاوەڕێی دەکات، ئـەوە لەلایەك..، لەلایەکی دیکەشەوە هەنـدێك لەوانـەی شـەرحی حـەدیس دەکـەن دەڵێن: ئەو مانایەشی هەیە کە زەمەن لەیەك نزیکدەبێتەوە واتە ئـەوەی جـاران بە ساڵێك دەکرا ئێستا بە مانگێك یان زۆر کەمتر دەکرێ، عیلم و تەکنـەلۆژیا پێشکەوتووە، فڕۆکەو ئەنتەرنێت و مۆبایل و دەیان شتی دیکە شـتەکان نزیـك دەکەنەوەو زەمەن کورتبۆتەوە .

بەڵێ خۆشەویستەکانم، نیشانەی هەشتەم لەنیشانە بچووکەکانی قیامـەت: دونیا بەدین وەردەگیرێ، دیـن بـەدونیا دەفرۆشـرێ، ئینـسان ئامادەیـە دونیـا وەدەست بێنێ دینی لەپێناو دابنێ، ئـەوە کـە پێغەمبـەرمان ﷺ فـەرمووی: لەپێش هاتنی ڕۆژی قیامەت هەندێك شت دەبن، (فِتَنٌ كَقِطَعِ اللَّيـلِ المُظلِـم)[١٠٤] کۆمەڵێك فیتنە و ئاشووب و موسیبەت پەیدادەبن وەکو شـەوی تاریـك وان - ئەوەندە ڕەشن-، ئەو فیتنانە ئەوەندەگـەوردن، ئەوەنـدە ئـاڵۆزن، وەکـو شـەوی تاریك وان، (يُصبِحُ الرَّجل فِيها مُؤمنا ويُمسِي كـافِرا)[١٠٥]: کابرا بـەیانی لەخـەو هەڵدەستێ مسوڵمانە ئێوارێ کافرە!، زەمانێکی وادێ، بەیانی هەڵدەستێ لەخەو مسوڵمانە ئێوارێ کافرە، ئەوەندە ئامادەیـە دیـنی خـۆی لەسـەردونیا دابـنێ!، بەیانی کەهەڵدەستێتەوە بە شـایەتمان هەڵدەسـتێتەوە، کـە لەخـەو هەڵدەسـتێ {بسم الله}دەکات، بـەڵام کاتێـك کەدەچـێتە بـەروبازاڕ، کاتێـك کەدەچـێتە

---

[١٠٤] هي قطعة من الحديث: سنن الترمذي، كتاب الفتن، باب: ستكون فتن كقطع الليل، رقم الحديث٢١٩٧

[١٠٥] المستدرك على الصحيحين، ذكر الضحاك بن قيس، رقم الحديث ٦٢٣٤.

مەیدانی ئیش وکار، کاتێك کەدەچێتە ناو خەڵك، لەبەر دونیا دینی لەیاد نامێنێ، ئامادەیە لەپێناوی وەدەست هێنانی دونیا و ڕەزابوونی هەواو هەوەسی نەفسی خۆی ئەودینەی خۆی بەقوربان کات، بەڵێ (يَبيع أقوامٌ دينَهم بِعرض مِن الدُّنيا القليل)[١٠٦]، ئەفەرموێ: هەندێك لە قەومەکان- هەندێك لەخەڵك- دینی خۆیان بەبەشێك لەدونیا دەفرۆشن، ئەمڕۆ دەتوانین بڵێین جۆرێك لەوخەڵکانە هەن و هاتوون، زۆرن ئەوکەسانەی کەدینی خۆیان لەپێناوی دونیادا دادەنێن و دینی خۆیان دەفرۆشن.

بەڵێ خۆشەویستەکانم: نیشانەی نۆیەم لەنیشانەکانی قیامەت: عیلمی دین لەلای کەسانی کەم تەمەن و گەنج دەست دەکەوێت، ئەوە یەکێکە لەعەلاماتی قیامەت، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (إنَّ مِن أشراط السَّاعَة أن يُلتَمس العِلمَ عِندَ الأَصاغِر)[١٠٧] فەرمووی: یەکێك لەعەلاماتی قیامەت ئەوەیە عیلمی دین لەلای کەسانی گەنج و کەم تەمەن دەست دەکەوێت، بەڵێ ئینسانی گەنج خۆشەویستی خوایە ئەگەر بگەڕێتەوە سەردین، بگەڕێتەوە لای خوا، بگەڕێتەوە لای ئیسلام، مێشکی سافە، چاك دین وەردەگرێ!، ئەوە یەکێکە لە عەلاماتی قیامەت کەگەنجەکان بەرەو ئیسلام دەگەڕێنەوە، بەرەو مزگەوت دەگەڕێنەوە، عیلم و زانستی ئیسلامەتی پەیدا دەکەن.

نیشانەی دەیەم: حوکم و فەرمانڕەوایی دەکەوێتە دەستی کەسانی ناشیاو، بەڵێ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (إذا وُسِّدَ الأمرُ الى غَيرِ أهلِه فانتَظِروا السَّاعَة)[١٠٨] فەرمووی: کاتێك بەڕێوەبردنی کاروبارو فەرمانڕەوایەتی درایە غەیری ئەهلی خۆی ئەوا چاوەڕێی قیامەت بکەن.

---

[١٠٦] المستدرك على الصحيحين، كتاب الفتن والملاحم، رقم الحديث ٨٣٥٤ و ٨٣٥٥

[١٠٧] المعجم الكبير للطبراني، أبو أمية اللخمي، رقم الحديث ٩٠٨

[١٠٨] صحيح البخاري، كتاب العلم، باب: من سئل علماً وهو مشتغل في حديثه، رقم الحديث ٥٩

بەرِێزان، یەکێکی تر لە عەلاماتەکانی قیامەت: زیناو داوێن پیسی زۆر دەبێت، بەشێوەیەك کە پێغەمبەرﷺ لەفەرموودەیەکدا کە ئیمامی بوخاری ریوایەتی کردووە دەفەرموێت: (إنَّ مِن أشراطِ السَّاعَةِ): لەعەلاماتی قیامەتە: ... -کۆمەڵێك شت دەژمێرێ- ، دوایی دەفەرموێ: (وَيَظهَرَالزِّنا)[109]، زینا زۆر دەبێت، زینا ئاشکرا دەبێت، بە ئاشکرا زینا دەکرێت!!، زینا بەعەیب دەرناچێت و بەعەیب تەماشا ناکرێت، ئانەوەش ئێستا لەولاّتانی رۆژئاوا دەبینین چەندە دەوڵەتان -ئەمریکا بەتایبەتی- چەندە تووشی ئەو نەخۆشیانە دەبن کە بەهۆی زیناوە پەیدابووە، نەخۆشی (ئایدز)[110]، کەئامادەیە هەمووسەروەت و سامانی لەپێناوی ئەوە دانێ کەئەم نەخۆشیە بنەبڕ بکات، بەلاّم! ناتوانێت، ئەو نەخۆشیەی کەلەداوێن پیسی بلاّو دەبێتەوەو لەیەکتری دەگرنەوە.

بەڵێ خۆشەویستەکانم، نیشانەی دوانزە: ئافرەتان خۆیان روت و قووت دەکەن، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (صِنفانِ مِن أهلِ النَّارِ لَم أرهُما)[111]، فەرمووی: دوو صنف -پۆل- هەن، لەئەهلی دۆزەخن من نەمبینیون: (صِنفٌ بِيَدِهِم سِياطٌ كَأذنابِ البَقَرِ يَضرِبُونَ بِهاالنَّاس ونِساءٌكاسِياتٌ عارِياتٌ مائِلاتٌ مُمِيلاتٌ رؤوسُهُنَّ كَأسنِمَةِ البُختِ المائِلَةِ لايَدخُلنَّ الجَنَّةَ ولايَجِدنَ رِيحَها)، فەرمووی: کۆمەڵێك ئافرەت پەیدا دەبن جلیان لەبەردایەو لەبەردانیە!، جلیان پۆشیوە بەلاّم رووتن!، (كاسِياتٌ): جلیان پۆشیوە، (عارِيات): بەلاّم رووتن، یەعنی چی؟! یەعنی یا زۆر تەنکە، لەشی لەناودا دیارە، یازۆر تەنگە و جەستەی بۆ یەك دەهێنێتەوە، جەستەی لەناودا دەردەکەوێ، بەڵێ، لەنجەو لار دەکەن، لە پێش چاوی گەنجەکان لەنجەو لاردەکەن، لەپێش چاوی پیاوەکان، بۆ ئەوەی سەرنجیان راکێشن، (رؤوسُهُنَّ كَأسنِمَةِ البُختِ المائِلَةِ)، پرچی سەریان وەکو بەرزایی سەر

---

[109] صحيح البخاري، كتاب العلم، باب: رفع العلم وظهور الجهل، رقم الحديث ٨٠ و ٨١

[110] کۆ نیشانەی کەمیی بەرگری وەدەستهاتوو (AIDS) : Acquired Immune deficiency syndrome

[111] صحيح المسلم، كتاب الأشربة، باب: النساء الكاسيات، رقم الحديث ٢١٢٨

پشتی حوشتر وایە، پرچی سەریان دەرازێننەوە، دەیکەنە پۆپکە، (لایَـدخُلنَ الجَنَّـة ولایَجِدنَ ریحَها): ئەوانە ناچنە بەهەشت، (ولایجدن ریحهـا): وە بـۆنی بەهەشـتیش ناکەن!، جا دەبێ خوشکانی ئێمە لـەوە زۆر ئاگـاداربن، خوشـکی وامـان هەیـە طـاعـەت و عیبادەتیشی هەیە بەلاَم جلی زۆر تەنك لەبەر دەکات!، یان جلـی زۆر تـەنگ لەبـەر دەکـات: بۆسـەفەری، بۆمـالّی دراوسـێی، بۆمـالّی خزمـەکانی، بۆدەرچوونی بۆ ئەو شوێنانەی کەرێگای پێدەدرێت کەبڕوات، دەبێـت وشـیاربێ و ئاگاداربێت نەوەك بەر هەڕەشەی پێغەمبەرﷺ بکەوێت!.

نیـشانەی سـیانزەهەم: سـیلەی ڕەحـم نامێنێـت!، خـەڵك ڕقـی لەیـەکتر دەبێتەوە، هاتوچۆی خزمایەتی نامێنێ، ئەو عیلاقە کۆمەلاَیەتی یەی لـەنێوان خزمەکان و دراوسێیەکانە نامێنێت، خزمی واهەیـە پێـی ناخۆشـە خزمەکـەی بەسالّ هاتوچۆی بکات!، پێی ناخۆشە کـەس بێتـەمالّیان، جـا ڕق و قینـە زۆر دەبێ، کینەو بـوغز زۆر دەبێـت، وەك پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: (مِـن اشـراطِ السَّاعَة الفُحْش والتَّفَحُّش وقَطیعَة الرَّحم)[112]، فەرمووی: خراپەو خراپـەکاری -داوێن پیسـی-، وەخەراپە بەزمان و خەراپە بە کردەوە لەعەلاماتی قیامەتە: وە یەکێك لەوانە فەرمووی: وە قەتعی سـیلەی ڕەحـم، سـیلەی ڕەحـم دەپـچڕێ و نامێنێت، بێ ڕەحمی دروست دەبێت لەنێوان خەلّکەکەدا.

نیـشانەی چـواردەم: ئینـسان خۆزگـە بـەمردن دەخوازێـت، یـەکێك لـە عەلاماتەکان ئەوەیە، ئینسان بەسەر قەبری یەکێکدا تێدەپەڕێ و دەلّێ خۆزگـە لە جێگای تۆ بوومایە!، ئـەو فەرموودەیـەی کـە ئیمـامی(مـسلم و بوخـاری) ڕیوایەتیان کردووە و دەفەرموێت: (لاتَقوم السَاعَة، حَتى یَمرالرَجـل بقَـبر الرَجـل فَیقول یالَیتَنی مَکانَهُ)[113]: قیامەت دانایێ، تا پیـاو بەسـەر قـەبری پیاوێکـدا

[112] المستدرك على الصحيحين، كتاب الأيمان، رقم الحديث ٥٥٣

[113] صحيح البخاري، كتاب الفتن، باب: لاتقوم الساعة حتى يغبط، رقم الحديث ٦٦٩٨

ئەرواو ئەڵێ خۆزگە لەجێگای تۆ بوومایە!، کابرا دەڵێ خۆزگە من بام لە جێگای تۆ، بۆچی؟! لەبەرئەوەی فیتنە زۆردەبێت، لەبەر ئەوەی موسیبەت زۆر دەبن لە دیندا، لەبەر ئەوەی ناخۆشی و نارەحەتی زۆردەبن، کابرا ئەمەنای مردنێ دەکاو ئەمەنای ژیان ناکات.

عەلامەتی پانزە: قەسرو بینایەی بەرز بەرز دروست دەکرێن، بەڵێ پێغەمبەرﷺ لە وەلامی حەزرەتی جوبرائیلدا، کەپرسیاری لێکرد، عەلامەتی قیامەتێ چین؟ فەرمووی: (أن تَرى الحُفاةَ العُراةَ العَالِ رِعاةَ الشاة يَتَطاوَلُونَ في البُنيانِ)[114]، فەرمووی: یەکێك لەعەلاماتەکانی قیامەت ئەوەیە، کەسانی شوان و کەسانی فەقیرو هەژارو خاوەن عائیلە کە زۆر فەقیر بوون، لەئاخیری زەماندا، دەست بە دروست کردنی بینایەو قەسری بەرز بەرز دەکەن، تەماشا ئەکەین هیچی نەبووە لەناکاو قەسری گەورە گەورە دروست دەکات، زۆر هەژارو دەست کورت بووە، لەناکاو لەخۆی بایی دەبێ، یا هەرکەسێکی تر کەبەهۆی قەسرو بینایەوە، بەهۆی عیمارەو بینایەی بەرز بەرزەوە، لەخوا یاخی دەبێ و دینی لەبیر دەچێتەوە، بەڵێ دروست کردنی قەسری گەورە گەورەو بەرز یەکێکە لە عەلاماتی قیامەت.

خۆشەویستەکانم، عەلامەتی شانزەهەم: باران زۆردەبێ و بەرەکەت نامێنێ، تەماشای حەدیسی پێغەمبەر بکەن ﷺ فەرمووی: (لا تَقومُ السَّاعة، حَتَّى يُمطَرالنَّاس مَطَراً عامّاً ولاتُنبِتُ الأرضُ شَيئاً)[115]، ئەو حەدیسە کە ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ڕیوایەتی دەکات، دەفەرموێت: قیامەت دانایێ هەتا بارانی زۆر نەبارێ بەسەر خەڵکیدا، وە ئەرزیش هیچ شین ناکات، هیچ ناڕوێنێ، بارانی زۆر دەبارێ بەلاَم ئەرز ناڕوێنێ، لە سەردەمی خۆشماندا ئەگەر دیقەت

---

[114] صحيح المسلم، كتاب الأيمان، باب: بيان الأيمان والإسلام، رقم الحديث ٨

[115] مسند أحمد بن حنبل، جزء ٣، صفحة ١٤٠، مسند أبي سعيد الخدري، رقم الحديث١٢٤٥٢

دەبین و تێ بفکرین، دەزانین لە زۆرێك لەولاتان بارانی زۆر دەبارێ و لافاو(فَیضان) هەڵدەستێ، شاری واهەیە بن ئاو دەکەوێ، هەمووشمان ئاگادارین کە چەند ساڵێك باران لێرانە نەدەباری بەلاّم لەشوێنیکی وەکو مۆزەمبیق یا لە شیمالی ئەمریکا یا لەشەرقی ئاسیا، لەوشوێنانە تەماشامان دەکرد، شوێن واهەبوو بەشار بەبن ئاوێ دەکەوت!، ئەوە خێرو بێری ولاّتیش ناهێڵێ ئەوبارانە چونکە ئەو بارانە بارانی بەرەکەت نی یە؛ یەکێکە لە عەلاماتی قیامەت کەباران دەبارێ بەلاّم ئیقتصادی ولاّت زیاد ناکات و بەڵکو وێرانی دەکات، ماڵیش وێران دەکات، گژو گیاش هەمووی وەبن خۆڵ و قوڕێ دەخات لەبەر ئەوەی ئەو بارانە بارانی ئاسایی نیە.

**نیشانەی حەڤدەهەم:** کەسانی فاسق و بێ دین خۆشەویست دەبن و مەدحیان دەکرێت لەناو کۆمەڵگادا، ئەها پێغەمبەرﷺ لەفەرموودەیەکی صەحیحدا کە ئیمامی مسلم و بوخاری ڕیوایەتیان کردووە دەفەرموێت: (فَیُصبِحُ النَّاس حَتَّى یُقالُ لِلرَّجل مَا اجلَده، ما اظفَره، ما اعقَله وما في قَلبِه مثقال حَبَّة من خَردل من إیمان)[116] دەفەرموێ: بەئینسانی دەگوترێ چەندە پیاوی باشە!، چەند بەشان و شەوکەتە!، چەند زیرەك و چاونەترسە!، چەند ئینسانی باشە!، لەکاتێکیشدا ئەو ئینسانە تۆسقاڵێك ئیمانی لەدڵدا نییەو ئاواش مەدحی دەکرێت.

**عەلامەتی هەژدە:** ئەمانەت نامێنێ و خیانەت زۆر دەبێ، ئەوە کە بەجۆرێك پێغەمبەرﷺ لەحەدیسێکدا کە (الشیخان: مسلم و بخاری) ڕیوایەتیان کردووە دەفەرموێت: (فَیُصبِح النَّاس یَتَابعون لایَکادُ أحَد یُؤدِّ الأَمانَةَ حتَّى یُقالَ انَّ فِي بَني فُلان رَجل اَمین)[117]، ئەفەرموێت: وای لێدێ خەڵك

---

[116] صحیح المسلم، کتاب الأیمان، باب: رفع الأمانة، رقم الحدیث ١٤٣

[117] صحیح البخاري، کتاب الرقاق، باب: رفع الأمانة، رقم الحدیث ٦١٣٢

دەگەڕێ تەماشا نەکات کەسێك نابینێتەوە ئەمانەت بپارێزێ و ئەمانەتی لەلا دابنێ، هەتا وای لێدێ دەگوترێ لە تیرەو بنەماڵەی فلانی یان لە شاری فلانی یان لە عەشیرەتی فلانی فلانەکەسی (ئەمین) هەیە!، (حتَّى يُقالَ انَّ في بَني فُلانة رجل اَمين) لە بنەماڵەی فلانی یا لە تیرو هۆزی فلانی پیاوێکی ئەمین هەیە، وای لێدێ خیانەت ناوا زۆر دەبێ، بۆیە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (إنَّ مِن أشراطِ السَّاعَة وتخوين الأمين وإئتِمان الخائن)[118]، ئەفەرموێت لەعەلاماتی قیامەت کۆمەڵێك شت هەن یەك لەوانە ئەوەیە کە ئینسانی ئەمین بە خائین دادەنرێت وە ئینسانی خائینیش بە ئەمین دائەنرێ، بۆیە بەڕاستی ئێستاش زۆر شت ئالەوجۆرە بەچاوی خۆمان دەبینین.

بەڵێ عەلامەتی نۆزدە -کە عەلامەتی کۆتاییە لەم خوتبەیەدا باسی بکەین-: ڕیبا زۆر دەبێ، ئەو ڕیبایەی کەئێستا لەبازارەکانی دونیا بۆتە شتێکی ئاسایی. ئەگەر لە وڵاتی خۆماندا هەندێك پرسیار بکرێ مسوڵمانان بێن پرسیاربکەن، ڕیبا چۆنەو چ شتێك ڕیبایەو چۆن پارە دەبێت بە ڕیبا، لای مامۆستایانی ئابینی، بەڵام لەشوێنان کەس لەوە ناپرسێ، بە سەدان هەزار بانکی ڕیبا هەیە حیساباتی دونیا هەمووی ئێستا لەسەر کاروباری ڕیبایە، فرۆشتن و کڕینی بەڕیبا و جۆرێك ڕیبایە لە موعامەلەدا، بۆیە پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەیەکدا کە ئیمامی طبرانی ڕیوایەتی کردووە فەرمووی: (بَينَ يَدي السَّاعَةِ يَظهرُالرِّبا والزِّنا والخَمر)[119]، فەرمووی: لەپێش قیامەتیدا ڕیباو زیناو خواردنەوەی عەرەق زۆر دەبێ، یەکێك لە عەلاماتەکانی قیامەت ئەوەیە ڕیبا زۆردەبێ، ئەو ڕیبایەی پێغەمبەرﷺ دەمانترسێنێ لە فەرموودەیەکدا کەفەرمووی: گچکەترین بەشی ڕیبا وەك ئەوە وایە کە پیاوێك زینا لەگەل

[118] معجم الأوسط للطبراني، باب: من اسمه إبراهيم، رقم الحديث ١٣٥٦

[119] المعجم الأوسط للطبراني، باب: من اسمه محمد، رقم الحديث ٧٦٩٥

دایکی خۆی بکات!، ئائەوەندە گەورەیە ئەو ڕیبایەی ئێستا خەڵك خۆی لێنا پارێزێ!، پرسیاری لێناکات ئەو خاوەن قەرزانە ئەو خەڵکەی کە پارە بە قەرز ئەدا لە موقابیلدا قازانجێك بۆ خاوەن پارەکە دەگەڕێتەوە لەپارەکە، ئەوە ڕیبایە، برایانی بەڕێز، مسوڵمانان، پێویستە لەوەدا پرسیار لەمامۆستایان بکەن، قاعیدەیەکی فقهی هەیە ئەفەرمووێت: {كُلُّ قَرض جَرَّ مَنفَعةً فَهُوَ رِبا}: هەر قەرزێك مەنفەعەتێك بۆ خاوەنەکەی ڕابکێشێت ئەوە ڕیبایە، جگە لەو پارەی بەقەرزی ئەدەی، هەرشتێکی تری زیادە لەسەری وەرگری ئەوە ڕیبایە، بۆیە پێویستە خۆتی لێ بپارێزی برای بەڕێزو خۆشەویستم.

جائێمە لەو وتاری ئەمڕۆدا ئیکتیفا دەکەین بەوکۆمەڵە نیشانە بچوکانەی ڕۆژی قیامەت، بەپشتیوانی خوای پەروەردگار لە وتاری داهاتوودا کۆمەڵێکی تر لە نیشانە بچووکەکان باس دەکەین، ئەگەر خوا پشتیوان بێ و عومر باقی بێ، لەوتارێکی دواتریشدا باسی عەلاماتە گەورەکان دەکەین، بۆئەوەی وریابین و ئاگامان لە خۆمان بێ، زۆرێك لەو نیشانانە تێپەڕیون و ئێمە ئاگامان لێیان نیە، زۆرێکیش تێیدا دەژین، با ئاگامان لێبێ نەوەك ڕۆژێك لە ڕۆژان قیامەتمان بەسەردابێ و ئێمەش ئاگامان لە خۆمان نەبێ و ماڵوێرانی دونیابین و دەست بەتاڵ و خەجاڵەتی ڕۆژی قیامەتیش بین!، یاڕەببی خوایە عاقیبەتی عومرمان خێرکەی، خوایە بە مسوڵمانی بمان ژیێنی، خوایە لەسەر ڕاستە شەقامی ئیسلام ڕامان بگری، خوایە دینی خۆت لەلامان زیاتر شیرین بکەی، خوایە لەسەر سوننەت و سیرەتی پێغەمبەر ﷺ ڕامان بگری، خوایە سوننەت و سیرەتی پێغەمبەرمان لەلا خۆشەویست بکەی، خوایە ئیمانمان لە دڵدا برازێنیەوە، خوایە خراپەو خراپەکاریمان لەلا ناشیرین بکەی، خوایە خۆشەویستی(مودة) و ڕەحمەتمان لەنێواندا زیاد بکەی، خوایە بوغزو قین و ناخۆشی ونارەحەتیمان لەنێواندا هەڵگری، یاڕەببی خوایە هەرچی خۆشە بۆمان بنێری و هەرچی ناخۆشی و نارەحەتی یە لە سەرمان هەڵگری.

أقول قولي هذا وأستغفر الله لكم ولسائر المسلمين، فاستغفِرُوهُ إنَّه كان غَفَّاراً ،

أعوذ بالله من الشيطان الرجيم

{رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ} أمين.

# نیشانە بچووکەکانی قیامەت

## (٢)

### بسم الله الرحمن الرحيم

إنَّ الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونستهديه، ونعوذ بالله مِن شرور أنفُسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضِلَّ له ومن يضلل فلا هادي له، ونشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له ونشهد أنَّ سيدنا ونبينا محمداً عبده ورسوله، هذا الرسول الذي بلَّغ الرسالة وأدى الأمانة ونصح الأمة وجاهد في الله حق جهاده وتركنا على المحجة البيضاء، ليلها كنهارها، لايزيغ عنها إلا هالِك، صلواة الله وسلامه عليه وعلى أله وأصحابه، ومن تبعهم بإحسان الى يوم الدين ...، أما بعد يا عبادالله أوصيكم ونفسي أولاً بتقوى الله وطاعته، فإنّ اللهَ مع الذين اتقوا والذين هم محسنون، قال الله سبحانه وتعالى في كتابه الحكيم، بسم الله الرحمن الرحيم: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ (١) النساء.

ئیماندارانی بەرێز، خۆشەویستانی خواو پێغەمبەرﷺ، ئەی ئەوکەسانەی بۆخوا ئەژین و بۆ خوا ئەمرن، ئەی ئەو کەسانەی دونیاتان لەخزمەتی قیامەتی خۆتاندا داناوە، ئەی ئەو کەسانەی ئامانج و هەدەفتان لە ماندو بوونتان لەڕۆژانی ژیاندا ڕەزابوونی خوایە(جل جلاله)، ڕەحمەتی خواتان لێبێت، سەلامی خواتان لێبێت لەم ڕۆژە پیرۆزەدا.

بەڕێزان: لەوتاری رابردوودا باسی هەندێك لەنیشانە بچووکەکانی ڕۆژی قیامەتمانکرد، هاتنی ڕۆژی دوایی، ئەو قیامەتەی وتمان هەموومان لێی بێ ئاگاین! ئەو ڕۆژەی کەزۆر نزیکەو چاوەڕێمان دەکات، ئەو ڕۆژەی کەبیری لێناکەینەوە، ئەو ڕۆژەی کە خۆمان بۆی ئامادەنەکردووە، ئەو ڕۆژەی

کەنایهێنینە بەر چاوی خۆمان، ڕۆژێکی زۆر ترسناك، پێچانەوەی دونیا، هەلگرتنی ئەو بەرو بازاڕە، نەمانی زیندەوەر بە گشتی، هیجرەت و کۆچکردن لە دونیا بۆدوارۆژ، ئەو ڕۆژەی کەبیری لێناکەینەوە!، هاتنی ڕۆژی دوایی، ڕۆژی موحاسەبە، ڕۆژی لێپێچانەوە، ڕۆژی پاداشتی چاکە بە (بەهەشت)، وە پاداشتی خەراپە بە (دۆزەخ)، وەعدەماندا کەلەوتاری داهاتوودا باسی هەندێك لەو نیشانە بچووکانەی تر بکەین کەپێش ڕۆژی قیامەت دادێن، لە وتاری ڕابردوودا نۆزدە نیشانەمان باسکرد، کە زۆرێك لەو نیشانانەی باسمان کردن هاتوون و تێپەڕیون!، هەندێکیشیان ماون، لەوتاری ئەمڕۆشدا ئەوەندەی کەفریا بکەوین کۆمەڵێکی تر لەونیشانانە باسدەکەین بەو ئومێدەین کە وشیارمان بکەنەوە، بمان هەژێنن، تەکانێکمان پێ بدەن و هاندەرمان بن بۆ خۆئامادە کردنمان بۆ ئەو ڕۆژە، بۆ نزیك بوونەوەمان لە خوا، بۆ حاڵی بوونمان زیاتر لە دینی خۆمان لە داهاتووی ژیانی خۆمان.

بەڕێزان، بیستەمین نیشانە لە نیشانەکانی ڕۆژی قیامەت: ئەوەیە ماڵ و سامان زۆر دەبێت، خەڵك دەوڵەمەند دەبێت، پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەیەکدا کە ئیمامی مسلم ڕیوایەتی کردووە دەفەرموێت: (لاتَقُومُ السَّاعة حَتَّى يُكثَر المالَ ويفيض حتى يخرج الرجل بزكاةِ مالِهِ فَلايَجِدُ أحَداً يقبلها منه)[120] واتە: قیامەت هەڵناستێت، قیامەت دانایێ تا ماڵ زۆر نەبێت، سەروەت و سامان زۆر نەبێت، بەجۆرێك کە وای لێدێت ئینسانی دەوڵەمەند بە زەکاتی ماڵەکەیەوە وەدەردەکەوێ کەسێك لێی وەربگرێت کە موستەحەقی ئەوەبێت کەس نیە لێی وەربگرێت!، کەس نیە لێی وەربگرێ بەو مانایەی کە موستەحەقێك نیە کە زەکاتی پێ بشێ، ماڵی زۆر دەبێت، (ويفيضُ): دەڕژێ، ماڵ زۆر دەبارێ بەسەر ئەو ئینسانەدا!.

[120] صحيح مسلم، كتاب الزكاة، باب: الترغيب في الصدقة، رقم الحديث ١٥٧

بەڵێ خۆشەویستەکانم، ماڵ ئەمڕۆ ڕژاوە، بارییوە، لە شوێنێکی وەکو ئێرە کە کوردستانی خۆمانە وە لەو ولاتانەی کە مسوڵمان نشینن دەبینین!، خاوەنی قەسری زۆر، خاوەنی سەیارەی زۆر، خاوەنی مولك و ماڵی زۆر، خاوەنی پارەوپول و سەروەت و سامانی زۆر!، لە دەوڵەتەکانی عەرەبییەوە بگرە تائەو شوێنانەی کە بە زۆری مسوڵمانی تێدایە، مەرج نیە هەموو مسوڵمانێکیش خاوەن ماڵ بێت، بەلاّم دەوڵەمەندو خاوەن ماڵ زۆردەبن، هەر لە فەرموودەیەکی تردا لەوبابەتەدا دەفەرموێت: وای لێدێ (تكُونُ ابِل للشيطان وبيوت للشَّيطان)[121]، کابرا ئەسپێکی هەیە حوشترێکی هەیە بۆخۆی سواری دەبێت یەکێکیانیشی هەیە کەشەیتان سواری دەبێت، یەعنی زیادەیە لەخۆی!، (وبيوتٌ للشَّيطان) کۆمەڵە خانوێکیشی هەیە کەشەیتان تێیدا نیشتەجێ دەبێ، یەعنی زێدەیە، هی وا هەیە قەسرێك دروست دەکات پێویستی بە دووژوور هەیە دە پانزە ژووری بەتالی بۆدەمێنێتەوەو هەمووی چۆڵەو شەیتان تێیدا نیشتەجێ دەبێ، یەکێکە لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی: خانووبەرەی زۆر، وە ژووری زۆر، کەخۆیشی ئەو هەموو ژوورانەی پێویست ناکات!.

نیشانەی بیست و یەك لەنیشانە بچووکە کانی ڕۆژی قیامەت ئەوەیە کە: بازاڕو فرۆشگاکان لەیەکتر نزیك دەبنەوە، ئەگەر لەسەردەمی پێغەمبەرﷺ، مەعناو تەفسیری ئەو حەدیسە نەزانرابێ وەك پێویست کەبە چاوی خۆیانی ببینن، ئێستا زۆر چاك دەزانرێ، یانی چی: بازاڕەکان لەیەکتر نزیك دەبنەوە ؟!، ئایا ئەرز لەیەکتر نزیك دەبێتەوە؟، نەخێر، بەڵکو هاتووچۆ و گەیشتنی ئینسانەکان بەبازاڕەکاندا زۆربە نزیکی و زۆر بەئاسانی دەبێ، بازاڕەکان وەك

---

[121] عون المعبود شرح سنن أبي داود، جزء ٧، صفحة ١٧٠، باب: في الجنائب: فيه عن الحديث: .. وقال في الأشراف ليس في الحديث مايدل عليه بل نظم الحديث دليل على أن جميعه الى قوله فلم أرها من قول النبيﷺ... وأما بيوت الشيطان فلم أرها، فإن النبيﷺ لم ير من الهوادج والمحامل التي يأخذها المترفون في الأسفار كذا في المرقاة.

لەلای یەکێ وایە، بەهۆی چی؟، بەهۆی وەسائیلی هاتووچۆ، ئەگەر سەدساڵ پێش ئێستا یەکێك بیویستبایە لێرەوە بچێتە کەرکوك دەبوایە بەلای کەم پێنج شەش ڕۆژی پێبچێ بە پێیان تاوەکو دەچێ و دێتەوە!، بەلاّم ئێستا بەسەیارە ئەتوانێ بەیانی زوو بڕوات و بۆ نیوەڕۆ بێتەوە، ئەوە لێك نزیك بوونی بازارەکانە، لێرە کەل و پەل ناکڕێ لە سلێمانی دەیکرێ!، لەهەولێر نایکڕێ لەکەرکووك دەیکڕێ!، خاوەنی سەیارەیەو بازاڕەو لەیەکتر نزیکە ئەگەر سەیارەیە یا نەگەر تەیارەیە یا ئەگەر قیتارە..، ئێستا یابان قیتاری دروست کردووە لەیەك سەعاتدا چوارسەد کیلۆمەتر دەڕوات!، لەیەك سەعاتدا چوار سەد کیلۆ مەتر دەروات، بەجۆرێك لەیەك ڕۆژدا شانزە هەزار کەس دەگوازێتەوە: ئەو بازاڕە چۆن لەیەکتر نزیك نابنەوە!، لەوبازاڕە بۆئەو بازاڕ، بۆکارو کەسابەت، (صدق رسول الله ﷺ)!!.

بەڕێزان: گوتمان زەمەنەکان لێك نزیك دەبنەوە، هەرواش بازارەکان لێك نزیك دەبنەوە، لەوتاری رابردوو گوتمان (فتكون السَّنةُ كالشَّهر، والشَّهرُ كالجُمعة، والجُمعة كَاليَوم)[122]، ساڵ وەکومانگی لێدێ!، مانگ وەکو هەفتەی لێدێ!، هەفتە وەکو ڕۆژێکی لێدێ!، زەمەن زۆر سەریع دەڕوات، ئەوەش بەهەمانشێوە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەوەی ساڵانی زوو بە ساڵێك دەکرا ئێستا بە مانگ یان کەمتر دەکرێ و بەخێراتر ئەنجامدەدرێ.

بیست و دووهەمین نیشانەی بچووك ئەوەیە: شەڕێکی گەورە لەنێوان دوو کۆمەڵی مسوڵماندا دروست دەبێ کە هەردووکیان بانگەوازەکەیان یەکە!، ئەوە کە هەندێك لە موفەسرین و مێژوونوسانی حەدیس دەفەرموون: ئەوە ئەو جەنگەیە کەلەنێوان حەزرەتی علی و موعاویەدا ڕوویداوە لە جەنگی (صفين) دا، وەیاخود دەشبێ هێشتا نەهاتبێ!، ئەگەر نەهاتووە خوابمانپارێزێ نەوەك

---

[122] سنن الترمذي، كتاب الزهد، باب: ماجاء في تقارب الزمان، رقم الحديث ٢٣٣٢

یەکێك بین لەو کۆمەڵە، خوا بمانپارێزێ لەوەی کەلەگەڵ کۆمەڵێك مسوڵماندا ڕووبەڕوو ببینەوە!.

بیست و سێ هەمین نیشانە: چیایەکی زێڕ لەناو ڕوباری فوراتدا دەردەکەوێ!، ئەو ڕووبارەی فورات کەئێستا بە ڕۆژئاوای بەغداد دا تێ دەپەڕێ و سەروچاوەکەی لە تورکیاوە هەڵدەقولێ، پێغەمبەرﷺ فەرمووێ: (لاتَقومُ السَّاعةُ حَتَّى يُحْسَر الفُرات عن جبلٍ مِن ذَهَبْ)[١٢٣] واتە: قیامەت دانایێ تا تافورات نەگیرێتەوەو لە ئەنجامدا چیایەکی زێڕ دەردەکەوێ لەناو ئەو ڕووبارەدا، (يُقتَتَلُ الناسُ عَلَيهِ فَيُقتَلُ مِن كُلِ مِئَةِ تِسعَةٌ وتِسعون)، دەفەرموێ: لەسەر ئەو چیایە زێڕە خەڵکی بەشەردێن و شەردەکەن لەهەر سەد کەسێك نەوەدو نۆی دەکوژرێ و یەکیان دەمێنێ!، بەڵێ زۆر نزیکە!، ئێستا تورکیا خەریکی دروست کردنی چەندین (بەنداو) سەددە لەسەر روباری فورات کە هێشتا نەیگرتۆتەوە، گەورەترین سەددە لەڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بە ئیعتیراقی ئەندازیارەکان، عیراق تای ئەو ڕۆژەی لێیە کەئەو ڕوبارە بگیرێتەوەو ئەو ناوە کەوەکو بەرهەمێکی زیندوو وایە بۆ عیراق نەمێنێ، بەڵێ خۆشەویستەکانم زۆر نزیکە، ئەوە یەکێکە لە عەلامەتە بچووکەکانی ڕۆژی قیامەت کەدەبێ حەتمەن حەدیسی پێغەمبەر ﷺ بێتە جێ کە هەزارو چوارسەد ساڵ پێش ئێستا فەرموویەتی!.

بەڵێ بەڕێزان، بیست و چوارەمین لە نیشانە بچووکەکانی ڕۆژی قیامەت: پیاوانی چاك غەریب دەبن و بەسەیر تەماشادەکرێن لەناو خەلکدا!. گوێ بگرن لەفەرموودەی پێغەمبەرمان ﷺ کە فەرمووی: (إنَّ الإسلامَ بَدَأَ غَريباً وسَيَعودُ غَريبا)[١٢٤]، ئەو ئیسلامە هات زۆر غەریب بوو - لەناو ئەهلی مەککە-،

---

[١٢٣] صحيح المسلم، كتاب الفتن، باب: لاتقوم الساعة حتى يحسر الفرات على جبل من ذهب، رقم الحديث ٢٨٩٤

[١٢٤] صحيح المسلم، كتاب الأيمان، باب: بيان أن الإسلام بدأ غريباً، رقم الحديث ١٤٥

بەغەریبی هات و زۆر عەجیب بوو، زۆر جێگای سەرسوڕمان بـوو، وەختێـك کـە پێغەمبەر ﷺ لەناو مەککەدا دەعوەی دەکرد بۆ ئیسلام خەڵکێك گاڵتـەیان لـێ دەهات و زۆر بەسەیر تەماشایان دەکرد، تەنها چەند کەسێك بـوون، کـەمتر لـە دەکەس!، پاشان بوە زیاتر لەسی کەس و ئیعلانی ئیسلام کراو، دوای سێزدە ســاڵ هیجرەتیان کرد لەمەککەوە بۆ مەدینەو ئاوا لەبچووکی بەرەو گـەورەیی هـات و لەغەریبی ڕزگاری بوو، بەلاّم پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (وسَيَعُودُ غَرِيباً): ئیسلام هەروەکوچـۆن بەغــەریبی پەیـدابوو لـەکۆتایی زەمانیــشدا هــەروا بــە غــەریبی پەیدادبێتەوە!، ڕەنگە یەکێك شەرحی ئەو حەدیسە بەهەڵە بکا بەومانایـەی کـە ئیسـلام بە غەریبی هـاتووەو بەغــەریبی دەڕواتــەوە، ئــەوە غەڵەتــە، نافــەرموێ (یرجع)، دەفەرموێ (یَعودُ): دەگەڕێتــەوە بــۆ مەیـدانی ژیـان، چـۆن بەغــەریبی هاتووە ئاواش بەغەریبی پەیـدا دەبێتــەوە لـەئاخیری زەمانـدا، بـەڵێ (وسَـيَعُودُ غَرِيباً) خەڵك پێی سەیر دەبێ، جا دەفەرموێ: (فَطوبى لِلغُرباء) مزگێنی بۆ ئــەو غەریبانەی کە لەکۆتایی زەماندا هەڵدەستن بە هێنانەوەی ئیــسلام و خــەڵك پێــی سەیردەبێ، مزگێنی خۆشحالی بۆ ئەوکەسانەی هــەڵگری مەشــخەڵی هێنانــەوەی ئیسلامن لەو ڕۆژەدا، جا ئەوکەسانە کێن؟: (أُناسٌ صـالحون)[١٢٥] خەڵکێکن ساڵح و پاکن، پێغەمبەر فەرمووی ﷺ: (أُناسٌ صالِحون في أُناسٍ سوءٍ كَثيرَة)، لـەناو خــەڵکێکی خــەراپی زۆردان، (مَــن يعــصِيهِم أكثَــرُ مِمَّــن يُطــيعهم) ئەوانــەی کەبەقسەیان ناکەن زۆر زیاترن لەوانەی بەقسەیان دەکەن !.

ئەوانــە کۆمەڵــە خــەڵکێکن هەوڵــدەدەن بۆهێنانــەوەی ئیــسلام لــەئاخیری زەماندا، ساڵحن، وە ئەوانەی کە بێ فــەرمانیان دەکــەن و سەرپێــچیان دەکــەن زیاترن لەوانەی گوێڕایەڵییان دەکەن،(صدق رسول الله ﷺ)!.

---

[١٢٥] المعجم الأوسط للطبراني، جزء ٩، صفحة ١٤، من اسمه مقدام، رقم الحديث ٨٩٨٦

بەڵێ خۆشەویستەکانم، بیست و پێنجەمین لەنیشانەکان: مسوڵمانان دوژمنیان زۆر دەبێ، گوێ بگرن لەفەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە چۆن نموونەمان بۆ دێنێتەوەو دەفەرموێ: (یوشَكُ أن تداعى عَلَيكُم الأُمَم)[126] زۆرنزیکە کە دەوڵەتان -ئوممەت و قەوم و جەماعەتەکان- بەسەرتاندا بدەن، داتانبێنێ: (مِن كُلِّ أُفُقٍ)، لە هەموو بەرزاییەك بۆتان بێنە خوارێ،(كما تَداعى الأكَلَةُ إلى قَصْعَتِها)، هەروەکو حەیوانە دڕندەکان بۆسەر نێچیرەکەیان دێنە خواردوە گۆشتی بخۆن کە ئەوەندە موشتاقی گۆشت خواردنی نێچیرەکەن، ئاوا ئوممەتان و قەومەکان و دەوڵەتەکانی ئەوکات بۆتان دادەبەزن!.

بەڵێ بەرێزان بەچاوی خۆمان دەیبینین ئێستا لەرۆژهەلات و رۆژئاوا چ دوژمنایەتیەکی ئیسلام و مسوڵمانان دەکرێ!، هەمووشتێك ئازادە: جگە لە ئیسلام!، نموونەمان زۆرن کە لەوتاری جومعەدا باسیان ناکەین، هەرئەسۆماڵ و سوودان و میصر و فەڵەستینی خوێناوی کەرۆژانە یەکەم دەنگو باسی ئیزاعەو تەلەفزیۆن دەنگ و باسی فەڵەستینە، کێ وایان لێدەکات!!، مەگەر هەر جوولەکە نییە؟!، مەگەر دوژمنترین کەس نیە لەسەر رووی زەوی بۆ مسولمانان، ﴿لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَدَاوَةً لِّلَّذِينَ آمَنُواْ الْيَهُودَ وَالَّذِينَ أَشْرَكُواْ﴾ (٨٢) المائدة، واتە: گەورەترین دوژمنی ئیسلام و مسوڵمانان جوولەکە(یهود)ن، ﴿وَالَّذِينَ أَشْرَكُواْ﴾: وە ئەوانەن کەلەگەڵیانن و موشریکن، بەڵێ دەبینین لەشیشان چیان پێدەکرێ، لەبۆسنە، لەکۆسۆڤۆ، لەکشمیر، لەکوێ و لەکوێ، نموونەمان زۆرن...، هەر عەیبێك یان هەر رەخنەیەك یان هەرشتێکی عەیبدار بیانەوێ دەستی خەن بۆ ناشیرین کردنی مسوڵمانان و ئیسلام دروستی دەکەن، بەلآم وەلآهی خوای پەروەرگار نووری خۆی هەر پێدەگەیەنێ!، ﴿يُرِيدُونَ لِيُطْفِؤُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ﴾ (٨) الصف واتە: دەیانەوێ بەفووی دەمی

[126] مسند أحمد بن حنبل، جزء ٥، صفحة ٢٧٨، ومن حديث الثوبان، رقم الحديث ٢٢٤٥٠

خۆیان نووری ئیسلام بکوژێننەوە بەلاّم خوانووری خۆی هەرتەواو دەکات با کافرانیش پێیان ناخۆش بێت!: ﴿وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ﴾ (٨) الصف.

بەڵێ خۆشەویستانم، بیست و شەشەمین نیشانە: تەقلیدکردنی بێباوەڕان و خوانەناسان لەکارو کردەوەکاندا، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (لَتَركَبُنَّ سُنَنَ مَن كَانَ قَبلَكُم شِبراً بِشبرٍ حَتَّى لَو اَنَّ اَحَدهُم جامَعَ امرأتَهُ باالطَّرِيقِ لَفَعلتُموهُ)[١٢٧]، ئەفەرموێ: ئێوە بەدوای شوێنی بێ باوەڕان دەکەون لە کردەوەدا، تەنانەت ئەگەر یەکێك لەناوەڕاستی رێگا لەگەڵ خێزانی خۆی کۆبێتەوە ئێوەش بەدوای دەکەون و دەتانەوێ وابکەن!، ئەمڕۆ غەرب چی دەکات ئێمەش تەقلیدی دەکەین، خانوبەرەمان هەمووی بۆتە غەربی، ناومان لێناوە غەربی، جل و بەرگمان هەمووی ئیستیراد(هاوردە)یەو تەقلیدەو عادەتەو لەوێوە بۆمان دێ و ئەمڕۆ لەوێ عەرز دەکرێ بەیانی لەبازارەکانی خۆمان دەیبینین، تەنانەت خواردەمەنی و شێوازی دروستکردنیشی، تەنانەت موعامەلاتی بازارمان، تەنانەت لە ئیدارەو دەستەلاّتیش زۆر تەقلیدی غەرب دەکرێ، بەڵێ رۆژێك دێ مسوڵمانان وایان لێدێ تەقلیدی ئەوانەی پێش خۆیان دەکەن -پێش ئیسلام هاتوون-، تەقلیدی خەڵکێکی بێ باوەر دەکەن، بەڕاستی ئەگەر لە سەداسەدیش نەبێ بەلاّم زۆرتەقلیدی رۆژئاواو غەرب و ولاتانی بێ دینمان کردووە کە زەرەری دونیاو قیامەتی لێ دەکەین.

بەڵێ خۆشەویستەکانم، بیست و حەوتەمین لەنیشانە بچووکەکانی رۆژی دوایی ئەوەیە: خەڵکی خۆی لەحەرام ناپارێزێ!، حەلاڵ بێ یا حەرام بێ تێکەڵی دەکاو وەری دەگرێ!، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (يَأتي عَلَى النَّاسِ زَمانٌ ما يُبال الرَّجل مِن أينَ أصَابَ المالَ، مِن حلالٍ أو حرام)[١٢٨]، فەرمووی زەمانێك دێ بەسەرئوممەتی مندا پێش ئەوەی دونیا تێکبچێ، لە ئوممەتی من خەڵکی پارە

---

[١٢٧] المستدرك على الصحيحين، كتاب الفتن والملاحم، رقم الحديث ٨٤٠٤

[١٢٨] سنن النسائي الكبرى، كتاب البيوع، باب: اجتناب الشبهات في الكسب، رقم الحديث ٦٠٤١

کۆدەکاتەوە باکی نیە لەوەی ئاخۆ لە حەرام کۆی دەکاتەوە یالە حەلال کۆی دەکاتەوە، ئەوەش یەکێکە لەنیشانەکانی رۆژی قیامەت، کەدیارە ئەوەش زۆر بەئاسایی دەیبینین، لە سەداسەد پێچەوانەی سەردەمی پێغەمبەرو ئەسحاب، کە ئەبوبکری صدیق یەك لوقمە نانیان بۆهێنا پرسیاری نەکرد لەکوێتان هێناوە گومانی لێی هەبوو حەلاڵە یان حەرام، پەنجەی لەناو دەمی خۆی ڕاکرد خۆی بڕشێنێتەوە تاخواردنەکە بهێنێتەوە، زۆرهەوڵیدا نەیتوانی، زۆرخۆی ئەزیەتدا پاشان گوتیان سەتڵێك ئاوی بۆ بێنن باهەر ئاوەکەی بخواتەوە کەئاوی زۆر خواردەوە دەتوانێ بڕشێتەوەو خواردنەکەی بێنێتەوەو ئەو عەمەلییەی چەندجار دووبارە کردەوە تا ئەو خواردنەی هێناوە و زۆر خۆی ئەزیەتدا، یەکێك لێی پرسی: (كُلُّ ذالِكَ مِن أجلِ لُقمَة يَاأبابَكر)[129]، ئەوهەموو خۆ ئەزیەتدانە لەپێناوی یەك لوقمە نان ئەی ئەبوبەکر، ئەویش فەرمووی (واللهِ لَولَم تخرج إلاَّ مَعَ نَفسِي لَأخْرَجتهَا)، فەرمووی وەلآهی ئەگەر نەهاتبا دەرێ، تەنها لەگەڵ نەفسی - ڕوحی- خۆم نەبوایە، ڕوحی خۆم بۆ دەینایە دەرێ هەردەبوایە بێتە دەرێ!، چونکە من گوێم لێ بووە لەپێغەمبەرﷺ فەرمووی[130]: هەرگۆشتێك بەحەرام قەڵەوبێ ئاگر باشترە بۆنەو، ئاگر لایەقە بۆنەو!، (النَّارُ أولى بِه)، وەهەروەها ئەگەر یەکێك لوقمەنانێکی حەرام بخوا چل ڕۆژ دوعای قەبوول نابێ!، بۆ دەبێ ئینسان لەحەرام خۆی نەپارێزێ؟!، کەدەزانێ فلانە شتە حەرامە، حیسابی لەسەرە، موحاسەبەی لەسەرە، جا زەمەنێك دێ خەڵك حەلاڵ و حەرام پێکەوە دەبەستێ و پرسیاری لێ ناکاو گرنگ ئەوەیە کۆبێتەوە.

---

[129] كنز العمال، جزء ١٢، صفحة ٢٣٦، مسند الصديق، عبادته رضي الله عنه، رقم ٣٥٦٩٥

[130] (كل جسد نبت من سحت — أي من حرام- فالنار أولى به) أورده الترمذي.

بیست و هەشتەمین: دەست گرتن بەدینی ئیسلام زەحمەت دەبێ، فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ کە دەفەرمووێ: (يَأتي عَلى النَّاسِ زَمَانٌ الصَّابِرُ فيهم على دِينِه كالقَابِضِ عِلى الجَمَر)[131] واتە: رۆژێکدێ بەسەر ئوممەتی مندا، ئەوەی کەدەستی بەدینەکەیەوە گرتووە وەکو ئەوە وایە کەدەستی بە پشکۆوە گرتبێ!، پشکۆی ئاگرین!، ئەوندە زەحمەت و نارەحەتە!، لەبەرچی؟! لەبەر فیتنەو ئاشووب!، لەبەر ناخۆشی و نارەحەتی، لەبەر فەسادو بێ ئەخلاقی، لەبەر ئەوە دین زەحمەت دەبێ، دوژمنایەتی مسوڵمانان دەکرێ، بۆیە ئەو کەسەی دەست بەدینەوە دەگرێ، وەکو ئەوە وایە دەستی بە پشکۆوە گرتبێ، جا پشکۆ عادەتێکی هەیە یا دەستت دەسووتێنێ، مەعنای وایە ئەگەر دینەکەت بگری، دەستت دەسوتێ، ئازار دەبینی، نارەحەت دەبی لەدونیا، ئەگەر توشی نارەحەتیانیش نەبی مانای وایە بەباشی دەستت بە دینەوە نەگرتووە، جادەستت بسوتێ باشترە لەوەی دینەکەت لەدەست چێ، چونکە ئەو دینە دینێکە سەربەرزی دونیاو قیامەتی تۆی تێدایەو ئەو دونیایەش دونیایەکی کاتی یە و دەڕوات: ئەگەر دینەکەمان بەردەین هەتاسەر ناژین و عومرێکەو تایبەتەو هەردەمرین، خوای پەروەردگار بە یەهوود دەفەرموێ: ئەگەر هەزار ساڵیش بژین هەردەبێ بمرن، ﴿لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِ مِنَ الْعَذَابِ أَن يُعَمَّرَ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ﴾ (٩٦) البقرة.

بیست و نۆیەمین نیشانە: ئافرەتان زۆردەبن و پیاوان کەم دەبن، پێغەمبەرﷺ لەفەرموودەیەکی صەحیحدا کە ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی دەکات فەرمووێ: (مِن أشراطِ السَّاعَةَ أنْ يَقلَّ العِلم وتكثرُالنِّساء ويَقِل الرِجال حَتَّى يَكونَ لِخَمسِين إمرَأة ألقَيِّمُ الواحِد)[132]، فەرمووی: لەنیشانەکانی

---

[131] سنن الترمذي، جزء ٤، صفحة ٥٢٦، كتاب الفتن، باب: ماجاء في النهي عن سب الرياح../ باب، رقم الحديث ٢٢٦٠

[132] صحيح البخاري، كتاب العلم، باب: رفع العلم و ظهور الجهل، رقم الحديث ٨١

قیامەتە کە عیلم- ی دین- کەم دەبیٚ، عیلمیش بەنەمانی عالمان کەم دەبیٚ!، وە ژن زۆر دەبن، وەپیاوان کەم دەبن، هەتا وای لیٚدیٚ: (لِخَمسين إمرَأة ألقَيِّمُ الواحِد) بۆ پەنجا ئافرەت یەك پیاو بەرپٚوەیان دەبات، وای لیٚدیٚ ئافرەت ئەوەندە زۆردەبن پەنجا ئافرەت یەك پیاو بەرپٚوەیان دەباو سەرپەرشتیان دەکات.

جا دەتوانین بلیٚین شویٚنەواری ئەو زیادبوونەش ئیٚستا دەبینین!. بۆنموونە: لەشویٚنیٚکی وەکو شاری سلیٚمانی ئافرەت چوار بەرامبەری پیاوە[133]. هەروا لەشارەکانی تر، وەهەروەها لەدونیا بەگشتی، لەوانەیە شویٚنی واهەیە ئیٚمە هەستی پیٚناکەین، زۆرزۆر لەوە زیاترە؛ بەلیٚ بۆ پەنجا ئافرەت یەك پیاو سەرپەرشیان دەکات!، ئەوەش یەکیٚکە لەعەلاماتی قیامەت.

سی یەمین نیشانە: شاهیٚدی دانی بەدرۆ زۆردەبیٚ و سویٚند خواردن زۆردەبیٚ؛ پیٚغەمبەرﷺ فەرمووی: (إنَّ بَينَ يَدي السَّاعَة شَهادَةَ الزُّور وَكتمان شَهادة الحَق)[134] واتە: لەنیشانەکانی رۆژی قیامەتە کە شایەتیدان بەدرۆ زۆردەبیٚ و شاردنەوەی شایەتیی حەق زۆردەبیٚ!، کابرا شاهیٚدیەکی حەقی لەلایە دەیشیٚریٚتەوە، بەلاٚم لەسەر مەسئەلەیەك شاهیٚدی بەدرۆ دەدا بۆ کەسیٚك و شاهیٚدی حەقیش دەشیٚریٚتەوە، یان بەشیٚوەیەکی گشتی شاهیٚدیدان بەدرۆ زۆر دەبیٚ و وە شاهیٚدیدان بەحەق زۆر کەم دەبیٚ و دەشاردریٚتەوە، لەفەرموودەیەکی تردا فەرمووی: (خيرُ النَّاسِ قَرني ثُمَّ الذينَ يَلُونَهُم ثُمَّ الذِينَ يَلُونَهُم)[135]، فەرمووی باشترین خەلٚك ئەوەیە لە -سەردەمی- قەرنی مندا بژی، کە {قَرن} یەعنی سەدساڵ!، باشترین خەلٚك ئەوەیە کەلە قەرنی منداییە، پاشان ئەوانەی دواتر دیٚن، وە پاشان ئەوانەی دواتر دیٚن، (ثُمَّ يَجيءُ أقوامٌ ) پاشان قەومیٚکی تردیٚن سویٚند دەخۆن (تَسبِقُ شَهادَةُ

---

[133] - دیارە بەپیٚی ئامارەکانی ئەوکاتە بووە، کە رەنگە ئیٚستا زیاتریش بوویٚت!.

[134] المستدرك على الصحيحين، كتاب الأحكام، جزء ٤، صفحة ١١٠، رقم الحديث ٧٠٤٣

[135] صحيح البخاري، كتاب الشهادات، باب: لايشهد على شهادة الجور إذا أشهد، رقم الحديث ٢٥٠٩

أَحَدهم يَمِينه وَيمِينه شَهَادَته)[١٣٦]، دەفەرمووێ: قەومی وادێ دوای ئەوسێ سەدەیە، شاهێدیدانیان وەپێش سوێندەکەیان دەکەوێتەوە و سوێندەکەیان وەپێش شاهێدیدانیان دەکەوێتەوە، یەعنی چی؟، یەعنی ئەوەندە شاهێدی دەدەن و ئەوەندە سوێندێ دەخۆن خەریکە سوێند خواردنەکەو شاهێدیدانەکە وەپێش یەکتری دەکەونەوە!، ئەوندە بەسەریعی بەدەمیان دادێ شاهێدیدان وە سوێندخواردن، کەئەوەش یەکێکە لە نیشانەکانی ڕۆژی قیامەت، وەلەسیفەتە ناشیرینەکان کەنابێ ئینسانی مسوڵمان سوێندی زۆر بخوات، تەنانەت بەڕاستیش نەك هەربەدرۆ، چونکە سوێندخواردن بەدرۆ بەسوك تەماشاکردنی خوایە جل جلالـه!!، کەئەوە هەرگیز لەئینسانی مسوڵمان ناوەشێتەوە خوابکات بە وەکیلی خۆی لەموعامەلەی خۆی بۆئەوەی ڕەواجی تیجارەتەکەی زیاتربێ یان خەڵکێك لێی ڕازیبێ —خوانەخواستە-.

سی و یەکەمین نیشانەی بچوکی قیامەت: مزگەوتەکان دەڕازێندرێنەوە، گوێ بگرن لەفەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمووی: (مِن أشراطِ السَّاعَةِ أن يتَبَاهى النَّاسُ بِالمَساجِد)[١٣٧]، فەرمووی: لەنیشانەکانی ڕۆژی قیامەتێ یە خەڵك مزگەوتان دەڕازێنێتەوە، ئەمڕۆ چاك دەبینن کەمزگەوتەکان پارەو پول و سەروەت و سامانی زۆریان لێ سەرف دەکرێ!، لەوڵاتی خۆمان و لەوڵاتانی دیکەش دەبینین مزگەوتێك کە شوێنی هەزار کەسی تێدا نابێتەوە کەچی پارەیەکی یەکجار زۆری تێدا سەرف دەکرێ!، ئەمو هەموو ڕازاندنەوەو هێڵکاری(تخطيط) و جوانکاریەی کەلەمزگەوتدا دەکرێ جا لەژوورەوە یا لە دەرەوەیە یا لەمنارەکەیدا ئەوە هەمووی لە نیشانەکانی ڕۆژی قیامەتن.

---

[١٣٦] هەمان فەرموودەی پێشوو.

[١٣٧] ((أخبرنا سويد بن نصر قال أنبأنا عبد الله بن المبارك عن حماد بن سلمة عن أيوب عن أبي قلابة عن أنس أن النبي صلى الله عليه وسلم قال من أشراط الساعة أن يتباهى الناس في المساجد))، سنن النسائي، كتاب المساجد، باب: المباهاة في المساجد، رقم الحديث ٦٨٩.

**نیشانەی سی و دووەمین:** مزگەوتەکان دەبن بەڕێگا، خەڵك بەلای مزگەوتدا تێدەپەڕێ تەنها ئەوەیە لادەداو وەکو ئەمڕۆ لە زۆرشوێن وایە دەچێتە ئاودەست و پاشان دەڕواو بە جێی دێڵێ!، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (مِن أشراط السَّاعَة أن يَمُرَّالرَّجُل في المَسْجِد لايُصَلِّي فِيه رَكعَتَين)[138]، ئەفەرموێ: لە نیشانەکانی ڕۆژی قیامەتە زەمەنێك دێ پیاو بەلای مزگەوتدا تێدەپەڕێ و نوێژی تێداناکات، مزگەوت دەبێ بەڕێگا، قەزای حاجەتی خۆی دەکاو گوێ نادا بەوەی کە ئەوە مزگەوتەو بۆ طاعەت دروستکراوە!. بەڕاستی ئێستا زۆر مزگەوت لەزۆر شوێنان ئاوان.

**نیشانەی سی و سێیەمین:** فیتنەو کوشتن زۆر دەبێ!، ئەوە کەلەوتاری رابردوودا ئیشارەتمان بەکوشتن کرد، کوشتنی بێ هۆ زۆردەبێ!، (لاتَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُقْبَضَ العِلم وتَظهَرالفِتَنُ ويَكثُرالهَرَج)[139]، فەرمووی: قیامەت دانایێ هەتاعیلم نەمێنێ (عیلم کەم دەبێ)، ودفیتنە زۆردەبێ، (وَيَكثُرالهَرَج): وەکوشتن زۆردەبێ، (هَرَج) یەعنی کوشتن، کوشتن زۆردەبێ بەشێوەیەکی گشتی لەتەواوی سەر ڕووی زەوی.

**سی و چوارەمین نیشانەی بچوکی قیامەت:** زیادبوونی ڕووچوونی زەوی و بومەلەرزە (زِلزال)، وەك فەرموویﷺ: (يُقبَضَ العِلمُ وتُكثَرالزلازل)[140]: قیامەت دانایێ هەتا عیلم کەم نەبێ و بومەلەرزە(زلزال) زۆرنەبێ!، ئەرز ڕوودەچێ لەزۆرشوێنان، کەئیمامی بوخاری ئەوحەدیسە ڕیوایەت دەکات، ئێستاش لەولاتان دەبینین زۆرشوێن چۆن ڕوودەچێ، ئەوەیەکێکە لەنیشانەکانی قیامەت.

---

[138] صحيح إبن خزيمة، كتاب الصلاة، باب: كراهة المرور في المساجد من غير أن تصلي فيها والبيان أنه من أشراط، رقم الحديث ١٣٢٦.

[139] صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب: إذا تواجة المسلمان، رقم الحديث ١٥٧

[140] صحيح البخاري، كتاب الاستسقاء، باب: ماقيل في الزلازل، رقم الحديث ٩٨٩

نیشانەی سی و پێنجەم: مردنی کت و پـر زۆردەبـێ کەئێـستا زۆرهەسـتی پێدەکەین!، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (مِن إقتِرابِ السَّاعَة ... وَأن يَظهرُ مَـوتُ الفَجأة) لە نیشـانەکانی نزیك بوونەوەی ڕۆژی قیامەت کۆمەلێك شت دەژمێـرێ پاشان دەفەرموێ: (وَأن يَظهرُ مَوتُ الفَجـأة)[141] وە مردنی کت و پڕ زۆردەبـێ و وەددردەکەوێ، ئێستا ئەومەسـەلەی مردنـی کـت و پـرە زۆر بـووە کـەزۆرمان هەستی پێ دەکەین: فلانەکەس جەڵتە لێیداوە، فلانەکەسی تـر جەڵتەلێیـداوەو لەپڕ دەلێن فلانەکەس کت و پڕ مردووە!، جاران زۆربەکەمی ئەوەمان دەبیست، بـەلام ئێـستا ئـەوجۆرە مردنـە زۆردەبـێ، جاهۆیەکـەی چـیە؟ دیـارە خـوای پەروەردگار سەبەبی بۆ ڕێکدەخا!.

سی و شەشەمین نیشانە: نەزانین لەکاروباری دیـن زۆردەبـێ، هەمووخـەڵك کاروبـاری دونیـا دەزانـێ، بـەلام نـەزانین بـەکارو بـاری دیـن زۆردەبـێ وەك پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (إنَّ بَينَ يَدَي السَّاعَة لأياماً يَنـزلُ فيها الجَهـل وَيُرفَـعُ فيها العلـم)[142]: لەپێش ڕۆژی قیامەتێ یە کەجـەهل زۆردەبـێ، وەعـیلم بـەرز دەبێتـەوە، عـیلم نـامێنێ و هەڵـدەگیرێ لـەناو خـەڵك، وە جـەهل زۆردەبـێ، مەعنای وایە عیلمی دین وردە وردە بەرەو نەمان دەچێ، وەنـەزانینیش(جهـل) بەدین وردە وردە زۆردەبێ، ئەوەش یەکێکە لـە عـەلاماتی قیامـەت، خۆشـمان هەستی پێ دەکەین، کەزۆرکەم خەڵك بەرەو دین و بەرەو مزگەوت و بەرەو لای مامۆستا دەچێ، بۆدەرس خوێنـدن، بۆفێربـوونی دیـن، بۆشـارەزابوون، تـەنها ئیکتیفا بەڕۆژی جومعە دەکا.

---

[141] كنز العمال: جزء ١٤، صفحة ٩٩، تتمة الفصل الثالث في أشراط السـاعة الكبرى..، رقم الحديث ٣٨٤٧٠ ؛ وفي حديث أخرى يقول ﷺ: .. أن النفس المؤمن تخرج رشحاً ولا أحب موتاً كموت الحمار وقيل وما موت الحمار قال موت الفجأة.

[142] صحيح البخاري. كتاب الفتن، باب: ظهور الفتن، رقم الحديث ٦٦٥٣

**سی و حەوتەمین نیشانەی بچوکی قیامەت:** خوێندەوار زۆردەبن، خاوەن قەڵەم زۆردەبن، وەك پێغەمبەرﷺ لـە حەدیسێکدا کـە ئیمـامی حەنبـەل ڕیوایـەتی دەکات فەرمووی: (إِنَّ بَـينَ يَـدَي الـسَّاعَةَ ظُهـورُالقلم)، فـەرمووی: پـێش ئـەوەی قیامەتدابێ -خاوەن- قەڵەم زۆردەبن، خوێندەواری زۆردەبێ، کە ئێـستا هەسـتی پێدەکەی و دەیبینی، ئەگەر ئێستاش ئەم حاڵەتە نـەبێ بـەلاّم شـوێنەواری ئـەوە وادیارەو هیچ ماڵێك نیە لانی کەم خوێندەوارێکی تێدانەبێ و خوێندەواری زۆرە!، بەلاّم بەداخەوە کەمێکی بۆدین و بۆ ئیسلام و خواپەرستی بەکاردێ.

**سی و هەشتەمین نیشانەی بچووکی قیامەت:** قەسـرو بینایـەی بـەرز بـەرز دروسـت دەکـرێن، وەك حـەزرەتی جوبرائیـل لـە پێغەمبـەری پرسـی ﷺ نیشانەکانی قیامـەت، فـەرمووی: (أن تَـرى الحُفـاةَ العُـراةَ العَـالَ رعـاء الـشاة يَتَطاوَلونَ في البُنيانِ)[١٤٣] فەرمووی: ئینسانی فەقیرۆکـەو ئینـسانی شـوان کـە ئیش و کاری ئیشی فەقیرانەبووە کتوپڕ دەوڵەمەند دەبێ و قەسری گەورە گەورە دروستدەکاو حاڵەتی فەقیری خۆی لەبیر دەچێتەوە!.

برایانی بەڕێز ئەوانە کۆمەڵێك نیشانەبوون لەنیشانەکانی پێش هاتنی ڕۆژی دوایی، نیشانەی تریش هەیە، بەلاّم بـەم دوو وتـارە ئیکتیفـا دەکـەین، خـوای پەروەردگار زانست و زانیاریمان بەونیشانانە بکـات بەمایـەی نزیـك بوونـەوەی زیاترمان لێی، وە بیکات بەمایەی زیاتر حاڵی بوونمان لەدین و ئامـادە بوونمـان بۆڕۆژی قیامەت.

بۆیە لێرەدا دەڵێین: یاڕەبی خوایە لەوکەسـانەمان بگێـڕی کەمـسوڵمانن و بەمسوڵمانی دەمرن، یاڕەبی خوایە عاقیبەتی عومرمان خێربکەی، خوایـە لـە ڕەحمەتی خۆت بێ بەشمان نەکەی، خوایە بمانخەیتە ژێـر ڕەحمـەتی خـۆت و بمـان پارێزی لەغەزەبی خۆت یارب العالمین، خوایە ئێمە عەبدی تۆین خێرمان کەمەو

---

[١٤٣] صحيح مسلم، كتاب الأيمان، باب: بيان الأيمان والإسلام، رقم الحديث ٨

گوناهمان زۆرە، خوایە بەڕەحمەتی خۆت لەگەڵمان بکەی، بەکردەوەی خۆمان لەگەڵ ئێمە نەکەی، یاڕەببی خوایە حاڵی مسوڵمانان لەهەموو دونیا چاك بکەی، یاڕەببی خوایە هەرچی خێری دەوێ بۆئیسلام و مسوڵمانان تەوفیقی بدەی، وەهەرچی خەراپەی دەوێ بۆ ئیسلام و مسوڵمانان خوایە ڕێگەی نەدەی وپشتی بشکێنی، یاڕەببی خوایە حاڵی مسوڵمانان لە ئێستاو لەزەمەنی داهاتووشدا لەو فیتنانە بپارێزی کەبەسەر ئوممەتی ئیسلامدادێن، خوایە ئێمەش لە فیتنەی دەجال و لەفیتنەکانی تر بپارێزی. ئامین.

أمين

أقول قولي هذا وأستغفر الله لي ولكم ولسائر المسلمين، أعوذ بالله من الشيطان الرجيم

{رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ} أمين.

# نیشانه گەورەکانی قیامەت

تێبینی: نیشانه گەورەکان به دوو وتار باسکراون، ئێمه به دەستکارییەوه هەردوکیانمان لەیەك وتاردا کۆکردۆتەوه.

## بسم الله الرحمن الرحيم

إنَّ الحمد لله نحمده ونشكره ونستعفره ونستهديه، ونعوذ بالله مِن شرور أنفُسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضِلَّ له ومن يضلل فلا هادي له ، ونشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له ونشهد أنَّ سيدنا ونبينا محمداً عبده ورسوله، هذا الرسول الذي بلغ الرسالة وأدى الأمانة ونصح الأُمة وجاهد في الله حق جهاده وتركنا على المحجة البيضاء، ليلها كنهارها، لايزيغ عنها إلا هالِك صلواة اللهِ وسلامه عليه وعلى أله وأصحابه، ومن تبعهم بإحسان الى يوم الدين ...، أما بعد يا عبادالله أوصيكم ونفسي أولاً بتقوى الله وطاعته، فإنّ اللهَ مع الذين اتقوا والذين هم محسنون، قال الله سبحانه وتعالى في كتابه الحكيم، بسم الله الرحمن الرحيم: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ (١) النساء.

برایانی بەڕێز، مسوڵمانانی خۆشەویست: سەلام و ڕەحمەتی خوای پەروەردگارتان برژێتە سەر، ئێوەو هەموو مسوڵمانانی دونیا، خوای گەورە بەڕەحمی خۆی و به لوتفی خۆی عاقیبەتی عومرمان خێربکا و لەبەهەشتی بەریندا بەیەکەوه کۆمانکاتەوه.

بەڕێزان، لەدوو وتاری ڕابردوودا، باسی هەندێك لەنیشانه بچووکەکانی هاتنی ڕۆژی دواییمان کرد، ئەو ڕۆژەی کەهەموو کەسێك لێی ئەترسێ، کە باوەڕی پێیەتی و دەزانێ لەوشوێنەدا لێی دەپرسرێتەوه، ئەو ڕۆژەی کەتەمرۆ

خەڵکی سەر ڕووی زەوی لێی بێ ئاگایەو لەکۆڕو مەجلیسەکانیشدا زۆرجار بەعەیبە باسی دەکرێ و ناوی دەهێنرێ!، بەداخەوە!، ئەو ڕۆژەی خوای پەروەردگار بەتەئکید لە قورئانی پیرۆزدا بۆمان دەردەخاو ڕوون دەکاتەوە، ئێمە لێی ناترسین: ﴿إِنَّ السَّاعَةَ لَآتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا﴾ (٥٩) غافر، ئەو قیامەتەی کە دێت و هیچ گومانی تێدانییە، خوا(جل جلاله) دەفەرمووێ: ﴿وَمَا أَمْرُ السَّاعَةِ إِلاَّ كَلَمْحِ الْبَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَبُ﴾ (٧٧) النحل، واتە: هاتنی قیامەت وەك چاونوقانێك وایە، ﴿أَوْ هُوَ أَقْرَبُ﴾: بەڵکو نزیکتر!!، خوا(جل جلاله) دەفەمویێ: ﴿اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مَّعْرِضُونَ﴾ (١) الأنبیاء، پێغەمبەرﷺ لەفەرموودەی صەحیحدا کە بوخاری ڕیوایەتی دەکا، ئەفەرموێ: (ولَتَقومَنَّ السَّاعةُ وقَد رَفَع أكلتهُ الي فيهِ لا يَطعَمُها)[١٤٤] ئەفەرموێ: ڕۆژی قیامەت لەکاتێکی وادا دێت ئینسان دەستی بەرز کردۆتەوە پاروە نانەکەی لەبەر دەستدایە، لوقمە نانەکەی لەبەر دەستدایەو بەرزی دەکاتەوە بۆ زاری دەیەوێ بیخوات، بیخاتە ناو دەمی (لا يَطعَمُها): نایخوا، ناتوانێ و پێ ڕاناگا!، کەقیامەت هات هەموو کردەوەکانی ئینسان ڕادەوەستن!، هەموو حەرەکاتەکانی ڕادەوەستن، ئەفەرمووێ: هی واهەیە کوتاڵی لێکردۆتەوەو دەیەوێ بیفرۆشێ کەسیان موعامەلەکە تەواو ناکەن، نەکڕیارو نەفرۆشیار.

بەڕێزان: نیشانە بچووکەکانمان باسکردن، بابێین بزانین نیشانە گەورەکان چین، ئەو نیشانە گەورانەی کە پێش هاتنی قیامەت دەبێ بێن، بەڵێ نیشانەی گەورە کۆمەڵە شتێکن ڕووئەدەن کەلەژیانی مرۆڤدا وە لەتەئریخدا ئەوشتانە نەهاتوون!، شتی زۆرسەرسوڕهێنەر زۆرعەجیب!، لەمێژووی ئینساندا نەبینراوە شتی وا!، ئەوانە یەك لەدوای یەك دێن، بۆیە ئەوانە هەریەکەی بەکورتی

[١٤٤] صحيح ابن حبان، جزء ١٥، صفحة ٢٥٩، ذكر بيان بأن الساعة تقوم والناس في أسواقها، رقم الحديث٦٨٤٥

لەشوێنی خۆیدا باس دەکەین، دیارە لەوتاری ئەمڕۆدا ناتوانین هەموویان باس بکەین، بەپشتیوانی خوای پەروەردگار ئەوەی کەفریای نەکەوتین لەوتارەکانی داهاتوودا دەتوانین باسی بکەین، بەڵێ ئەوانە هیچیان نەهاتوون بەلاّم کەدێن وەکو حەلەقەیەك -ڕستەیەك- وان ئەگەر یەکەمیان هات ئەوانیتر هەموویان بەدوایدا دێن!، نیشانەگەورەکان ئەگەر یەکەمیان هات ئەوانیتر هەموو بەدوایدادێن، لەنێوانیاندا فاصیلەو نێوان نییە.

بەڵێ خۆشەویستەکانم: حوزەیفەی کوڕی ئەسەد صەحابەی پێغەمبەر ﷺ، فەرمووی : (اِطَّلَعَ النَّبيُّ ﷺ عَلَينا)[١٤٥] فەرمووی: ڕۆژێکیان ئێمە قسەمان دەکرد پێغەمبەر ﷺ لێمان هاتە ژووریّ، (فقَال ماتَذاکَرون؟): فەرمووی ئێوە باسی چی دەکەن؟، ئەفەرموێ: ئێمەش گوتمان باسی قیامەت دەکەین: (قالُوا نذكُرُ السَّاعة)، (قالَ إنَّها لَن تَقُومَ حَتَّى تَرَو عَشرَ آيات) فەرمووی: قیامەت دانایێ هەتا دە نیشانەی گەورە نەبینن، ئەفەرموێ: (فَذَكرَ الدَّجالَ و الدُّخَان، والدَّابَّة، وطُلُوع الشَّمسِ مِن مَغرِبِها، ونُزول عِيسى ابنِ مَريم، و يَأجوجَ ومأجوجَ و ثلاثةُ خُسوفٍ: خَسفٌ بِالَمشرِقِ و خَسفٌ بِالَمغرِبِ و خَسفٌ بِالجَزيرَة العَرَب وأخِرُ ذالِكَ نارٌ تَخرُجُ من اليَمَنِ تَطرُد النَّاسَ الى مَحشَرِهِم)، ئەم فەرموودەیە ئیمامی موسلیم لەگەل ئیمامی ترمذي ڕیوایەتی دەکات{خوا لێیان ڕازیبێ}، فەرمووی: هەتا دە عەلاماتی گەورە نەبینن قیامەت دانایێ، حوذەیفە ئەفەرموێ: بۆی باسکردین و فەرمووی ئەوانەن: یەکیان (دەججال)ە، ئەویتر دوکەڵ(دُخان)ە، ئەویتر (دابَّة الأرض)ە کە دواتر دەگەینە سەری و باسی دەکەین، ڕۆژهەلاّتن لەڕۆژئاواو ئاوابوونی لەڕۆژهەلات، پاشانیش هاتنە خوارەوەی حەزرەتی عیسا (عليه الصلاة والسَّلام)، یەئجوج و مەئجوج، وە سێ

[١٤٥] صحيح مسلم، جزء ٤، صفحة ٢٢٢٥، كتاب الفتن، باب: في الأيات التي تكون قبل الساعة، رقم الحديث١٢٩٠١

ڕووچوون: ڕووچوونێك لەڕۆژهـەلات، یـەکیان لـەڕۆژئاوا، یـەکیان لەجـەزیرەی عەرەب، کە ئێستا پێی دەگوترێ (المملكة السَّعودية)، وەپاشانیش ئاگرێکە کـە لە یەمەنەوە دەردەچێ وەخەڵکی کۆدەکاتەوە لەشوێنێك..، ئەوانـە هـەموویان لەشوێنی خۆیان بەپشتیوانی خوای پەروەردگار باس دەکەین.

جا لە نیشانە گەورەکانی ڕۆژی قیامەت وەك لە حەدیسەکەدا باسکراوە:

یەکەم، هاتنی دەججال:

پێغەمبـەرﷺ دەفـەرموێ: لـەوەتی کـە ئـادەم (علیـه الـصلاة والـسلام) دروستکراوەو لەسەر زەوی یە هەتا دونیا تێکدەچـێ هـیچ فیتنەیـەك گـەورەتر نەبووە لـە فیتنـەی دەججـال کـە بـۆ بەشـەرییەت دێ!. دەججـال کابرایـەکی یەهوودییـە، زۆربـەی ئەوانـەی کـە وەدوای دەکـەون یـەهوودین و ئـافرەتن! کابرایەکی کورتەبالآیە، سورکەڵەیە، نێوچاوانی پانە، قـژی لولـە، وە جارجـار دەشەلێ، سینگی بەرزە، چاوی ڕاستی کوێرە، چاوی چەپی تارماییەکی ڕەشـی بەسەرداهاتووە[١٤٦]، لەنێوانی هەردوو چاوەکانی نوسراوە: کافر!، لە فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەردا هاتووە (علیه الـصلاة والـسلام) کـە لـەنێوانی هـەردوو چاوەکانی دا نوسراوە (کافر) یان (ك. ف .ر)!، هەرچی ئیمانداریێ ئەو نوسراوە دەخوێنێتەوە!، بەلآم هەرچی کافریێ هەستی پێناکاو نـابیبینیێ!، خـوای گـەورە ئەو دەججالە دەنێرێ بۆ تاقیکردنەوەی بەشەر، کۆمەڵێك شتی پێیە کە ئینسان تێیدا سەری سوڕ دەمێنێ بەتایبەت ئەگەر ئیماندارو مسوڵمان نـەبێ یەکـسەر وەدوای دەکەوێ و باوەڕی پێدەکا!، زۆر سەریع دەڕوا! پێغەمبەرﷺ فەرمووی: وەکو هەور دەڕوات و بە ئەرزدا دەسوڕێتەوە، چونکە لـە پێغەمبـەریان پرسـی (علیه الصلاة والـسلام): چـەند ڕۆژان لـە زەوی دا دەمێنێتـەوە؟، فـەرمووی:

---

[١٤٦] (الدجال ممسوح العين، مكتوب بين عينيه (كافر) ثم تهجاها (ك ف ر) يقرؤه كل مسلم) ، رواه البخاري (١٠١\٨) في الفتن، باب: ذكر الدجال.

چل(٤٠) ڕۆژ: (يَومٌ كَسَنةٍ وَيَومٌ كَشَهرٍ وَيَـومٌ كَجُمُعَـة، وسـائر أيَّامِـهِ كَأيَّـامِكُم) واتە: ڕۆژێکیان وەکو ساڵێك وایە، یەکیان وەکو مانگێك وایـە، یـەکیان وەکـو هەفتەیەك وایە، باقی ڕۆژەکانی تری وەکو ڕۆژەکانی ئێوەن..، لەوەنـدە ڕۆژەداو لەو کاتەدا هەموو زەوی دەگەڕێ تەنها دوو شوێن نەبێ کە خـوای گـەورە لێـی مەنع کردوون کە بۆیان بچێ ئـەوانیش هـەردوو شـاری مەککـە و مەدینـەن!، دەججال ناتوانێ بچێ لەبەرئەوەی مەلائیکەتەکانی خوا لەسەر هەر ڕێگایەك لە ڕێگایەکانی مەککەو مەدینە ڕاوەستاون و باڵەکانیان لێککردوەتەوەو حەراسەتی دەکەن و دەججال ناوێرێ لێیان نزیـك بێتـەوە!، ئـەوەی کـە دەججـال پێیـەتی کۆمەڵێ شتن کە عادەتیی نین و (خارق العادة)ن! لە تەئریخی ئینسان دا نـەبوون بۆیە فیتنەیەکی زۆر گەورەیە! بۆ نموونە: مردوو زیندوو دەکاتەوە! یان ئینسانی زیندوو لەبەرچاوی خەڵك دەمرێنێ و پاشان زیندووی دەکاتەوە! کابرایەك دێـنن بە مشار شەقی دەکەن بەناو هەردوو لەتەکانی تێدەپەڕێ و پاشان پێـی دەڵـێ: هەڵـسەوە، زینـدوو ببـەوە، یەکـسەر زینـدوو دەبێتـەوە لەبەرچـاوی خـەڵك! لەبەرچاوی خەڵك بەخەڵکی دەڵێ: باوەڕم پێ دەهێنن کە من خوای ئێوەم ئەگەر وا بکەم دایك و باوکتان زیندوو بکەمەوە؟ کابرا دەڵێ بەڵێ، تاقیکردنەوەیەکی زۆر گەورەیە! وەکو لەوتاری ڕابـردوودا باسمـانکرد...، بـەئاسمان دەڵـێ ببـارە، دەبارێ! بە گیای زەوی دەڵێ بڕوێ، دەڕوێ! خوای گەورە وەکو تاقیکردنەوەیەك پێشانی ئیمانداران دەدات، پێشانی خەڵکی سەر ڕووی زەوی دەدات، بەهەشـت و ئاگری پێیە، وەکو پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام) فـەرمووی: (مَعَـهُ جَنَّـةٌ ونار، فنارُهُ جَنَّة وَ جَنَّتُهُ نار)[147] واتە: لەشێوەی بەهەشتدا شتێکی پێیە پێشانی خەڵکی دەدات و لە شێوەی ئاگریش شتێکی پێیە وەکـو جەهەننـەم پێـشانیان دەدات! بۆیە فەرمووی: بەهەشتەکەی ئـاگرەو ئاگرەکەیـشی بەهەشـتە! یـانی

---

[147] صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب: ذكر الدجال وصفة وما معه، رقم الحديث ٢٩٣٤

کەسێك کە بەقسەی بکات گوایە دەچێتە ئەو بەهەشتەی پێیەتی ئەوە دەچێتە ناو جەهەننەم!، بەلاّم ئەگەر بەقسەی نەکات و بەقسەی ئەویێ بچێتە ناو ئاگر ئەوە دەچێتە ناو بەهەشت!، وە فەرمووی: (إنَّ مَعَهُ ماءاً وناراً) ئاوو ئاگری پێیە! ئاوەکەی ئاگرە وە ئاگرەکەیشی ئاوە! بۆیە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەگەر هات مەچوونە نێو ئەو ناوەی کە لەڕوو پێشانتان دەدات: (فإنَّه ماءٌ عَذبٌ طَيِّب)[148] ئەو ئاگرەی کە پێیەتی ئاوێکی ساردی شیرینە، بۆیە ئەگەر تووشی دەججال بوون ئاگاتان لێبێ مەچوونە لای ئەو ئاوەی کە پێیەتی و ئاگرەکە هەڵبژێرن.

بەڵێ خۆشەویستەکانم: بە درێژی باسی دەججالمان کردو ناچینەوە سەری بەلاّم دەججال فیتنەیەکی گەورەیە کە بۆ سەر ئوممەتی پێغەمبەر دێ ﷺ لە کۆتایی زەمان دا، لەوکاتەدا کە ئوممەتی پێغەمبەرﷺ زۆر نارەحەت دەبێ لەوکاتەدا هەموویان کۆدەبنەوە لە مەککەو مەدینە کە دەججال ناچێتە ناویان، وە لە دەوروبەری بیت المقدس -لە شام- ئالەوکاتەدا موژدەیەکی خۆش دێت کە نیشانەی پێنجەمە: هاتنەخوارەوەی پێغەمبەری خوا حەزرەتی عیسا(عليه الصلاة والسلام)، ئەو موژدەیە زۆر خۆشە! لە وەختێکی وادا کە مسوڵمانان زۆر تەنگاو بوون، لە شەرقی دیمەشق لەسەر منارەی سپی(بیضاء) ئالەوێ حەزرەتی عیسا کە دەستی لەسەر شانی دوومەلائیکەتی خوا داناون دێتە خوارەوە[149] بۆ سەر ڕووی زەوی، حەزرەتی عیسا ڕەنگی جوانە، قژی درێژەو بەنێو ملی دا هاتۆتەخوارێ، پیاوێکی چوارشانەی مام ناوەندییە، وە هەروەکو تازە لە حەمام

---

[148] صحيح مسلم، كتاب الفتن وأشراط الساعة، باب: ذكر الدجال وصفة وما معه، رقم الحديث ٢٩٣٥

[149] يقول ﷺ: (..فينزل عندالمنارة البيضاء شرقي دمشق بين مهر و دتين واضعا كفيه غلى أجنحة ملكين).

صحيح مسلم، كتاب الفتن وأشراط الساعة، باب: ذكر الدجال وصفة وما معه، رقم الحديث ٢٩٣٧

هاتبێتە دەرەوە ئاوا جوان و نوێ یە!، خەڵك سەرەتا باوەڕی پێناکەن کە بانگ دەکا دەڵێ خەڵکینە بۆ ناچن وەدوا ئەو درۆزنە بکەون و بیکوژن، ئەوانیش دەڵێن: دەبێ ئەوە جنۆکە بێ؟! کە دەچن لێی نزیك دەبنەوە تەماشا دەکەن حەزرەتی عیسایە (علیه الصلاة والسلام) بەو وەصفانەی کە کراوە.

دەججال کە هەواڵی هاتنەخوارەوەی حەزرەتی عیسا دەزانێ ڕادەکات و حەزرەتی عیسا بەدوای دا دەچێ لەگەڵ مسوڵمانانداا لە شوێنێکدا کە پێی دەوترێ (باب لُد)[١٥٠] شوێنێکە ئاوەدانی یەکە لەنێوان دیمەشق و بیت المُقَدَّس ئالەوێ دەیگەنێ، لەوێ کە چاوی بە حەزرەتی عیسا دەکەوێ دەست بە توانەوە دەکات! پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (يَبدأُ باالذَّوَبانِ كَما يَذوبُ المِلح) کە تەماشای حەزرەتی عیسا دەکات دەست بە توانەوە دەکات و وەکو خوێ دەتوێتەوە! بەرلەوەی بتوێتەوە حەزرەتی عیسا بە حەربەکەی خۆی پەلاماری ئەدا و دەیکوژێ، وەکو پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (يَقتُلُ عِيسى ابنِ مَريَمَ الدَّجالَ بِبابِ لُد) عیسای کوڕی مەریەم دەججال لە دەرگای (لود) دەکوژێ -لەوشوێنەی کە ناوی هێناوە-، پاشان حەزرەتی عیسا لەگەڵ مسوڵمانان دا بەیەکەوە شەڕ لەگەڵ جولەکەکاندا دەکەن، بەدوایاندا دەنێن، تا لەو ڕۆژەدایە کە داروبەرد بانگی مسوڵمانان دەکەن و دەڵێن: مسوڵمان وەرە ئەوە جولەکە لەپاش ئێمە خۆیان شاردۆتەوەو وەرن بیانکوژن، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (حَتّى يَقولَ الحَجَرُ والشَّجَر تعالَ يا مُسلِمُ يا عَبدَالله هذا يَهودِيٌّ خَلفي فَاقتُلهُ) داروبەرد بانگ دەکەن: ئەی مسوڵمان ئەی عەبدی خوا وەرە ئەوە یەهوودییەك لەدوای من خۆی شاردۆتەوە وەرە بیکوژە!، (إلاَّ الغَرقَد فَإنَّهُ مِن شَجَرِ اليَهود): تەنها داری غەرقەد نەبێ کە ئەوداره داری یەهوودە، هەموو دارو درەختێك، هەموو بەردێك بانگی مسوڵمانان دەکەن: وەرن ئەوە جولەکە لەدوای ئێمە خۆیان

[١٥٠] المستدرك على الصحيحين، كتاب الفتن، رقم الحديث ٨٥٨٠

شاردۆتەوەو بیانکوژن، تەنها دارێك نەبێ کە پێی دەگوترێ (غەرقەد) کە ئەوداره بانگی مسوڵمانان ناکاو جولەکەکان سودی لێ دەبینن و خۆی لەپاش دەشارنەوە بۆیە ئەو دارە ئێستا جولەکەکان دەیچێنن لە فەلەستینی داگیرکراو، چونکە جولەکەکان چاوەڕێی ئەو رۆژە دەکەن کە دەججال دێت و یەهوود پشتگیری دەکەن و یارمەتی دەدەن، وە باوەڕیان بەوە هەیە کە حەزرەتی عیسا دێتە خوارەوەو دەججال کوژێ و لەگەڵ مسوڵماناندا بەسەر جولەکەکان دا دەدەن و ئەوانیش ئێستا ئەو دارەی دەچێنن بۆئەوەی ئەگەر ئەوە روویدا خۆیانی لەپاش بشارنەوە! ئێستا ئەودارەی زۆر دەچێنن لەوشوێنانەی کە ئاوەدانی دەکەنەوە.

خۆشەویستەکانم: حەزرەتی عیسا جیا لە هەموو پێغەمبەرەکان دێتەخوارەوە، با ئێمەی مسوڵمان ئەوەش بزانین کە جیا لە هەموو پێغەمبەرەکان حەزرەتی عیسا نەمردووە لەسەر زەوی و خوا بەرزی کردۆتەوە بۆ ئاسمانەکان و دوایی لە ئاخیری زەمانێ دێتەوە خوارێ و یارمەتی ئومەتی موحەممەد دەدات (صلی اللە علیە وسلم)، دەججالیش دەکوژێ و ڕاوی جولەکەکانیش دەنێ و قات و قڕیان دەکات، ئەو عیسایەی کە لەناو لانکەدا قسەی کردووە! ئەو عیسایەی کە بە منداڵیی قسەی کردووە(صلی اللە علیە وسلم)!، ئەو عیسایەی کە ئەیفەرموو: ﴿إِنِّي عَبْدُ اللَّهِ﴾ (٣٠) مریم: من عەبدی خوام، خوای پەروەردگار کە ﴿عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ﴾ (٦) السجدە، زۆر چاکی دەزانی لە ئاخیری زەمانێ دا بە سەدان ملیۆن کەس سەری لێ دەشێوێ و گومڕا دەبێ پێیانوایە حەزرەتی عیسا خوایە!، پێیان وایە (مەریەمەی دایکی) خوایە!، پێیانوایە حەزرەتی عیسا هەڵواسراوەو کوژراوە! بۆیێ صەلیبیان دروستکردووە! صەلیب ئەو زائیدەی کە صەلیبییەکان و -بەحیساب- مەسیحییەکانی ئەمڕۆ لە جیهاندا وەخۆیانی هەڵدەواسن و وەکو مەدالییەیەك بە گەردنیانەودیە، لە کەنیسەکان هەمووی هەڵواسراوە، شێوەیەکیان دروستکردووە گوایە ئەوە حەزرەتی عیسایەو لەسێدارەیانداوە، بۆئەوەی

ئیسپات ببیٚ بوٚ هەموو عالەمی مەسیحییەت کە حەزرەتی عیسا عەبدی خوایەو خوا لە قورئان فەرموویەتی لەسەر زوبانی حەزرەتی عیسا: ﴿إِنِّي عَبْدُ اللَّهِ﴾ (٣٠) مریم: من عەبدی خوام، ﴿آتَانِيَ الْكِتَابَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا﴾ (٣٠) مریم: کیتابی بوٚ ناردووم کە ئینجیلە، ﴿وَجَعَلَنِي نَبِيًّا﴾: وە منی کردووە بە پێغەمبەری خوٚی، وە دێتەوە خواریٚ بوٚئەوەی ئەو دروٚیە کە بوٚ حەزرەتی عیسا کراوەو ئەو بوهتانەی کە پێی کراوە هەڵبوەشێتەوە.

بەڵیٚ خوٚشەویستەکانم: بوٚیە خوای گەورە دەفەرمویٚ: ﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلاَّ لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ قَبْلَ مَوْتِهِ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا﴾ (١٥٩) النساء، واتە: دوای هاتنەخوارەوەی عیسا هەموو خاوەن کتێبەکان پێش مردنی باوەری پیٚ دێنن، وە عیسا لەرۆژی قیامەتدا دەبێتە شاهید لەسەریان کە پەیامی پیٚ راگەیاندوون.

بەڵیٚ بەرێزان: ئەگەر حەزرەتی عیسا خوا بوایە چوٚن قبوڵی دەکرد بچێتە نێو رەحمی ئافرەتێك؟، چوٚن لە خوایەك دەوەشێتەوە لەناو رەحمی ئافرەتێکدا بێت؟ لەدامێنی ئافرەتێك بێتە دەرەوە! خوایەك چوٚن قبوڵی دەکات بیکوژن و لەسێدارەی بدەن؟! بەراستی نەزانینە ئەمروٚ کە سەجدەی بوٚئەبەن! لە عالەمی مەسیحییەت دا ئەمرۆ سەجدەی بوٚ دەبەن لە کەنیسەکان دا، بەراستی ئەوە تاقیکردنەوەیەکی گەورەیە کە بەسەر عالەمی ئەمرۆدا هاتووەو رۆژێکدیٚ حەزرەتی عیسا دێتەخوارەوە وەحوکم بە دینی موحەممەدی پێغەمبەری خوا دەکات ﷺ، حەزرەتی عیسا پێغەمبەری خوایەو خاوەنی کتێبی خوایە کە ئینجیلە بەلاٚم حوکم بە قورئانی موحەممەدﷺ دەکا! پێغەمبەر فەرمووی (علیە الصلاة والسلام): (يَكْسِرُ الصَّلِيبَ)[151] خاچ دەشکێنیٚ!، ئەو خاچ(صلیب)ـەی کە ئەمروٚ لەملی دەکەن دەیشکێنیٚ!، ئەو خاچەی کە لە

[151] المسند المستخرج على صحيح المسلم، كتاب الأيمان، باب: ذكر قوله (ليوشكن أن ينزل فيكم ابن مريم)، رقم الحديث ٣٩٠

دیوارەکـانی کەنیـسەکانیان هەڵیانواسـیوەو سـوجدەی بـۆ دەبـەن و ڕەمـزی مەسـیحییەتی عالەمی یە ئەمڕۆ..!، (وَيَقتُلُ الخنزير): بەراز دەکـوژێ، (وَيَضَعُ الجزية): جزیە لادەبات لەسەر ئەهلی کیتاب، کاتی خۆی جزیـە لەسـەر ئـەهلی کیتاب دانراوە کە دەبێ پارە بدەن بەڵام دوایی جزیەیان لێ قبوڵ ناکات بـەڵکو حەتمەن دەبێ ئیمان بە دینی موحەممەد بێنن ﷺ، بەڵێ فەرموودەی پێغەمبەرە کە حوکم بە دینی موحەممەد دەکات (عليهِ وعلى نبيِّنا الصَّلاة والسلام).

خۆشەویستەکانم: حەزرەتی عیسا حەوت ساڵان لـە زەوی دا دەمێنێتـەوە، پاشـان دوای ئەو حەوت ساڵە حەزرەتی عیسا وەفـات دەکـات، لـە تەمـەنی چـل سـاڵیی دا وەفات دەکات بۆیە زانایان وتوویانە کاتێ پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ چل ساڵ لـە زەوی دەمێنێتەوە هەندێك دەفەرموون: مانای وایە ئەوکاتەی کە خـوای پـەروەردگار بـەرزی کردۆتـەوە بـۆ ئاسمـان تەمـەنی سـی و سـێ سـاڵ بـووە، حـەوت سـاڵانیش دوای هاتنەخوارەوەی حوکم دەکات ئەوە دەکاتە چل(٤٠) ساڵ!، چونکە جولەکـەکان پێیـان وایە کە عیسا کوژراوە، بەڵام وانیـە و خـوا ئەفـەرموێ: ﴿وَقَـوْلِهِمْ إِنَّـا قَتَلْنَـا الْمَـسِيحَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ اللّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ﴾ (١٥٧) النساء، واتـە: کـە دەڵـێن ئێمە عیسای کوڕی مەریەم کە پێغەمبەری خوایە کوشتومانە، وانیەو نەیانکوشـتووەو هەڵیشیان نەواسیوە، ﴿وَلَكِن شُبِّهَ لَهُـمْ﴾ (١٥٧) النـساء: بـەڵکو کـاتی خـۆی خـوای گەورە ڕەنگی کەسێکی تری هێنایە سەر شێوەی پێغەمبەر عیسا و جولەکەکان کـاتی خۆی کە دژایەتی حەزرەتی عیـسایان کردو ویـستیان بکـوژن، ئـەو کابرایـەیان گـرت و وایانزانی حەزرەتی عیـسایە لەسێدارەیانداو کوشتیان و وایـانزانی حـەزرەتی عیـسایان کوشتووە!، خوا ئەفەرموێ: ﴿بَل رَّفَعَهُ اللّهُ إِلَيْهِ﴾ (١٥٨) النـساء: بـەڵکو خـوا بـەرزی کردەوە بۆلای خۆی، ﴿وَمَا قَتَلُوهُ﴾: نەیانکوشـت، ﴿وَمَـا صَـلَبُوهُ﴾: هـەڵیان نەواسـی و لەسێدارەیان نەدا، ﴿وَلَكِن شُبِّهَ لَهُمْ﴾: بـەڵکو خـوا شـێوەی بـۆ خـستەسەر کەسـێکی دیکە، بەڵێ: ﴿وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا﴾ (١٥٧) النساء: وە بێگومان نەیانکوشت.

بەڵێ حەزرەتی عیسا لەتەمەنی چل ساڵیی دا وەفات دەکات، پێش ئەوەی وەفات بکات نیشانەیەکی دیکەی گەورەی قیامەت دێت کە بریتییە لە یەئجوج و مەئجوج، کێ هەیە ناوی یەئجوج و مەئجوجی نەبیستبێ؟ زۆرجار لە کوردەواری خۆمان دەڵێ:{ئاجوج و باجوج}، بەهەر شێوەزارو شێوەیەك بێ ناوی یەئجوج و مەئجوجمان بیستووە! کە دەزانین یەئجوج و مەئجوج خەڵکێکی زۆر سەرلێشێواو و دڕندەو خراپەکارو گێرەشێوێنن، یەئجوج و مەئجوج دێن وەکو دەفەرموون: ئەوانە لە نەوەی (یافث) ی کوڕی پێغەمبەر (نوح)ن، لە شەرقەوە دێن و نیشانەکانیان ئەمانەن: چاویان بچوکە، لووتیان بچوك و باریکە، قژیان سووری تێدایە، دەم و چاویان پانە..، دیارە کە لە شەرقەوە دێن وەنەبێ ئێستا نەبووبن کە لەڕاستیدا لە نەوەی ئادەمن و وەکو ئێمە ئینسانن، یەئجوج و مەئجوج لە شەرقەوە دێن و ئێستا هەن، وە لەمێژە هەن! وەچەیان وردە وردە زیاد دەکات، ژن وژنخوازییان هەیە، ئاو دەخۆنەوەو نان دەخۆن، مەعیشەتیان هەیە، بەلاّم لەکوێن؟! ئێستا لەژێر سێبەری ئەو ئایەتە قورئانییە دا بۆتان باس دەکەم:

خوای گەورە لە سورەتی (الکهف) دا دەفەرموێ: ﴿حَتَّى إِذَا بَلَغَ بَيْنَ السَّدَّيْنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمًا لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا﴾ (٩٣) الكهف، کاتی خۆی پیاوێکی صالّح هەبووە، سەرکردەیەکی گەورە کە هەموو جیهانی بەدەست بووە، جا هەندێك لە موفەسیرین دەڵێن ئەوە ئەسکەندەرە، هەندێك دەڵێن ئەوە پیاوێکی صالّحی تر بووە بەهەرحاڵ هەرکێ بووە ناوی بە (ذوالقَرنَين) هاتووە، (ذوالقَرنَين) ڕۆژهەلاّت و ڕۆژئاوای کردووەو دەستەلاّتی بەسەردا هەبووە وەکو ئێستا ئەو دەوڵەتانە پارچەپارچە نەبوون، وەختێك گەیشتۆتە شوێنێك چیاو دەشت و دوڵ بووە: ﴿حَتَّى إِذَا بَلَغَ بَيْنَ السَّدَّيْنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمًا لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا﴾ (٩٣) الكهف، قەومێکی بینیوە کە هیچ لە قسە حاڵیی نەدەبوون و زمانێکی زۆر تایبەتییان هەبووە، ﴿قَالُوا يَا ذَا الْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَى أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا﴾

(٩٤) الكهف، دەوروبەری (ذوالقَرنَين) گوتیان: ئەی پاشای گەورەمان یەئجوج و مەئجوج خراپەکارن لە زەوی دا وە زۆر لێیان دەترسین، خەڵکێکی زۆرن، بۆچی ئەگەر ئێمە یارمەتیت بدەین و هەندێك پارەو پول و پێداویستییەکانت بۆ سازبکەین سەددێك لەنێوان ئێمەو ئەوانیشدا دروست بکەی بۆئەوەی کە زەرەرمان لێ نەدەن، ئەویش گوتی: ﴿قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيْرٌ﴾ (٩٥) الكهف، ئەوەی کە خوا بەمنی بەخشیوە زۆر چاکترەو دەستەڵاتم هەیە، پێویست ناکات ئێوە یارمەتیم بدەن، ﴿فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا﴾ (٩٥) الكهف: بێنن هاوکاریم بکەن بەهێز و ئەفەرم بدەنێ و پێداویستیم بۆ دابین بکەن هەتا لەنێوان ئێوەو ئەوانیشدا سەددێك دروست بکەم، تەماشا بکەن ئەو سەددەی چۆن لەبەردەم یەئجوج و مەئجوج دروستکردووە: وەکو خوا فەرمووی ﴿آتُونِي زُبَرَ الْحَدِيدِ حَتَّى إِذَا سَاوَى بَيْنَ الصَّدَفَيْنِ قَالَ انفُخُوا﴾ (٩٦) الكهف، واتە: گوتی پارچە پارچەی گەورەی پارچە ئاسنم بۆ بێنن، کە بۆیان هێنا ئەوجار هەمووی لەسەریەك دانان هەتا لەئاستی چیایەك بەرزبۆوە ئەوبەرو ئەوبەری چیایەکان پڕبوو، ئەوجار فەرمووی: ﴿قَالَ انفُخُوا﴾ فووی ئاگرینی پێدابکەن! وەکو چۆن کورەی ئاگرین هەیە کاتێك کە هەوا بە ئاگری دا دەکرێ و سووری دەکاتەوە ئەو ئاسنەی هەمووی ئاوا سوور کردەوەو بەهۆی ئەوەی خەڵك ئالەتی فوولێکردنی ئەو ئاگرەی بۆ دروستکردن، ﴿حَتَّى إِذَا جَعَلَهُ نَارًا﴾: وەختێ کە ئاسنەکان هەمووی کە لەسەر یەکی دانابوون و بەقەدەر چیایەك ئاوا بەرزی کردبوونەوەو وەکو ئاگریان لێهات، ئەوجار فەرمووی: ﴿آتُونِي أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا﴾ ئاسنی تواوە (مس)م بدەنێ با بەسەری دابکەم بۆئەوەی بچێتە هەموو کون و کەلەبەرەکانیشی و ببێتە سەددێکی ئاسنیی گەورە، ﴿فَمَا اسْطَاعُوا أَن يَظْهَرُوهُ﴾ (٩٧) الكهف: نەیانتوانی بەسەریدا بکەون، ﴿وَمَا اسْتَطَاعُوا لَهُ نَقْبًا﴾ (٩٧) الكهف: وە نەشیانتوانی کونی بکەن، خوا فەرمووی (جل جلاله): ﴿قَالَ هَذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّي﴾ (٩٨) الكهف، واتە: ئەوە ڕەحمەتی خوایە، ﴿فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ رَبِّي جَعَلَهُ دَكَّاءَ﴾

(٩٨) الكهف: وەختێ كه وەعدی خوای پەروەردگار هات ئەو سەددە تەخت دەكرێ و له بەردەمیان نامێنێ.

ئەوانه ئەوەنده زۆرن وەكو پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: هەریەكێكیان هەزار كەس لە نەوەكانی خۆی دەبینێ!! بۆیه خەتەرن لەسەر بەشەرییەت، پێغەمبەرﷺ هەرئەوكاته ئاماژەی پێداوەو فەرموویەتی: (وَيلٌ لِلعَرَبِ مِن شَرٍ قَد اقتَرَب)[١٥٢] وەیل بۆ عەرەب شەڕێك نزیكبۆتەوە شەڕی یەئجوج و مەئجوجه.

بەڵێ بەڕێزان: وەختێك كه خوای گەورە وەعدەكەی بەجێ دەگەیەنێ ئەوانه دێنەخوارەوە: ﴿حَتَّى إِذَا فُتِحَتْ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ﴾ (٩٦) الأنبياء، واته: وەختێك كه خوای گەورە سەددەكەیان بۆ تەخت دەكات لەهەموو بەرزاییێكەوە دێنەخوارێ! نازانی ئەوهاتنەخوارەوەی ئەوانه چەنده گەورەیه!، چیان پێیه؟! چەكی قورس و تۆپ و صاروخیان پێ نییه بەڵكو شیرو تیریان پێیه!، لەهەموو بەرزاییەكی دونیا دێنەخوارەوە ئەوەنده زۆرن!، هەرچی ئاوە نایهێڵن!، كانیاوەكان هەموو وشك دەكەن و ئەوەی كه دێنەسەری بیخۆنەوە ئاوی لەبەر ناڕوات!، گژوگیا ناهێڵن ئەوەندەی بیخۆن!، دانەوێڵەو سەوزەوات و میوەجات ناهێڵن!، حەیوانات بنەبڕ دەكەن و دێنەخوارەوە تەنانەت پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: دێنه سەر دەریاچەی (طَبَرِية) كه ئەوەنده گەورەیه ئەوەنده ئاوی لێ دەخۆنەوە ئاخیر كەس كه دێت دەڵێ: ئێره كاتی خۆی ئاوی لێ بووە!!، هیچ ئاوی لێ نەماوە تەنها شوێنەواری نەبێ!، حەزرەتی عیسا و مسوڵمانەكان زۆر ناڕەحەت دەبن و دوعا دەكەن و لەخوا دەپاڕێنەوە خوای گەورە ئەو بەڵایەیان لەسەر هەڵگرێ، بەڵێ خوای گەورە دوعاكەیان قبوڵ دەكات و هەموویان له كێوی (طور) كۆدەبنەوە لەنێوانی فەڵەستین و میسر، كه خوای گەورە لەسەر ئەو كێوە قسەی لەگەڵ حەزرەتی موسا كردووە: ﴿وَنَادَيْنَاهُ

---

[١٥٢] صحيح البخاري، كتاب الأنبياء، قصة يأجوج و مأجوج، رقم الحديث ٣١٦٨

مِـن جَانِـبِ الطُـورِ الْـأَيْمَنِ﴾ (٥٢) مـريم، خـوای گـەورە لەوشـوێنە بـەلاَو نەخۆشییەکیان بۆدەنێرێ کە کرمێکە پێی دەڵێن: (النَّغف)[١٥٣]، ئـەو کرمـە لـە قورگیان پەیدا دەبێ، کاتێ کە ئەو نەخۆشییە دەیـانگرێ هـەموویان بەیـەك شەو بۆگەن دەبن و دەمرن ئەوجار زەوی بۆگەن دەبێ بـەهۆی ئـەو هـەموو تەرمەیان!، ئەوجار مسوڵمانان دوعا دەکەن و لەخوا دەپاڕێنـەوە بۆئـەوەی زەوی بۆگـەن نـەبێ خـوای گـەورە باڵندەیـەکیان بـۆ دەنێـرێ کـە پێـشتر نەبینراوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ ملی وەکـو ملـی حوشـتر وایـە ئـەو باڵندەیە!، وەختێ کە هەڵیاندەگرن کـەس نـازانێ بـۆ کوێیـان دەبـەن ئـەو تەرمانە، بەجۆرێك کە هیچ تـەرمێکیان نـامێنێ و خـوای گـەورە ئەوانـە لادەبات و ئەرزیان لێ پاك دەکاتەوە.

بەڵێ خۆشەویستەکانم: ئا لەوکاتەدا کە خۆشی و ڕاحەت دروسـت دەبێتـەوە حەزرەتی عیـسا خۆشی دێنێتەوە سەر ڕووی زەوی، خوای پەروەردگار وادەکـات دەیکاتە هۆکاری خێرو خۆشی و ئاسایش و ڕزقی زۆر تەنانەت پێغەمبـەرﷺ دەفەرموێ: (لیسَ بین اثنَینِ عَـداوة) لە زەمەنی حـەزرەتی عیـسادا لـە نێـوانی دووکەسـان دوژمنایـەتی نـامێنێ!، تەنانـەت لـە فەرموودەیـەکی دیکـەدا ئەفەرموێ: (یَلعَبُ الصِّبیانُ بِالحَیَّاتِ)[١٥٤] منداڵ یاری بە ماری دەکـات پێیـەوە نادات!، ئاوا لەوزەمانە ماوەیەك دەمێننەوە دوایـی حـەزرەتی عیـسا وەفـات دەکات ئەوجا بەلاَو موصیبەت دروست دەبێتەوە دوای ئەو نیشانەیەکی دیکەی گەورەی قیامەت دێ:

---

[١٥٣] (..فیرسـل الله علیهم النغف في رقابهم فیصبحون فرسی کموت نفس واحدة).

صحیح مسلم، کتاب الفتن وأشراط الساعة، باب: ذکر الدجال وصفة وما معه، رقم الحدیث ٢٩٣٧

[١٥٤] صحیح ابن حبان، جزء ١٥، صفحة ٢٣٣، ذکر البیان بأن عیسی اذا نزل یَقتُل..، رقم الحدیث ٦٨٢١

سێ ڕۆژان خەڵك چاوەڕێ دەكات ڕۆژ هەڵنایێ!! ئەم ڕۆژە بۆ هەڵنایێ خەڵك نازانێ!! ڕۆژی چوارەم تەماشائەكەن ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە هەلاّت!، واقیعێكی زۆر گەورە كە كەس نەیبینیوە ئەو حاڵەتە بەسەر ئینسان دا دێ، هەمو ئینسانێك ئەوكاتە تەوبە دەكات!، لەخۆشی نییە!، پێغەمبەرﷺ فەرمووی لە صەحیحی بوخاری دا: (لا تَقومُ السَّاعة حَتَّى تَطلُعَ الشَّمسُ مِن مَغرِبِها، فَاِذا طَلَعَت فرَآهَ النَّاسُ أمَنوا أجمَعين)[155] ئەفەرموێ: قیامەت دانایێ تا ڕۆژ لە مەغریبەوە هەڵنێ، ڕۆژ لە مەغریبەوە هەڵدێت تا ناوەڕاستی ئاسمان دێت هەموو خەڵك دەیبینێ دوایی لە ناوەڕاستی ئاسمانەوە دەگەڕێتەوە بۆشوێنی خۆی، پێغەمبەرﷺ فەرمووی وەختێ خەڵك هەموو دەیبینێ (أمَنوا أجمَعين): هەموویان مسولمان دەبن بەلاّم ئایا ئیمانیان لێ وەردەگیرێ لەوكاتەدا؟ نەخێر، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (فَذاكَ حينَ لايَنفَعُ نَفساً إيمانُها لَم تَكُن أمَنَت مِن قَبل) ئا ئەو ڕۆژەیە كە هیچ نەفسێك ئیمانەكەی بەكەڵك نایێ چونكە پێشتر ئیمانی نەبووە، ئەوە موصیبەتی گەورەیە بۆیە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: تەوبە لە عەبد قبولّ دەكرێ هەتا ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە هەڵدێ، جا ئالەوكاتەوە دەرگای تەوبە دادەخرێ و تەوبە لە كەس وەرناگیرێ، كردەوەی چاك لەكەس قبولّناكرێ، نییەتی چاك لە كەس قبولّناكرێ، صولّح و چاكیی و ئاشتیی لەكەس قبولّناكرێ دوای ئەوەی ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە هەڵدێ.

**بەڵێ بەڕێزان:** ئالەوكاتەدا كە خەڵك تەوبەی لێ وەرناگیرێ ئیدی ڕۆژ ئاسایی دەبێتەوە پاش سێ ڕۆژان ڕۆژ وەكو جاران هەڵدێتەوە، ئەوجار نیشانەی شەشەم پەیدا دەبێ كە گیانداری زەوی(دابَّةُ الأرض) ی پێ دەڵێن، گیانداری زەوی چییە؟: خوای گەورە(جل جلالە) باسی دەكات لە قورئاندا:

---

[155] المسند المستخرج على صحيح مسلم، جزء ١: صفحة ٢٢٣، كتاب الأيمان، باب: في ذكر طلوع الشمس من مغربها، جزء الثاني من المستخرج.

﴿وَإِذَا وَقَعَ الْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَابَّةً مِّنَ الْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ النَّاسَ كَانُوا بِآيَاتِنَا لَا يُوقِنُونَ﴾ (٨٢) النمل، واتە: وەختێك فەرمانی سزایان بۆدرا ئەوە لەناو زەویدا گیانداری زەوی(دابَّةُ الأرض) یان بۆ دەنێرین، خۆ گیاندار زۆرن لە زەویدا! ئەی بۆچی خوا ئەفەرمویّ (گیانداری زەوی) دیارە ئەوە تایبەتە.

ئەو گیاندارە قسە لەگەڵ خەڵك دەکات بەهەمو زمانێك وەکو خوا دەفەرموێ: ﴿تُكَلِّمُهُمْ﴾(٨٢) النمل، واتە: قسەیان لەگەڵدەکات، پێیان دەڵێ: بەڕاستی زۆربەی ئەو خەڵکە باوەڕیان بە ئایەتەکانی خوا ناهێنن، سەرزەنشتیان دەکات، ئەوەندە قسە لەگەڵ خەڵك دەکات هەتا بێزارو بێتاقەتیان دەکات، هەتا وای لێدێ دەڵێن وەختێ کە یەکێك مامەڵەی شتێك دەکات حوشترێکی پێیە دەڵێ: کاکە ئەوە لە کێت کڕیوە؟ دەڵێ: لە لوت بە مۆرەکەم کڕیوە!، ئەو گیاندارە گیانداری زەوییە کە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی هاتنی قیامەت لەکاتی چێشتەنگاودا پەیدا دەبێ.

بەڕێزان: نیشانەی حەوتەم دوای گیانداری زەوی(دابَّةُ الأرض) کە بریتی یە لە دوکەڵ(دُخَّان)ێك کە دوای ئەو دوکەڵە مسوڵمان لەسەر زەوی نامێنن!، خوا دەربارەی ئەو دوکەڵە لە سورەتی (الدخَّان) دا دەفەرموێ: ﴿فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاء بِدُخَانٍ مُّبِينٍ يَغْشَى النَّاسَ هَذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ (١٠- ١١) الدخان، واتە: -ئەی موحەممەد- چاوەڕێ بکە وەختێك کە دوکەڵێکی ئاشکرا لەئاسمان پەیدا دەبێ هەموو خەڵکیی دادەپۆشێ: ﴿يَغْشَى النَّاسَ﴾، ئەو دوکەڵە لە ناوچەکانی یەمەنەوە دێت کە هەموو دونیا دەگرێتەوە، هەموو شارو گوندێك دەگرێتەوە، پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: ئەوەی مسوڵمان بێ توشی هەڵامەتی دەکات، ئەوەی کافر بێ لە هەموو کونەکانی دەچێتە ژووری و دەیئاوسێنێ و ئەستووری دەکات!، خوای گەورە بەڕەحمە نایەوێ مسوڵمانان چیتر لە زەوی دا ئازارو ئەشکەنجەو ئەو عەزابە سەختانە ببینن، خوای گەورە بایەك دەنێرێ

(هەروەکو لە خوتبەیەکی پێشودا باسمانکرد) بایەکی بۆنخۆش دەنێرێ هەرچی مسوڵمانەو ئیمانی بەقەدەر میسقالە زەڕڕەیەك لە دڵ و دەروونی دا هەبێ دەمرێ، هەموو مسوڵمانان بەو هەناسە خۆشە دەمرن!، تەنها کافرەکان دەمێنن، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (تَقومُ عَلَيهِمُ السَّاعة)[١٥٦] قیامەتیان لەسەر هەڵدەستێ!، ئەوانە دەمێننەوە کە دونیایان لەسەر خەراپ دەبێ!.

پاشان سێ ڕووچوون(خسف)ە گەورەکە دێ کە ئەو سێ ڕۆچوونە گەورەیە: ڕووچوونێك لە ڕۆژهەڵات و یەکێکە لە ڕۆژئاواو ئەویتریان لە جەزیرەی عەرەبی، کە ئەرز ڕۆدەچێ لەوکاتەدا و دیارە ئەوکاتە مسوڵمانان نەماون، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (يَخرب الكَعبَةَ ذو السَّويقَتَين مِنَ الحَبَشَة)[١٥٧] ئا لەوکاتەدایە کابرایەکی حەبەشی بەناوی (ذو السَّويقَتَين) کەعبە دەڕوخێنێ!، قیبلەی مسوڵمانان دەڕوخێنێ، کە (ذو السَّويقَتَين) لە وشەی (ساق: قاچ) ەوە هاتووە چونکە ئەوکەسە ژێر چۆکی واتە لاقی گچکەلۆکەو باریکن، بۆیە پێغەمبەرﷺ ناوی ناوە(ذو السَّويقَتَين) کە دەستەڵاتدارێکە لەکاتێکدا کە مسوڵمانان نەماون لە حەبەشەوە دێت پەردەی کەعبە لێدەکاتەوەو لەبنەوە خشتی دیوارەکانی دەڕوخێنێ!، بەڵێ دوای هەموو ئەمانە کۆتاهەمین نیشانە چییە؟: (وأخِرُ ذلِكَ نارٌ تَخرُجُ مِنَ اليَمَن)[١٥٨] ئاگرێکە لە یەمەنەوە پەیدا دەبێ و وردە وردە فراوان دەبێ و کافرەکان کۆدەکاتەوە: (تَطرُدُ النَّاسَ الى مَحشَرِهم) وردە وردە کۆیاندەکاتەوە بۆ مەحشەر!، کۆیاندەکاتەوە لە ناوچەکانی شام، ئەو ئاگرە کۆتاهەمین نیشانەی قیامەتە کە ئالەوکاتەدا وەختی مەحشەر دێت و خوای پەروەردگار ئەمر دەکات بە ئیسرافیل (مەلائیکەتی خۆی بۆ دونیا تێکدان) کە

---

١٥٦ تهذيب الأثار، جزء ٢، صفحة ٨٣٢، مسند عمر بن الخطاب: رقم الحديث ١١٧٦

١٥٧ صحيح البخاري، كتاب الحج، باب: قول الله تعالى (وإذ قال إبراهيم رب...)، رقم الحديث ١٥١٤

١٥٨ صحيح المسلم، جزء ٤، صفحة ٢٢٢٥، كتاب الفتن، باب: في الأيات التي تكون قبل الساعة، رقم الحديث٢٩٠١

دوو فوو زیاتر- بەپێی ڕاجیایی و ئیختیلافی موفەسیرین- ، لـە فـووی یەکـەم هەمووی دونیا تێکدەچێ و هەرچی زیندەوەرە تێیدا نامێنێ!: ﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَن شَاء اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُم قِيَامٌ يَنظُرُونَ﴾ (٦٨) الزمـر، پاشان فووێکی تـر دەکاتـەوە بـە (صـور: کەڕەنا) دا و هەمووکەسێك زیندوو دەبێتەوە، یەکەم کەس کە زیندوو دەبێتەوە پێغەمبەری خوایە (علیه الصلاة والسلام)، پێغەمبەر خۆی دەفەرموێ: یەکـەم کەس کە زیندوو دەبێتەوە منم، بەلاَم وەختێ کە زیندوو دەبمەوە تەماشا ئەکـەم حەزرەتی موسا دەستی بە پایەکانی عەرشی خواوە گرتووە (جـل جلالـه)!، کـە ئەوە فەرموودەیەکی دووردرێژەو ناچمە سەری..، نێوانی ئەو دوو فووە چەندە؟: ئەبو هورەیرە دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەرﷺ بوو فەرمووی: چلە، لێیـان پرسـی: چل ساڵ؟ فەرمووی نازانم! فەرموویان: چل مانگ؟ فەرمووی نازانم! فەرموویان: چل ڕۆژ؟ فەرمووی نازانم!، نێوانی ئەو دوو فووانە یان چل ساڵە یان چل مانگە یان چل ڕۆژە یان چل هەفتەیە...، خوا دەزانی!.

لێرەدا کۆتایی بەو وتارە دێنین، ئەو کۆمەڵە نیشانە گەورانە نیـشانەی هـاتنی قیامەتن و واقیعن و قورئان و فەرموودەی پێغەمبەرﷺ باسیان دەکـا، ئێمـەش دەبێ بە یەقینەوە باوەڕمان پێیان هەبێ و لێیان بترسین و خۆمان ئامـادە بکـەین بەتایبەت لە فیتنەی دەججال، دوعا بکـەین و بپاڕێینـەوە کـە خـوا لـە فیتنـەی دەججال بمانپارێزێ، چونکە زۆر نزیکە بەڕاستی!، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لەدوای هەموو تەحییاتەکانی نوێژدا دوعا بکەن و بڵێن: (اللَّهُمَّ إِنَّا نَعـوذُ بِـكَ مِـن عَـذابِ جَهَنَّم و مِن عَذابِ القَبرِ ومِن فِتنَةِ المَحيا والمَمات ومِن شَرِّ فتنَةِ المسيح الدَّجَّال).

یـاڕەببی خوایـە لـە فیتنـەی دەججـال بمانپـارێزی، خوایـە لـە ناخۆشـی و ناڕەحەتییـەکانی ئـاخیری زەمـان بمانپـارێزی، خوایـە لەسـەر دیـنی خـۆت ڕامانبگری، بە مسوڵمانی بمانژیێنی و بە مسوڵمانی بمانمرێنی، ئامین.

أقول قولي هذا وأستغفر الله لي ولكم ولسائر المسلمين، فاستغفِرُوهُ إنَّه كان غَفَّاراً ،

أعوذ بالله من الشيطان الرجيم

{رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ} أمين.

# تێکچوونی دونیا و هاتنی قیامەت

## بسم الله الرحمن الرحيم

إنَّ الحمد لله نحمده ونشكره ونستعفره ونستهديه، ونعوذ بالله مِن شرور أنفُسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضِلَّ له ومن يضلل فلا هادي لـه، ونـشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له ونشهد أنَّ سيدنا ونبينا محمداً عبده ورسـوله، هذا الرسول الذي بلغ الرسالة وأد الأمانة ونصح الأمة وجاهد في الله حق جهاده وتركنا على المحجة البيضاء، ليلها كنهارها، لايزيغ عـنها إلا هالـك صـلواة اللهِ وسلامه عليه وعلى أله وأصحابه، صلاةً وسلاماً الى يوم الدين ...، أما بعد يا عبادالله أوصيكم ونفـسي أولاً بتقـوى الله وطاعتـه، فـإنّ اللهَ مـع الـذين اتقـو والذين هم محسنون، قال الله سبحانه وتعالى في كتابـه الحكـيم، بـسم الله الـرحمن الرحيم: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِـدَةٍ وَخَلَـقَ مِنْهَـا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِـنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ (١) النساء.

ئیماندارانی بەڕێز، خۆشەویستانی خواو پێغەمبـەر ﷺ ، سـەلامی خـوای پەروەردگارتان لەسەر بێت ، ڕەحمەتی خوای گەورە بڕژێتە سەر ئێمەی مسوڵمان و هەموو مسوڵمانانی دونیا لەم ڕۆژە پیرۆزەدا، بـەڕێزان: ئـەو دونیایـەی کـە ئەمڕۆ ئێمە بەچاوی گەشمان دەیبینین ، خـەڵك لەسـەری بەشـەڕدێت و یـەکتری دەکوژێ، وەخەڵکی مونافەسەی لەسـەردەکات، ململانێیـەکی توونـدو بگـرەو بەردەیەکی زۆر لەسەر دارێك ، لەسەر ئاوێك، لەسەر سنوورێك، ئەو دونیایـەی کە ئێمە دەیبینین ، ئەو دوکان و بازاڕو دائیرە و ئـەو مێوەجـات و زڕاعـەت و شـەریکات و هـەموو ئەوشـوێنە ئاوەدانکراوانـەی دونیـا ..، ڕۆژێـك دێـت دەپێچرێنەوە !، وە ڕۆژێك دێت ئەو ڕۆژە ڕووناکە نامێنێت، ڕۆژێك دێ دینار و

دۆلار نامێنێ!، ڕۆژێك دێت قەسرو سەیارە نامێنێ!، ڕۆژێك دێ وەزیفەی دائیرەو دەوامی شەریکەو شوێنە گشتی یەکان نامێنێ، دووکان و بازاڕ نامێنێ، هەمووی دەپێچرێتەوە بۆ ژیانێکی تر ، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ الأَرْضُ غَيْرَ الأَرْضِ وَالسَّمَاوَاتُ وَبَرَزُواْ للّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ﴾ (٤٨) إبراهيم. واتە: ڕۆژێك دێ ئەو ئەرزە بەدل دەبێ ، دەگۆڕێ بە ئەرزێکی تر ئاسمانیش هەروا.، ئەو ئەرزە چۆن دەگۆڕێ؟!، دونیا چۆن وێران دەبێ؟! کەی و چۆن تێکدەچێ ؟! ئینسانەکان لەکاتی دونیا تێکچوون دا چیان لێدێ؟ چ دەقەومێ؟ ..، با لەوتاری ئەمڕۆی جومعەدا لە خزمەت ئەو بابەتەدا بین بۆ ئەوەی ئێمەی مسوڵمان بزانین ئەو دونیایە هەروا گەش و جوان نابێت لەبەر چاومان لەبەرامبەر هەست و شعورمان کە تێیدا دەژین، شەوو ڕۆژ خۆمان تێیدا ماندوو دەکەین، شەو دەخەینە سەر ڕۆژو ڕۆژ دەخەینە سەر شەو، خۆمان لەسەری بەهیلاك دەدەین و دەفەوتێنین!، بابزانین ئەم دونیایە دەڕوات و بۆ کەس نامێنێ!، بابزانین ئەم دونیایە چی بەسەردێت و چۆن تێکدەچێت؟، لەژێر ڕۆشنایی قورئانی پیرۆز و فەرموودە پیرۆزەکانی پێغەمبەرﷺ باسی دەکەین:

بەڕێزان: بەگشتی ئینسان زۆر بێئاگایە، زۆر نەزانە کە غافڵە لەڕۆژی قیامەت، کە خوای پەروەردگار پێی دەفەرموێ: ﴿اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مَّعْرِضُونَ﴾ (١) الأنبياء، واتە: حیسابی ڕۆژی قیامەت بۆ خەڵك نزیك بوتەوە بەڵام خەڵك بێئاگایە، با گوێبگرین لە ئایەتێکی قورئانی پیرۆز بزانین خوای گەورە چۆن باسی ژیانی دونیا دەکات، وەکو لەسورەتی (یونس) ئایەتی ٢٤ دەفەرموێت : ﴿إِنَّمَا مَثَلُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَاء أَنزَلْنَاهُ مِنَ السَّمَاء فَاخْتَلَطَ بِهِ نَبَاتُ الأَرْضِ﴾ (٢٤) يونس، واتە: نموونەی ئەو دونیایە وەکونەوە وایە ئاوێك لە ئاسمان بنێرینە خوار پاشان لەزەوی دا گیاوگوڵی پێ سەوز ببێ و بڕوێت، ﴿مِمَّا يَأْكُلُ النَّاسُ

وَالأَنْعَامُ﴾ (٢٤) یونس، ئەو ڕووەك و گیاو گوڵ و بەرهەمەی کە لەزەویدا دەڕوێ لەوەی کە خەڵك دەیخوا، وە لەوەی مالاٌتیش دەیخوا بەچاوی خۆتان دەبینن، ﴿حَتَّىَ إِذَا أَخَذَتِ الأَرْضُ زُخْرُفَهَا وَازَّيَّنَتْ وَظَنَّ أَهْلُهَا أَنَّهُمْ قَادِرُونَ عَلَيْهَآ أَتَاهَا أَمْرُنَا لَيْلاً أَوْ نَهَارًا﴾ (٢٤) یونس، واتە: هەتا وای لێدێت، ئەو ئەرزە و گژوگیاکەی ئەوەندە جوان دەبێت، سەوزەوات و میوە ئەوەندە جوان دەبێت، باخچەو بێستان ئەوەندە جوان دەبێت و دەڕازێتەوە، خەڵکەکە وادەزانێ دەتوانێ بەروبوومەکەی هەتاسەر بخوات، هەتا فەرمانی ئێمەی بۆدێت کە کۆتایی بەو بەروبوومە و ژیانی دونیا دێنێ: ﴿أَتَاهَا أَمْرُنَا لَيْلاً أَوْ نَهَارًا﴾ (٢٤) یونس، واتە: بە ڕۆژبێت یا بەشەو بڕیاری ئێمەی بۆ دێت، نەیفەرمووە بەڕۆژ فەرمان دەردەکەین وە نەیفەرمووە بەشەو، بەڵکو فەرموویەتی بەشەو یا بەڕۆژ چونکە هەمووکاتێ لایەکی زەوی شەوەو لایەکەی دیکەی ڕۆژە، بەوشێوەیە فەرموویەتی بۆنەوەی هەموو زەوی بگرێتەوە، ﴿فَجَعَلْنَاهَا حَصِيدًا كَأَن لَّمْ تَغْنَ بِالأَمْسِ﴾ یونس (٢٤)، واتە: ئێمە وای لێ دەکەین کە هەمووی وشك بێت، بەئاوو بەدارەوە وە بەدرەختەوە، بە سەوزەواتەوە، بەدانەوێڵەوە، بە هەمووجۆرە زراعەتێك و گیاو گوڵێکەوە کە سەوز بووە لەسەر ڕووی زەوی، هەمووی وشك بێت هەروەکوو دوێنێ هیچ نەبووبێ، خوا ئەفەرموێ: ﴿كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (٢٤) یونس، واتە: ئێمە ئایەتەکانی خۆمان ئاوا بۆئێوە ڕوون دەکەینەوە بۆ قەومێك و میللەتێك و بەنی ئادەمێك کە بیربکاتەوە لەحاڵی خۆی: (لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ)، بیر بکاتەوە لەم دونیایە کە بزانێ دونیا ئاوایە، بەڵێ خۆشەویستەکان: دونیا ئاوایە جا ئەگەر دونیایەك بێ ئاوا خوای پەروەردگار بە کاتیی و بەکەمیی تەماشای بکات ، ئێمە چۆن دەبێت هەموو ژیانی خۆمانی لە خزمەتدابنێین، ژیانێکی بەرزو بەڕێزو ژیانێکی هەتاهەتایی لە خزمەتی دابنێین و بیگۆڕینەوە بە ژیانێکی کەم کەدونیایە و بەچەند ساڵێکی کەم بەسەری دەبەین.

بابزانین ئەو خۆرە جوانەی كەبەیانیان لە ڕۆژهەلاتەوە هەڵدێ و دێتەدەرو لە ڕۆژئاواوە ون دەبێ و دەڕوات و، ئـەو مانگـە جوانـەی كـە ئـەیبینین، شەوان ڕووناكیمان پێدەبەخـشێ بەفـەزڵی خـوا خـوای گـەورە كردوویـەتی بەڕەحمـەت بـۆ ئێمـە، وە ئـەو ئەسـتێرە جوانانـەی كـە لەئاسمانەكانـدا ئەدرەوشێنەوە، ئەو هەسارە(كوكب) انەی كە لە ئاسمانەكاندا هـەن و ئێمـە نەمانبینیون..، ئەوانە هەموویان نامێنن!، ئەو چیاو شـاخانەی كـە ئێمـە دەیانبینین نامێنن!، چیان بەسەردێ؟، ئەو دەریاو زەریایانـەی كەهـەن لـە دونیا (كە لە چوار بەشی زەوی سێ بەشی ئاوە) ئەوەش هەمووی نـامێنێ! چۆن نامێنێ؟ چی بەسەردێ؟ چۆن وێران دەبـێ؟ بـابزانین بـچینە خزمـەتی قورئانی پیرۆز بـزانین چـۆن و بـەچ شـێوەیەك وێـران دەبـێ بـەڵكو پەنـدو عیبرەتی لێ وەربگرین و بەخۆماندابچینەوە و دەستەلاتی خوای گـەورەمان زیاتر بۆ ڕوون ببێتەوە!.

خۆشەویستەكانم..، ئاخیرین نیشانەی قیامەت كەهات بریتی یـە لـەوە كـە هەرچی ئیمانداره لەسەر ڕووی زەوی نامێنێ، خوای گەورە تەقدیری وایـە دوای ئەوەی نیشانەگەورەكان یـەك لـەدوای یـەك هـاتن پێغەمبـەرﷺ ئەفـەرموێ: نیشانەكان زۆر بە سەریعی بەدوای یەكدا دێن، هەر لە دەجالەوە هـەتا دەگاتـە ئەوە كە ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە دێتەدەر بۆ ڕۆژهەلات، ئەوكاتـە كـە تەوبـە لـەهیچ كەسێك قەبوڵ ناكرێت، مـسوڵمانان هەموویان دەمرن بەهۆی ئەوەوە كە بایەكی نەرم دێت، ئەوبایە نەرمە بەژێر لووتی هەموو مـسوڵمانێكدا دێت، هەرچی كە ئەوبایە هەستپێبكات ڕووحەكەی تەسلیم بە (ملك الموت) دەكـات و دەمرێـت، ئەوەی دەمێنێ شیراری خەڵقە، وەكو لەفەرموودەیـەكی صـەحیحی پێغەمبـەر ﷺ كە ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی كردووە دەفەرموێ: خەڵكانێكن لەسەر ڕووی زەوی دەمێنن وەختێ كە دونیا خراپ دەبێت و ئەوان دەبینن، بێباوەڕان دەبینن

كە دونیا تێكدەچێ ئەوەش لەڕەحمەتی خوایە!، خوای گەورە ئیمانداران هەمووی بۆلای خۆی دەباتەوە وە بێباوەڕان دەهێڵێتەوە بۆ ئەوەی كاتێ كە دونیا تێكدەچێ ئەو بارودۆخە ناخۆشە ببینن بە چاوی خۆیان!.

بەڵێ خۆشەویستەكانم..، زۆر بە كتوپڕ و سەریعی ئەو بارودۆخە ڕوودەدات بە جۆرێ كە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَمْرُ السَّاعَةِ إِلاَّ كَلَمْحِ الْبَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَبُ..﴾ (٧٧) النحل، واتە: هاتنی قیامەت لە چاو نووقاندنێك دایە یان لەخێراییدا لەوەش زیاترە!، خوا (جل جلاله) دەفەرموێ: بەیەك لەحزە چی ڕوو ئەدات لەو كەونەدا، لە ئەرزدا لە ئاسمانەكاندا، با تەماشا بكەین: خوای پەروەردگار دەفەرموێ: وەختێ كە ئەو بارودۆخانە ڕوودەدەن ئینسانەكان هەریەكەی لە شوێنی خۆیان، هی واهەیە لەسەر دوكانە، هی واهەیە لەسەفەرە، هی واهەیە لە دائیرەیە،لەڕاستیدا بێباوەڕە و ماوە!، دەیەوێ بگەڕێتەوە ماڵی خۆی وەزعێكی گەورە ڕووداوێكی گەورە لەو كەونە ڕویداوە، كەپێشتر كەس نەیبینیوە بە چاوی خۆی، دەفەرموێ: ﴿فَلَا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً وَلَا إِلَى أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ﴾ (٥٠) یس، واتە: نە ئەتوانن وەسیەت بكەن، وە نەئەتوانن بگەڕێنەوە ناو ماڵ و منداڵی خۆیان، نە كەسێك ئەتوانێ بەیەكێك بڵێ بڕۆلای ماڵ و منداڵم منداڵەكانم بەتەنهان، یان ئەو وەسیەتەت بۆدەكەم برۆ پێیان بڵێ: ﴿وَلَا إِلَى أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ﴾ (٥٠) یس، وە نەدەشتوانن بۆلای ئەهل و ماڵ و منداڵیان بگەڕێنەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵیان، لە وەزیفە یان لەدائیرە یان لەدوكانێ یان لەهەر شوێنێ كەهەیە.

ئاسمانەكان چیان بەسەردێت؟، خوای گەورە(جل جلاله) دەفەرموێ: ﴿إِذَا السَّمَاء انشَقَّتْ﴾ (١) الإنشقاق ، وەختێ دونیا تێكدەچێ كە ئاسمان شەق شەق دەبێت!، ﴿إِذَا السَّمَاء انفَطَرَتْ﴾ (١) الإنفطار، واتە: ئەو ئاسمانە لەت لەت دەبێت!، لە ئایەتی تردا ئەفەرموێ: ﴿وَانشَقَّتِ السَّمَاء فَهِيَ يَوْمَئِذٍ وَاهِيَةٌ﴾

(١٦) الحاقة، واتە: ئاسمان پارچە پارچە دەبێت!، لەو ڕۆژەدا بێ کەڵك دەمێنێتەوە، ئەو نیزامەی ئاسمانەکانیش تێکدەچێ.

ئەوخۆرە چی بەسەردێ؟!، ئەو ڕۆژەی کە ئێمە دەیبینین ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ﴾ (١) التكوير، واتە: ئەو ئاسمانە ڕووناکی یەکەی لێ دەستێنرێتەوەو دەپێچرێتەوەو دەگۆڕێت، ئەو خۆرەی کە ئێمە لێی بەهرەمەندین ڕووناکی ئەداتەسەر هەموو زەوی، تیشکی خۆر کە ئینسانی پێ دەژیێ، وەگیانەوەر و ڕووەکی پێ دەژیێ ، ئەو ڕووناکیەی لێ دەستێرنرێتەوە، ئەو دونیایە تاریك دەبێت!.

ئەستێرەکان چیان بەسەر دێت؟!، لە ئاسماندا ئەستێرەکان دوو جۆرن: ئەوانەی کە ڕووناکی ئەدەن پێیان دەگوترێ ئەستێرە (نجم) کە ڕووناکی دەبەخشن و تیشکیان هەیە وەکو خۆر، وە ئەوانەش کە ڕووناکی نادەن پێیان دەگوترێت هەسارە(کوكب)، لەبارەی هەردوو جۆریان خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا النُّجُومُ انكَدَرَتْ ﴾(٢) التكوير، وەختێك دونیا تێکدەچێت کە ئەو ئەستێرانە هەموویان دەکوژێنەوەو ڕووناکیان لێ دەبرێ، ئەو ئاسمانە تاریك دەبێت!، ﴿وَإِذَا الْكَوَاكِبُ انتَثَرَتْ﴾ (٢) الإنفطار، ئەو هەموو ئەستێرەو هەسارانە کە لە ئاسمانەکان هەن هەموو دەکەونە خوارەوە!، خۆر و مانگ و ئەستێرەکان بەوانەش کە ڕووناکی دەبەخشن، وە بەوانەشەوە کە ڕووناکی نابەخشن هەموویان تێکەڵ دەبن!، وەهەموویان لێك نزیك دەبنەوە، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَجُمِعَ الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ﴾ (٩) القيامة، واتە: ئەستێرەو مانگ هەمووی کۆدەکرێنەوە، وەختێ کە لێك نزیك بوونەوە: ﴿يَقُولُ الْإِنسَانُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ الْمَفَرُّ﴾ (١٠) القيامە، واتە: ئینسان دەڵێ بۆکوێ بڕۆم؟!، لەکوێوە خۆم ڕزگار بکەم؟، هاوار بۆ کێ دەکات و بۆ کوێ بڕوات؟!،﴿كَلَّا لَا وَزَرَ * إِلَى رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ الْمُسْتَقَرُّ﴾ (١١-١٢) القيامة، واتە: نەخێر، هیچ پەناو ڕێی

دەربازبوون نییە، ئەی ئینسانە بەرەو خوای خۆت دەبێ بڕۆی، لەورۆژەدا نیشتەجێی بەندەکان بۆ خوایە.

بەڵێ خۆشەویستەکانم...، شتێکی ڕوون و ئاشکرایە کە خۆر ۹۳۰۰۰۰۰۰ نەوەدوسێ ملیۆن میل لەزەوی ئێمە دوورە!، پاشان تیشکی خۆر بە هەشت دەقیقە دەگاتە ئێمە!، واتە هەشت دەقیقە نەوەدوسێ ملیۆن میل دەبڕێت، بەڵام با ئەوە بزانین کە ئەستێرەی واهەیە یەك ملیۆن ساڵ تیشکی بەرێوەیە. ئینجا ناگات بە ئێمە!!، یەك ملیۆن ساڵ تیشکی ئەو ئەستێرە بە ڕێگاوەیە هەتا دەگاتە زەوی، ئەوە کە ئینسان بە نزێککراوەیی دەرکی کردووە ئەگەرنا زۆر شت هەیە کە ئینسان نایزانێ، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَخْلُقُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾ (٨) النحل، واتە: خوای گەورە شتی وای دروستکردووە کە ئێوە نایزانن!، ﴿وَاللّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ (٦٦) آل عمران.

بەڵێ خۆشەویستەکانم، ئەگەر هاوینان صاف بێت و شەو سەرنجتان دابێت لە سەربانێك تەماشای ئاسمان بکەی، دەبینی شتێکی سپی لەئاسمان ڕاکشاوە، ئەوە پێی دەگوترێ ڕێی کاکێشان کە بە عەرەبی پێی دەگوترێ (دربُ التبان)، وەکو کەسێك کە چۆن کای دەکێشێتەوە لەرێگا کای لێ دەرژێ و دەکەوێ، ئەورێگایە سپی دەکات، ئاوا ئەو ڕێگایە لە ئاسماندا دیارە وەك کای لێ ڕژابێ وایە، ئەوە هەمووی ئەستێرەیە، لەبەر دووری ئەو ئەستێرانە وەکوو سپیایەتییەك دیارە، زانایان دەڵێن: ۳۰ ملیار ئەستێرە لەم مەجەرڕەیە(مەجەرڕەی ڕێی کاکێشان) هەیە، کە هەر ئەوزانایانە دەڵێن: (٥٠٠٠٠٠) پێنج سەد هەزار مەجەرڕەی لەوشێوەیە لە ئاسماندا هەیە!، کە هەریەکێکیان ۳۰ ملیار ئەستێرەی تێدایە، کە ئەستێرەی واهەیە سەدان و هەزاران جار لەودونیایە گەورەترە کەئێمە لەسەری دەژین!، کە تیشکی ئەستێرەی واهەیە سەدان بەڵکو هەزاران ساڵی ڕووناکی بەرێوەیە تا دگات بە ئێمە!، وە هەیانە یەك ملیۆن ساڵی ڕووناکی تیشکی بەرێوەیە تا دەگات بە

ئێمە!!، لەکاتێکدا کە تیشکی خۆر بە هەشت دەقیقە دەگات بە سەرزەوی...، جا با تەماشابکەین ئەو ئەستێرانە کە ئەکەونەخوارەوە، ئەو هەموو ئەستێرەو هەسارەو مانگ و ڕۆژیش، کە هەریەك مانگ و خۆر نییە بۆ زانیاریتان چونکە ئەو خۆرەی کە خۆری ئێمەیە خۆری زەوی پێدەڵێن، بەلاّم زۆر خۆری تر لە ئاسمانەکانداهەیە کە دوورە لە ئێمە نایبینین..، تیشکی بە زەحمەت دەگات بە ئێمە، زۆر مانگی تریش هەیە بەلاّم ئەو مانگەی کە ئێمە ئەیبینین پێی دەوترێ مانگی زەوی، خوای گەورە وەکو نیعمەتێك بۆ ئێمەی داناوە، جا ئەوهەموو هەسارەو ئەستێرەو خۆرو مانگە کە دەکەونە خوارەوە و پێکدەکەون دەبێ چی ڕوویدات؟! ئەو واقیعە گەورەیە! ئەو قیامەتە، هاتنی ئەو وەزعە، چۆن ئینسان تەحەمولی دەکات بێنێ؟، بۆیە خوای گەورە ڕەحمی کردووە بە ئینسانی مسوڵمان لەوکاتەدا نەمێنێ و بۆلای خوای گەورە بچێتەوە، ئەوەش فەزڵی خوای گەورەیە(جل جلاله).

لە زەویدا چی ڕوودەدات؟! ، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَحُمِلَتِ الْأَرْضُ وَالْجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَاحِدَةً﴾ (١٤) الحاقة، واتە: وە زەوی و شاخەکان هەڵگیران و بەرزکرانەوە یەك جار پێکدەکەون و هەپرون بە هەپرون دەبن، لێکدەدرێن و پێکدانەدرێن، ئەوچیایانەی سەرزەوی نامێنن، ئەو شاخانەی کە خۆیان داکوتاوە لەسەر ڕووی زەوی: ﴿وَالْجِبَالَ أَوْتَادًا﴾ (٧) النبأ، واتە: چیاکانمان وەکو سینگ داکوتاون، ئەوانە نامێنێ، چیان بەسەر دێت؟ خوا(جل جلاله) ئەفەرموێ: ﴿وَتَكُونُ الْجِبَالُ كَالْعِهْنِ الْمَنفُوشِ﴾(٥) القارعة، واتە: ئەو چیایانە ئەوەندە سوك دەبن وەکو خوری لێکهەڵوەشاو، چۆن ئەو خوریە لێك جیا دەکرێتەوە و داو داو دەبێت، ئەو چیایانەش ئاوا سووك دەبن و هەڵدەوەشێن بەشێوەیەك کە ئەفەرموێ: ﴿ {وَإِذَا الْجِبَالُ سُيِّرَتْ} (٣) التكوير، واتە: وەختێ کە زنجیرە چیایەکان بەڕێ دەکرێن و دەڕۆن!، ئەو زەویە تەخت دەبێ!، ئەو دەریاو زەریا گەورانە ..، ئەو زەریایانەی کە چاو حوکمی ناکات و نایبینێ چی بەسەر دێت و

ئەو هەموو ئاوە بۆ کوێ دەچێت؟!، تەماشابکەن خوای پەروەردگار(جل جلاله) چی دەفەرموێت! دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا الْبِحَارُ فُجِّرَتْ﴾ (٣) الإنفطار، واتە: دەریاکان ، زەریاکان هەموویان بەتێکڕا دەتەقنەوە!، هەر دڵۆپە ئاوێك لەو بەحرانە وەکو زەررە دەتەقێتەوە!!، ئێمە ئێستا دەبینین دەڵێن: بەشەریەت قونبەلەی (نَوَوي) دروستکردووە، یاخود هایدرۆجینی و نایترۆجینی و جرثومی ...، ئەوانەی کە هەن ئەمڕۆ، یان کە ئەمریکا نەوەوی لە جەنگی دووەمی جیهانی بەکارهێناوە دژی یابان لەساڵی ١٩٤٥ز دا بزانە کاریگەری چەند بووە!، ئێستاش باس دەکرێت لە هێرۆشیما و ناکازاکی کە لێیان در بەچەند چرکەیەك زیاتر لە ٢٥٠٠٠٠ دوسەدو پەنجا هەزار کەسی کوشت!، جا دەبێ ئێستا ئەو قونبەلە زەررەی کە بەکاردێ و لەلایەن بەشەر دروستکراوە چەند کەس بکوژێ!، بەلاّم ئەو بەحرانەی کە ئەتەقنەوە هەر دڵۆپە ئاوێك دەبێتە قونبەلەیەکی زەرری!، وەکو سەید قوتب (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە تەفسیری ( في ظِلال القُرأن) دا ئەفەرموێ: ئەگەر بەراوردی تەقینەوەی بەحرەکان لەکاتی دونیا تێکچوون و لەگەڵ قونبەلەی زەرری بەشەردا بکەین وەکو یاری مندالآن دێتە بەرچاو!.

جا تەماشا بکە ئەو بەحرانە ئاوا ئەتەقنەوە کە هەر دڵۆپە ئاوێك لە شوێنی خۆی دەتەقێتەوەو هەموو ئەو هەوایە دەتەقێتەوە، پاشان هەربەوە خوای پەروەردگار لێی ناگەڕێت، دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا الْبِحَارُ سُجِّرَتْ﴾ (٦) التکویر، پێشتر ئەفەرموێ: (فُجِرَت) دەتەقنەوە، بەلاّم ئەوجارە ئەفەرموێ: (سُجِرَت) ئاگریشی تێبەردەدرێت!، هەر دڵۆپە ئاوێك لەو دڵۆپە ئاوانە لەگەڵ تەقینەوەکەی گڕیش دەگرێت!، ئەو گڕگرتنە لە لەحزەیەکدا کە ئاسمانەکان ( بەو هەموو ئەستێرەو هەسارەو مانگ و ڕۆژەوە) هەموویان دەکەونەخوارەوە ، هەموویان لێك نزیکدەبن و خۆ لێکدەدەن،..، دەبێ چ مەشهەدێك بێت!!، دەبێ چ وەزعێك بێت؟، دەبێ چۆن ئینسان بەرگەی بگرێت تەماشای بکات؟! ، خوا ڕەحمی بە ئێمە کردووە .

بەڵێ خۆشەویستەکانم، تا لەو وەزعانەدایە کە بەحرەکان تێکڕا دەتەقنەوەو دونیا دەبێتە یەك پارچە ئاگر: ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ الأَرْضُ غَيْرَ الأَرْضِ وَالسَّمَاوَاتُ﴾ (٤٨) إبراهيم ، واتە: تا ئەو ئەرزە بەدل دەبێ بە ئەرزێکی تر، ئەم ئەرزە خەراپەی لەسەرکراوە: ﴿ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ﴾ (٤١) الروم، واتە: گرانی و ناخۆشی و نائەمنی لە وشکانی (البَر) و دەریا (والبَحر) دەرکەوت بەهۆی کردەوەی ئینسانەکان، ئەو ئینسانە ئەوەندە بێ وەفایە، ئەوەندە بێ نمەکە، ئەوەندە سپڵەو خراپەکارە، ئەوەندە جاهیلە کە نەك هەر وشکانی پیس کردووە بەڵکو ناو بەحریشی پیسکردووە!، (بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ) بەهۆی خراپەکاری و تاوانی خەڵکی، جا هەمووی دەسووتێ و دەگۆڕێ بەرویەحر!!.

ئێمە زۆر جار دەبینین لە تەلەفزیۆنەکاندا کە بورکانێك لە شوێنێك دروست دەبێ چەندە پێمان سەیرەو تەزوومان بەلەش دادێت !، تەماشاکەین ئەو ئاگرە لەوئەرزە دێتەدەرەوە جاری واهەیە نەو ئاگرە لەناو دەریا دێتەدەرەوە چەندە گەورەبێت ئەوەندە مەشهەدێکی بچوکە خوا پێشانمان ئەدات!، ئەی دەبێت چۆن بێت ئەگەر ئەو هەموو کەونە ببێتە ئاگر ..، سبحان الله پاکی بۆ ئەوخوایە کە تاك و تەنیایە تاکە دەستەڵات کە دەمێنێ ئەوکاتە هەر دەستەڵاتی ( ربُ العالمين)ە!.

ئەو ئەرزە ، ئەو ئاسمانە، ئەو ئەستێرانە، هەموویان نامێنن، کەس نامێنێ!، هیچ شتێك نامێنێ کە فەخرو شانازی پێوەبکرێت!، ئەو قەسرەجوانە کە ئێستاکە لەبەر چاوی خۆمان دەیبینین، ئەو ماڵ و سەیارەو ڕێگاوبان و باخچەو بێستانەجوانە!، ئەو دینارو دۆلارە، ئەوهەموو پێشکەوتنەی کە ئەمڕۆ لەسەر ڕووی زەوی هەیە، وەکو پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: بینایەی بەرز بەرز دروست ئەکرێن ، لە نیشانەکانی ئاخیری زەمانەو، لە نیشانەکانی دونیا تێکچوونە، ئەوانە هیچیان نامێنن!، جا کاتێ کە کەس نەما تەنانەت ( ملك الموت) فریشتەی گیانکێشانیش نامێنێ، دوای مردنی هەموو فریشتەکان جوبرائیل و ئیسرافیل و میکائیل و ملك الموت..، ئەوەی کە هەمیشە وجودی

دەبێ تەنها زاتی {اللە} یە (جل جلالە)، بۆیە خوای گەورە ئەوکاتە دەفەرموێت: ﴿لِمَنِ الْمُلْكُ الْيَوْمَ﴾ (١٦) غافر: ئەو موڵکە ئەمڕۆ هی کێیە؟، ئەو دونیایە تا دوێنێ لەسەری بەشەڕدەهاتن، ئەو ئەرزەی تا دوێنێ شەڕتان لەسەری ئەکرد بە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا ، باکوور و باشور ..، باخچەی ئەم و بێستانی ئەم ، سنووری ئەم دێیەو سنووری ئەو دێیە، ئەو قەوم و ئەو عەشیرەتە، ئەم حیزبەو ئەو حیزبە..، هیچی نەما!، خوا ئەفەرموێت: ﴿لِمَنِ الْمُلْكُ الْيَوْمَ﴾ (١٦) غافر، ئەمڕۆ موڵك و دەستەڵات هی کێیە؟، کەس نییە وەڵامی بداتەوە، دوایی هەربۆخۆی دەفەرموێ : ﴿لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ﴾(١٦) غافر، واتە: بەتەنیا هی ئەو خوایەیە کە تاکەو دەستەڵاتدارە، تاکە زاتە کە خاوەنی لێ ترسان و کڕنوش بۆ بردنە، هەر ئەوخودایە خاوەنی دونیاو قیامەتە، هەرئەوە کە دەژیێنێ و دەمرێنێ، هەموو شتێك هەر بەدەستی ئەوەو خاوەنی هەموو سیفەتێکی بەرزو پەسەندە.

بەڵێ خۆشەویستەکانم، دوای ئەوە وەکو پێغەمبەرﷺ فەرمووی: چەند ساڵێك - هەندێك ئەفەرموون چل ساڵ یان کەمتر لە نێوان نەفخەی یەکەم و دووەم، هەندێك ئەفەرموون ئیسرافیل سێ جار نەفخ دەکات، فوو دەکات بە (کەڕەنا)دا، وە هەندێك ئەفەرموون دووجارە، جاری ئەخیر خوای پەروەردگار ئەمردەکات ئیسرافیل زیندوویکاتەوە بۆئەوەی جارێکی تر فووبکاتەوە بە کەڕەنادا ئەوکاتە هەرچی ڕووح لەبەرە لە مەیدانی مەحشەر زیندوو دەبێتەوە بە ئەمری خوا(جل جلالە).

یەکەمین ڕووح لەبەر کە زیندوو دەبێتەوە (ئیسرافیل)ە، دوای ئەوە هەموو خەڵکەکە تەنانەت گیانلەبەرانیش لە مەیدانی مەحشەر هەموویان زیندوودەکرێنەوە!، بەڕێدەکرێن بۆ ئەوشوێنەی کە حەشریان لێدەکرێ، بۆیە خوا ئەفەرموێ: ﴿وَاتَّقُواْ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللّهِ ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ﴾ (٢٨١) البقرة، واتە: پارێز بکەن لەوڕۆژەی کە هەمووتان

تێیدا دەگەڕێنەوە بۆلای خودا!، ئەو کەونە ئاوا دەگۆڕێ ئەو ئینسانەش هەمووی زیندوو دەکرێتەوە، جا خەیاڵیان خاوە ئەوکەسانەی کە ئەڵێن: بە دونیا نەجاتمان ئەبێ!، ئەوکەسانەی کە ئەڵێن: سزای خراپەکارو پاداشتی چاکە نییە!، ئەو کەسانەی کەئەڵێن: دونیا هەر ئەو دونیایەیە کە ئەمڕۆ هەیەو، ژیانی تر نییە..، خەیاڵیان خاوە!، خوای پەروەردگار ئەفەرموێت: ﴿أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَلَّن نَجْمَعَ عِظَامَهُ بَلَى قَادِرِينَ عَلَى أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُ﴾ (٣-٤) القيامة، واتە: ئینسان وا گومان دەبا کە ئێمە زیندووی ناکەینەوەو ئێسکەکانی کۆناکەینەوە، بەڵێ ئێمە دەستەڵاتمان هەیە کە سەرە پەنجەکانیشیان وەکوخۆی دروست بکەینەوە!، (بَنان) یەعنی: سەرە پەنجەکان ئەوخەتانەی کە لەسەری پەنجە هەیە کە بۆ مۆرکردن بەکاردێت، چونکە هی هیچ کەسێك وەهیچ کەسێك ناچێت!، خوای گەورە وەك چۆن توانای دروستکردنی سەرەپەنجەکانی بەوشێوەیە هەیە ئاواش مردووان زیندوودەکاتەوە، وەکو کابرای بێباوەڕ گوتی: ﴿مَنْ يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ﴾ (٧٨) یس: ئەو ئێسکە ڕزیوە کێ زیندوی دەکاتەوە لە دوای مردن؟، خوای پەروەردگار وەحی نارد بۆ پێغەمبەرﷺ فەمووی پێی بڵێ: ﴿قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ﴾ (٧٩) یس، واتە: پێی بڵێ" ئەوە زیندووی دەکاتەوە کە یەکەم جار دروستیکردووە کە خوایە، وە دەشتوانێ دروستی بکاتەوە، خوایەك ئەو کەونە دەگۆڕێت و دروستی دەکاتەوە ئینسانی زەعیفی بێ دەستەڵات چییە جارێکی دیکە دروست نەکرێتەوە؟! ﴿لَخَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ (٥٧) غافر، واتە: دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی گەورەترە لە دروستکردنی ئینسانەکان، ئەگەر ئینسان بزانێ و لێی ئاگاداربێت، کەواتە دروستکردنەوەی ئینسانەکان ئاسانترە لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی.

جا کە فووی ئاخیر لەلایەن ئیسرافیل لێدرا، ئەوهەموو زیندەوەرە بۆ مەیدانی مەحشەر دەڕۆن و ڕادەوەستن، ئەوکاتە چی ڕوودەدات؟ چ دەقەومێ؟ چ

بەسەر ئەوخەڵکە دێت؟ ئەوە لەو وتارەدا باسی ناکەین ، بۆ وتارێکی تر کـە إن شـاءالله خـوای گـەورە پـشتیوان بێـت و مۆڵـەتمان بـدات بەخزمـەتی ئێـوەی بەڕێزدەگەینەوە.

یارەبی خوایە هیدایەتمان بـدەی بۆئـەوەی بتـوانین بەڕاسـتی عیبـادەتی تـۆ بکەین بەرلەوەی بمرین، یارەبی خوایە ئـاخیری عومرمـان خێربکـەی، یـارەبی خوایە لەوکەسانەمان حیساب بکەی کـە بـە مـسوڵمانی دەمانـژیێنی، وە بـە مسوڵمانی دەمانمرێنی، کە بە مسوڵمانی زیندوومان دەکەیەوە، کەلەسەر ئاوی کەوسەر بەدەستی پێغەمبەرﷺ ئاومان دەدرێتێ، خوایە بە بەهەشتی بەرینمان شادبکەی، خوایە لەدۆزەخ بمانپارێزی، یـارەبی خوایـە شـیفای نەخۆشـیەکانمان بێنی و، لـە مردووەکانمـان خۆشـبی، ڕەحـم بـە پیرەکانمـان بکـەی، هیدایـەتی گەنجەکانمان زیاتر بدەی، خوایە ڕەحم بـە مـاڵ و منـداڵمان بکـەی، لـەدایك و باوکمان خۆشبی (یـارب العـالمین)، یـارەبی خوایـە ڕەحـم بـە ئێمـەو تـەواوی مـسوڵمانانی دونیـا بکـەی، خوایـە ئێمـەو هـەموو مـسوڵمانانی دونیـا لـە دەردوبەلای زەمانە بپارێزی.

أمين

أقول قولي هذا وأستغفر الله لي ولكم ولسائر المسلمين، أعوذ بالله من الشيطان الرجيم

{رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ} أمين.

# ئەوکەسانەی لە قیامەتدا بە کوێری حەشردەکرێن

# ئەوکەسانەی لە قیامەتدا بە کوێری حەشردەکرێن

بسم الله الرحمن الرحيم

إنَّ الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونستهديه، ونعوذ بالله مِن شرور أنفُسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضلَّ له ومن يضلل فلا هادي له، ونشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له ونشهد أنَّ سيدنا ونبينا محمداً عبده ورسوله، هذا الرسول الذي بلَّغ الرسالة وأدى الأمانة ونصح الأمة وجاهد في الله حق جهاده وتركنا على المحجة البيضاء، ليلها كنهارها، لايزيغ عنها إلا هالِك، صلواة اللهِ وسلامه عليه وعلى أله وأصحابه، ومن تبعه الى يوم الدين ...، أما بعد يا عبادالله أوصيكم ونفسي أولاً بتقوى الله وطاعته، فإنّ اللهَ مع الذين اتقوا والذين هم محسنون، قال الله سبحانه وتعالى في كتابه الحكيم، بسم الله الرحمن الرحيم: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ (١) النساء.

سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگار، درود و سەلام و بارانی ڕەحمەت بۆسەر گیانی پاکی پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ..، وە بۆسەر گیانی هەموو شوێنکەوتووانی تا ڕۆژی قیامەت.

ئیماندارانی بەڕێز، لە ڕۆژی قیامەتدا کەسانێك هەن کە خوای پەروەردگار بە کوێری حەشریان دەکات و لە مەیدانی مەحشەردا کوێرن!، لەکاتی موحاسەبەکردن دا کوێرن!، لەکاتی وەرگرتنەوەی شەهادەی خۆیاندا کوێرن!، ئەوانە چ کەسانێکن؟ وە بۆچی وایان لێهاتووە؟..، بەکورتی لە وتاری ئەمڕۆی جومعەدا ئەو بابەتە باس دەکەین، خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆز فەرمووی:

﴿وَمَن كَانَ فِي هَذِهِ أَعْمَى فَهُوَ فِي الآخِرَةِ أَعْمَى وَأَضَلُّ سَبِيلاً﴾(٧٢) الإسراء ، واتە: هەرکەسێك لەم دونیایەدا کوێربێت لە قیامەتیشدا بە کوێری حەشری دەکرێت!، عەبدولاّی کوڕی ئوم مەکتوم کە بانگبێژی پێغەمبەر بووﷺ کە گوێی لەو ئایەتە بوو گریا چونکە کوێر بوو!، فەرمووی جامن چۆن لەدونیاشدا چاوم نەبووە لە قیامەتیشدا چاوم نابێت؟! بەلاّم پێغەمبەرﷺ بە وەحی خوای پەروەردگار ئاگاداری کردەوە: ﴿فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ﴾ (٤٦) الحج ، واتە: مەبەست کوێری چاو نییە، کەسێك لەدونیادا کوێر بووبێ لەقیامەتیش بە کوێری حەشربکرێت! کوێری چاو نا – بەو مانایە کە چاوی نەبینێ- مەبەست ئەوەیە ئەگەر چاوی دڵ کوێر بێ ، ئەوکەسەی کە بەدڵ کوێربێ ئەوکەسە لە قیامەتدا بە کوێری حەشری دەکرێت!، بۆیە ئەتوانین بڵێین:

یەکێك لەوکەسانەی لە قیامەتدا بە کوێری حەشری دەکرێت ئەوکەسەیە کە بەدینی خوا ڕازی نی یە! ، دینی خوای کە ئیسلامە قەبوڵ نییە، ڕاستییەکانی ئیسلام نابینێ و لەئاست ڕاستیەکانی دیندا کوێرە، یا بەشێوەیەکی گشتی ئیسلامی قەبوڵ نییە یان بەشێکی لەئیسلام قەبوڵ نییە، ڕەخنەی لە هەموو ئیسلام هەیە یان لە ئایەتێکی قورئان هەیە، یان لە فەرموودەیەکی پێغەمبەر هەیەﷺ، پێی وایە کە ئەو ئایەتە لە جێی خۆیدا نییە، ئەو فەرموودەیە کە فەرموودەی پێغەمبەرەﷺ ڕاست نییە، ئەو ئینسانە کە ڕەفزی ئایەتێك یان فەرموودەیەك دەکات، ڕەفزی ئیجماعی ئیتیفاقی زانایانی ئیسلام دەکات، ئەوە یەکێکە لەوکەسانەی کە لە قیامەتدا بە کوێری حەشری دەکرێت!، جا بەدڵ ڕەفزی بکات یان بە زمان ڕەفزی بکات، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى﴾ (١٢٤) طـه، واتە: هەرکەسێك پشت لە ئیسلام و قورئان بکات و شوێنی ئیسلام نەکەوێت، ڕەخنە لە ئیسلام بگرێت، لە دونیادا ژیانێکی تەنگی دەدەینێ، ژیانی لێ تەسك و تەنگ و تاریك دەکەین، ناڕەحەتی دەکەین

لەدونیادا، بەڵام هەربەوەش لێناگەڕێ دەفەرموێ: لە قیامەتیشدا بە كوێری حەشری دەكەین!، ﴿قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِي أَعْمَى وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا﴾ (١٢٥) طـه ، ئەو ئینسانە لە قیامەتدا پرسیار دەكات، دەڵێ: پەروەردگارم خۆمن چاوم هەبوو لە دونیا، دونیام دەبینی!، چاوم ساغ بوو، بۆ بە كوێری حەشرم دەكەی؟! دیارە هۆكار هەیە بێ حیكمەت نییە، خوا كاربەجێ (حەكیم)ە لەبەرئەوە دەفەرموێ: ﴿قَالَ كَذَلِكَ أَتَتْكَ آيَاتُنَا فَنَسِيتَهَا وَكَذَلِكَ الْيَوْمَ تُنسَى﴾(١٢٦) طـه، واتە: ئاوا ئایەتەكانی ئێمەت لە دونیا بۆ دەخوێنرایەوە، ئیسلامت لەپێش دانرابوو، ئامۆژگاریت كراو بۆت ڕوونكرایەوە {فَنَسِيتَهَا}: تۆش لەبیرەخۆت بردەوەو ملت لێ لادا!، پشتت تێی كرد و بەقسەت نەكرد، ئامۆژگاریت دەكرا بەقسەت نەكردن، پێغەمبەرانم ناردن {علیهم الصلاة والسلام}، ئامۆژگاریان كردن و وەحی خوایان بۆ خوێندنەوە، دونیاو قیامەتیان بۆ ڕوونكردنەوە، بەهەشت و جەهەننەمیان بۆ ڕوونكردنەوە، چاكەوخراپەیان بۆ ڕوونكردنەوە. حەڵاڵ و حەرامیان بۆ ڕوونكردنەوە، بەڵام بەقسەتان نەكردن، لەبیرە خۆتان بردنەوە {وَكَذَلِكَ الْيَوْمَ تُنسَى}: ئاوا ئەتۆش ئەمڕۆ لەبیر دەكرێی، بەكوێری حەشرت دەكرێ!، ﴿وَكَذَلِكَ نَجْزِي مَنْ أَسْرَفَ وَلَمْ يُؤْمِن بِآيَاتِ رَبِّهِ وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبْقَى﴾[١٥٩] (١٢٧) طـه.

بەڵێ خۆشەویستەكانم، خوای گەورە لە قیامەتدا قسە لەگەڵ سێ ئەندامان دەكات بەرلەوەی قسە لەگەڵ ئەندامەكانی تر بكات، ئینسان چاوی هەیە دەست و گوێچكەو دڵ و زمانی هەیە، قاچی هەیە..، ئەوانە هەمووی بەرپرسیارن لە ڕۆژی قیامەت بەڵام پێش ئەوان لەقیامەتدا پرسیار لە سێیان دەكرێت: لە گوێ ، لە چاو، ئینجا لە دڵ، ئەو سێ ئەندامە پێش ئەوانی تر پرسیاریان لێ

---

[١٥٩] واتە: ئا بەو شێوەیە تۆڵە دەكەینەوە لەوكەسەی كە لە سنوور دەترازێت و باوەڕ بە ئایەت و فەرمانەكانی پەروەردگاری ناهێنێت، بێگومان سزای قیامەت زۆر سەخت ترو بەردەوامترە(لە سزای دونیا).

دەکرێ!، بۆیە خوای پەروەردگار لە سورەتی (الإسراء) دەفەرموێ: ﴿إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولاً﴾ (٣٦) الإسراء، واتە: گوێچکە و چاوو دڵ، پێشودختە بەرلە ئەندامەکانی تر بەرپرسیارن، بۆچی؟ چونکە ئەوانە مەرکەزی قەبوڵن، ئەوانە سەرچاوەی قەبوڵکردن یان ڕەفزکردنن!، چونکە دەست ئامێری جێبەجێکردنە، هەتا گوێ قسەیەك وەرنەگرێ و نەچێتەناو دڵ، وە دڵ بڕیاری لەسەر نەدات ئەودەستە جووڵە ناکات!!، نە بۆ چاکە جووڵە دەکات ، نە بۆ خەراپە جووڵە دەکات..، لەبەرئەوە دەست ئامرازی جێبەجێکردنە، دەست تەنفیز دەکات بەلاّم دڵ بڕیاردەدات!، دڵ پایتەخت (عاصمة)ی ئینسانە، مەڵبەندی مەملەکەتی ئینسانە، هەتا دڵ بڕیار نەدات لەسەر چاکە دەست حەرەکە ناکات!، وە زمان حەرەکە ناکات!، وە قاچت حەرەکە ناکات بۆ شوێنێك جا لەسەر چاکە بێت یان لەسەر خراپە بێت! دەبێ دڵ بڕیاربدات، دەبێ گوێچکە قسەیەك ببیستێ وە دڵ فیکری لێبکاتەوە ینجا بە زمان وەلاّمی ئەداتەوە کە ئەو زمانە ئامێری جێبەجێکردنە، بۆیە گوێ و چاوودڵ بەر لە هەموو ئەندامەکان بەرپرسیارن لە ڕۆژی قیامەت!، بەو گوێچکەیەت گوێت لەچی گرتووە؟ چیت وەرگرتووە؟ وەئەوچاوە چیت پێ بینیوە؟ وە ئەو دڵە چ بڕیارت لەسەرداوە؟ ئایا ئەو دڵەت لەپێناوی هەزم کردنی دینی ئیسلام بەکارهێناوە یان باوەشی لە دونیاداوە؟!، بۆیە دەڵێین: کاتێك کە خوای گەورە موحاسەبەی ئەندامەکان دەکات زمان لە ڕۆژی قیامەتدا وەلاّم ناداتەوە، ئەوجار خوای پەروەردگار خەتم لەسەر زمان دەدات:﴿ الْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَى أَفْوَاهِهِمْ ﴾(٦٥) یس ، خەتم لەسەر زمانی گوناهباران و بێ باوەڕان و ستەمکاران دەدات، زمانیان لاڵ دەبێ!، ﴿وَتُكَلِّمُنَا أَيْدِيهِمْ﴾ واتە: ئەوجار دەستەکانیان قسەمان لەگەڵ دەکەن!، وەختێ کە زمان شاهێدی نەداو خۆی کەرو لاڵ کرد ئەوکاتە دەبێ دەست قسەبکات ﴿يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ (٢٤) النور، بەڵێ دەست قسە دەکات، قاچەکان

قسەدەکەن، زمان قسە دەکات، ئەوانە هەموویان قسەدەکەن و شاهێدی لەسەر ئەو ئینسانە ئەدەن، وە گوێ و چاوو پێستیان شاهێدییان لەسەر دەدەن، بۆیە نەفسی ئینسان دێتە قسەو بە پێستەکانیان دەڵێن: بۆ شاهێدیمان لەسەردەدەن؟ ﴿وَقَالُوا لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا﴾ (٢١) فصلت، ئەوانیش دەڵێن: ﴿قَالُوا أَنطَقَنَا اللَّهُ الَّذِي أَنطَقَ كُلَّ شَيْءٍ﴾ (٢١) فصلت، واتە: ئەوخوایە بە قسەی هێناین کە هەمووشتێکی بەقسەخستوە، بەدەست ئێمە نییە!، تەنانەت پێستی ئینسانیش قسە دەکات لەسەر ئەوەی چی کردووە لەدونیا!!، بۆیە خۆشەویستەکانم: وەختێ کە زمان مانیع دەبێ ئەوجار خەتم لەزمان دەدرێ و دوایی دەست و قاچ و شوێنەکانی تر دێنە قسەو قسەدەکەن، بۆیە دەتوانین بڵێین مەسئولیەتی یەکەم دەکەوێتە سەرشانی دڵ!، ئەوجار گوێچکەو چاوو ئەندامەکانی تری ئینسان.

کەواتە ئەوانە لە قیامەتدا بەکوێری حەشریان دەکرێ ئەوکەسانەن کە چاویان کوێرە کە گوێیان کوێرە، وە دڵیان کوێرە!، خوای پەروەردگار لە سورەتی (الأعراف) دا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ الْجِنِّ وَالإِنسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لاَّ يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لاَّ يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لاَّ يَسْمَعُونَ بِهَا﴾ (١٧٩) الأعراف، واتە: بۆ دۆزەخمان دروستکردوون و ئامادەکردوون (کە سوتەمەنی جەهەننەمن) زۆر لە جنۆکەو ئینسان کە دڵیان هەیەو پێی تێناگەن، حەق وەرناگرن، بیر لە حەق ناکەنەوە، حەق و ناحەق لێك جیاناکەنەوە!، ﴿وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لاَّ يُبْصِرُونَ بِهَا﴾: چاویان هەیە بەڵام بەچاو حەق نابینن و حەق و ناحەق لێك جیاناکەنەوە، بەیەك چاو تەماشای حەق و ناحەق دەکەن، ﴿وَلَهُمْ آذَانٌ لاَّ يَسْمَعُونَ بِهَا﴾: گوێچکەیان هەیە بەڵام بە گوێ حەق وەرناگرن و گوێ لە حەق ڕاناگرن، لەناحەق بەکاری دێنن، حەق و ناحەق تێکەڵ دەکەن، ﴿أُوْلَئِكَ كَالأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُوْلَئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ﴾: ئەوانە وەکو ئاژەڵ و ماڵات وان بەڵکو سەرلێشێواوتریشن!، ئەوانە بێئاگان!.

چۆن دڵ کوێر دەبێ؟، ئایا دڵ چاوی هەیە هەتا کوێربێ؟!، بەڵێ دڵ کوێر دەبێ: ﴿فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ﴾ (٤٦) الحج، دڵی کوێر ئەو دڵەیە کە ئیمانی تێدا نییە، کە خواناسینی تێدانییە، کە داهاتووی خۆی نازانێ، دڵی کوێر ئەو دڵەیە کە قورئان کاری تێناکات!، قورئانی بەسەردا دەخوێندرێتەوە کاری تێناکات، ئەو قورئانەی کە بەسەر بەردو شاخ و چیاکاندا لەدونیا بخوێندرێتەوەو نازڵ ببێ پارچە پارچە دەبن!، ﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَذَا الْقُرْآنَ عَلَى جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُ خَاشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ اللَّهِ﴾ (٢١) الحشر، واتە: ئەگەر ئەو قورئانە نازڵ بکەین بەسەر شاخ و چیاکاندا، ئەو چیایانە لەترسی خوا پارچە پارچە دەبن!، خوا ئەفەرموێ: ﴿وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ وَمَا يَعْقِلُهَا إِلَّا الْعَالِمُونَ﴾(٤٣) العنكبوت، واتە: ئەو نموونانە بۆ خەڵك دێنینەوە بەلاّم عاقڵ و بیرمەندەکان نەبێ تێناگەن و بیری لێناکەنەوە!، بەڵێ ئەو قورئانەی کە بەسەر شاخدا نازڵ ببێ پارچە پارچە دەبێ بەلاّم ئەو دڵە کاری تێناکات!!، ئەو دڵەی کە قورئان کاری تێناکات لە بەرد ڕەقترە!، بۆیە کاری تێناکات!.

بۆچی قورئان بەرد پارچە پارچە دەکات بەلاّم تەئسیر لە دڵ ناکات؟! ئەو دڵەی کە قورئان تەئسیری تێناکات لە شاخ و بەرد و چیاکان ڕەقترە! ئایا دەبێ دڵ لە بەرد ڕەقتر بێ؟ بەڵێ خوا نموونەمان بۆ دەهێنێتەوە لەسەردەمی یەکێك لە پێغەمبەراندا کە حەزرەتی موسایە کە بەنوئیسرائیل چۆن دڵیان ڕەق بووە؟ وەختێ کە لە دەشتێکدابوون داوای ئاویان کرد، داوای خواردنیان کرد، داوای سێبەریان کرد...، خوا هەموو ئەوانەی بۆناردن: هەوری بۆ ناردن سێبەریان لەسەر بکات، خوای پەروەردگار فەرمانی بە حەزرەتی موسا کرد کە بە گۆچانەکەی لەبەرد بدات ئەوبەردە شەق بوو دوانزە کانیاوی لێ هاتەدەرەوە، دوانزە تیرە بوون هەر تیرەیەك چویە سەر کانیاوەکەی خۆی و ئاوی لێ خواردەوەو مەڕو ماڵاتەکەیان تێرکرد، ئیحتیاجیاتی خۆیان پێکرد، ئینجا داوای خواردنیان کرد خواردنیان لە ئاسمانەوە بۆ هاتەخوارەوە، داوای سێبەریان

کرد هەوریان بۆهات سێبەریان لەسەریکات ئینجا ئەوان هەر مانیع بوون و ناسوپاسگوزار بوون بۆیە خوای پەروەردگار غەزەبی لێگرتن!، ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّن بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِيَ كَالْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً﴾ (٧٤) البقرة، واتە: دڵتان ڕەق بوو (ئەی بەنی ئیسرائیل) لەبەرد ڕەقتر!!، دڵێك لەبەرد ڕەقتر بێت دەبێ چۆن بێت؟!{أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً}،﴿وَإِنَّ مِنَ الْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ الْأَنْهَارُ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ الْمَاءُ﴾ (٧٤) البقرة واتە: بەردی واهەیە ڕووباری لێ دێتەدەرەوە وەکو ئەو بەردەی کە حەزرەتی موسا شەقی کردووە!، بەردی واهەیە شەق دەبێ و ئاوی لێ دێتەدەرەوە! بەردی واهەیە لە ترسی خوا لەت لەت دەبێ و دەتوێتەوە ﴿وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ (٧٤) البقرة، واتە: بەردی واهەیە لە ترسی خوا دەتوێتەوە!، ئەی بۆ دڵی ئینسان قورئان کاری تێناکات؟! ئەی بۆ دڵی ئینسان کە ئایەتی بەسەردا ئەخوێندرێتەوە نالەرزێ؟!، دڵی ئیماندار ئەو دڵەیە: ﴿إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا﴾ (٢) الأنفال، واتە: وەختێ کە خوای پەروەردگار باسکرا دڵی دەلەرزێ و دەترسێ! وە کە ئایەتەکانی بەسەردا خوێندرانەوە ئیمانیان زیاد دەبێ، بەڵام دیارە ئەوانەی کە قورئان تەئسیریان تێناکات دڵیان لە بەرد ڕەقترە!.

بەڵێ خۆشەویستەکانم، بۆیە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُ قَلْبٌ﴾ (٣٧) ق، واتە: ئەو قورئانە ئامۆژگاریە بۆ کەسانێك کە دڵیان هەبێ، واتە دڵێکیان هەبێ بیری لێ بکاتەوەو وەری بگرێ، بۆیە خۆشەویستەکانم زۆر جار ئەوکەسانەی کە حەزیان لە گوێگرتن لە قورئان نییە، حەزیان لە گوێگرتن لە ئامۆژگاری نییە، بە گوێگرتن لە ئیسلام نارەحەت دەبن و تێکدەچن! خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَحْدَهُ اشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ﴾ (٤٥) الزمر، واتە: وەختێ کە باسی خوا کرا، باسی دین کرا، ئەوانەی کە باوەڕیان بە خوا نییە، باوەڕیان بەڕۆژی قیامەت نییە یان

زەعیفە..، دڵیان دەگوشرێ و تێكدەچێ و ناڕەحەت دەبن!، ئەتۆ ئەتوانی تەجروبەی بكەی كەسێك كە باسی ئیسلام و دینت بۆ كرد و پێی خۆشبوو ئەوە دیارە ئەو ئینسانە مسوڵمانە، وەكو چۆن مسوڵمان پێی خۆشە، خوا ئەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ آمَنُواْ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ اللّهِ﴾ (٢٨) الرعد، واتە: دڵیان بە زیكری خوا ئارام دەبێ ، وەختێ كە باسی خوا كرا دڵیان مطمئن دەبێ و دەكرێتەوە.

بەڵام ئەگەر دڵی بە ئیسلام تێكچوو، دڵی بە ئامۆژگاریەكانی ئیسلام و گوێگرتن لە قورئان تێكچوو و ناڕەحەت بوو، ئەوا ئەوكاتە بزانە كە ئەو ئینسانە دڵی ڕەق و كوێرە!، زۆرجار بینیومانە زۆركەس كەكاتێك مامۆستایەك وتار دەدات و ئامۆژگاری دەكات هی وا هەیە حەزی لە ئامۆژگاریەكە نییە هەڵدەستێ لە مەجلیسەكە دەڕوات و دەچێتە دەرەوە!، مەجلیسەكە بەجێدەهێڵێ یان خۆی مەشغوڵ دەكات بە تەنیشتی خۆی بۆئەوەی كە گوێی لە قسەكانی مامۆستا نەبێت!، ئەوە دڵی ڕەش بووە، دڵی ڕەق بووە، ﴿كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ (١٤) المطففين، واتە: بەهۆی ئەوەی كە زۆر گوناهی كردوون دڵی مۆری لێدراوە و دڵی ڕەق بووە، كەمرەو ژەنگی لێ نیشتووە، دڵی ڕەش بووە: ﴿خَتَمَ اللّهُ عَلَى قُلُوبِهمْ﴾ (٧) البقرة.

بەڵێ خۆشەویستەكانم: جا ئەگەر دڵ ڕەق بوو ئینسان وای لێدێ گوناه بكات یان نەیكات، گوناه ببینێ یان نەیبینێ پێی تەبیعی یە!!، بەداخەوە زۆرجار ئێمەی مسوڵمانیش وامان لێدێ، بەلای ئافرەتی ڕووت دا تێدەپەڕین پێمان شتێكی زۆر ئیعتیادی یە!، شتێك بە دڵماندا نایەو ناڕەحەت نابین!، بەلای مەشروباتدا تێدەپەڕین دڵمان هیچ ناكات و ناڕەحەت نابین!، بەلای زوڵم دا تێدەپەڕین دەبینین زوڵمێكەو دەكرێ پێمان شتێكی تەبیعی یە!، بەلای گوناهدا تێدەپەڕین پێمان تەبیعی یە، نەهی لە خراپە ناكەین و فەرمان بە چاكە ناكەین!، بەلای سوكایەتیكردن بەدین تێدەپەڕین پێمان تەبیعی یە!!، ئەوە هەمووی هۆكارەكەی چی یە؟ هۆیەكەی ئەوەیە دڵمان ڕەق بووە!!، دڵمان

ئیمانی تێدا لاواز بووە پێویستی بە شەحن کردنەوە هەیە، چونکە ئـەو ئیمانـە زیاد دەکات و کەم دەکات!، بە ئەندازەی ئەوەی گوێ لە قورئان بگری، گوێ لە ئامۆژگاری دینی بگری و هاتوچۆی مزگەوت بکەی عیبادەتت زیادبکەی ئیمان زیاد دەکات، بەئەندازەی ئەوەی کـە لـە قورئـان دوور بیـت و لـە مزگـەوت و مسـوڵمانان دووربیت، وە لە ئامۆژگاری مسـوڵمانان دووربیت و عیبادەتت کـەم بێت یان گوناهان بکەی...، ئەو دڵە ڕەق دەبـێ ، ئـەو ئیمانـە زەعیـف و لاواز دەبێت وە ئەوشەیتانە زیاتر کاریگەری خۆی دەکات لەسەر دەروونی ئینسان.

جا ئەگەر دڵ ڕەق بوو بێگومان شـوکری خـوا ناکـات، ئەگـەر دڵ کـوێر بـوو قەناعەتی نابێت، صەبری نابێ لەسـەر بەڵاوموصـیبەت، ئەگـەر هـەر بەڵایـەکی بۆهات تووشی گوناه دەبێ!، زمانی قسەی ناشیرین دەکات و ناشکور دەبێت، بـە نەخۆشی وبەڵا ناشکور دەبێ، نـاتوانێ سـەبربگرێ لەسـەر عیبـادەت و نـەکردنی گوناه ، وەهەروەها تووشی نیفاق دەبێ، جاری واهەیە دڵ درۆ لەگەڵ زمان دەکات دڵ شتێکی تێدایە زمان شتێکی تر دەڵێت!، خوا سەبارەت بەوکەسانە دەفەرموێ: ﴿يَقُولُونَ بِأَفْوَاهِهِم مَّا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ﴾ (١٦٧) آل عمران، واتە: بە زمـان شـتێك دەڵێن بەڵام شتێکی تریان لە دڵدایە!، لەبەرئەوە کاتێك کە دڵ کوێر بوو وادەکات کە لەگەڵ زمانیشدا موافیق نەبێ و درۆ لە گەڵ زمانی خۆیشی دەکات.

خۆشەویستەکانم، ئەوە ئەگەر دڵ کوێر بوو، ئەی ئەگەر چاو کوێربوو!، ﴿وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لاَّ يُبْصِرُونَ بِهَا﴾ (١٧٩) الأعـراف، واتە: چاویان هەیە بەڵام حەق بەچاوی خۆیان نابینن!، حەق و ناحەق تێکەڵ دەکات، ئەو چاوە بۆئەوەیە ئینسان ڕێگای هیدایەتی خۆی بدۆزێتەوە، خوائەفەرموێ: ﴿وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ﴾ (١٠) البلـد، واتە: ڕێگای ڕاسـت و خراپمان بـۆ ئینسـانەکان ڕوونکردۆتـەوە، دەی ئـەو چـاوە بۆئەوەیـە ئینسـان ڕێگـای ڕاسـت بزانـێ و ڕێگـای چـەوت بزانـێ نەکەوێتـە هەڵدێرەوە، نەکەوێـتە تەلان و هەڵەمووتەوەو هەڵنـەدێرێ!، بۆئـەوەی بۆخـۆی بەرپێی خۆی ببینێ و بەرپێی خەڵکیش ڕوون بکاتەوە، دەستی خەڵکیش بگرێ،

بەلاّم کەسێك بۆخۆی ڕێگای خۆی نەزانێ بەتەئکید ناتوانێ ڕێگا بە خـەڵکیش نیشان بدات چونکە کـوێر بۆخـۆی کـوێرەوەری هەیـە چـۆن ئـەتوانێ خـەڵکی هیدایەت بدات، ژیانی ئەوکەسانەش کە شـوێنی دەکـەون تووشـی کـوێرەوەری دەکات، دیارە مەبەست کوێری دڵە، کوێری بەو مانایە کە ئیلتیـزام بـە دیـنی ئیسلامەوە ناکات، بەڵێ وەختێ کە چاو کوێربوو بەیەك چاو تەماشای حەلاڵ و حەرام دەکات، قسەی چاك و خراپ وە حەق وناحەق و پیاوی چاك و خراپ لێك جیاناکاتەوە، لەیەك تەرازوویان دادەنێ!، ناڵێ ئەوە پیاوی چاکەو قسەی چـاکی کردووەو کردەوەی چاکی کردووە بەپێی شەریعەتی ئیسلام پێویستە من مەدحی بکـەم، نـا لەبەرئـەوەی کـە خزمیـەتی یـان دۆسـتیەتی یـاخود مەسـڵەحەتی پاراستووە، یان لەبەرئەوەی کە موعامەلەی لەگەڵدایە و وەزیفەکەی پاراستووەو دیفاعی لێکردووە دیفاعی لێدەکات، ناڵێ ئەوە چەندە لە ئیـسلام نزیکـە یـان دوورە!!، لەبەرئەوە ئینسان ئەگەر حەق و ناحەقی بەچـاو لێـك جیـا نـەکردەوە بەپێی شەریعەتی ئیسلام ئەوا ئـەو ئینـسانە بـەکوێری ناودەبرێـت و یەکێکـە لەوکەسانەی کە بەکوێری حەشر دەکرێت، ئەوە کوێری چاوە.

ئینسانی چاوساغ ئینسانێك کە چاوی کوێر نەبێ دەبێ عیبرەت لە دەوروبەری خۆی وەربگرێ، دەبێ عیبرەت لە نیعمەتـەکانی خـوای پـەروەردگار وەربگـرێ و تەماشای نیعمەتەکان بکات، دڵی بـە نیعمەتـەکانی خـوا بکرێتـەوە، تەماشـای خۆی بکـات ئـەو نیعمەتانـەی خـۆی بهێنـە بەرچـاو، ئـەو نیعمەتانـەی خـوای پەروەردگار کە پێی داون: چاو، دەست، زمـان، دڵ..، ئـەوە هـەمووی نیعمـەتی خوان، بۆ چاو نابینێ!! ﴿فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ﴾ (٥) الطارق، واتە: با ئینـسان تەماشـا بکـات لەچـی دروسـت بـووە؟!، لـە صـەحیحی بوخـاری دا هـاتووە پێغەمبەر ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ[١٦٠]: ڕۆژێك خوای پەروەردگار ویستی

[١٦٠] شعب الأيمان (الطبعة الأولى- بيروت) ، فصل/ ما جاء في كراهية رد من جاء سائلاً رقم الحديث ٣٤٠٢

سێ کەسان تاقی بکاتەوە، سێ کەس هەبوون: یەکیان کوێربووە، یـەکیان کەچـەڵ بووە (سەری رووتاوەتەوە)، یەکێکیـشیان جـسمی بەڵـەك بـووە!، خـوای گـەورە یەکێك لە مەلائیکەتەکان دەنێرێ بۆئەوەی کە تاقیان بکاتەوە، ئەو مەلائیکەتـە دەچێتە لای هەرسێکیان..، دەچێتە لای کوێرەکـە پێـی دەڵـێ: تەمـەننای چـی دەکەی لە دونیا؟ ئەویش دەڵێ: دەمەوێ چاوم هەبێت، نیعمەتی دونیـام هـەموو لێ حەرام بووە، کە چاوم نەبێ پێم وایە دونیام نییە!، پێم خۆشە چاوم هەبێ، ئـەو مەلائیکەتە دوعای بۆ دەکات و خوای پەروەردگار چاوی ئەداتـەوە، وە دوعاشـی بۆدەکات مالاّتیشتی بداتێ بۆئەوەی کە پێی بژیێ، دەچـێتە لای کـابرای بەڵـەك بەهەمان شێوە لێی دەپرسێ: تەمەننای چی دەکەی؟ ئەویش دەڵێ: خەڵك گاڵتەم پێدەکات بەڵەکم جسمم تەواو نییە، پێستەکەم باش نییە دەمەوێ پێـستەم وەکـو هی ئادەمیزادەکان بێت، دوعـای بۆ دەکات و چاك دەبێتەوەو خـوای پـەروەردگار (وەکو تاقیکردنەوە) مالاّتیشی دەداتێ!، وەهەروەها ئەوەی تریشیان کـە کەچـەڵ بووە و سەری رووتاوەتەوە بەهەمان شێوە..، پاش چەند ساڵێك خوای پەروەردگار ئەو مەلائیکەتە دەنێرێتەوە بۆلای هەرسێکیان کـە دەوڵەمەنـدبوون، دەچـێتەلای کابرای بەڵەکەکە پێی دەڵێ: ئەوە من هاتووم موسافیرم لـێم قـەوماوە هاتوومـە لەو مەرو مالاّتەی شـتێکم بـدەیێ، ئـەتۆ خـوای پـەورەردگار نیعمـەتی لەگـەڵ کردووی کاتی خۆی ئاواو ئاوا بووی بەلاّم ئێستا خوا چاکی کردوویتەتەوە..، ئـەو ئینسانە دەڵێ: نەخێر من لە باب و باپیرانمەوە هەر دەوڵەمەند بووم و، ئـەو نـازو نیعمەتەش کە هەمە هی خۆمەو بەخۆم پەیدام کردووە، بەهەمان شـێوە دەچـێتە لای کابرای سەر رووتاو ئەویش بەهەمان شـێوە هـەر ئـەو وەلاّمـە ئەداتـەوە..، دەچێتەلای کوێرەکەو پرسیاری لێدەکات دەڵێ : هاتووم ئەگەر خێرێکم پێ بکەی موسافیرم ، ئەویش پێی دەڵێ: راستە خوای پەروەردگار ئەو چاوە ساغانەی بەمن دانەوە کە پێشتر کوێر بووم، ئەو نـازو نیعمـەت و مەرومالاّتـەش کـە ئـەیبینی هەمووی نیعمەتی خوایەو خوا بەمنی بەخـشی کـە هـەژار بـووم، بـڕۆ هەرچـی

دەتەوێت هەڵبژێرەو چەندەی دەتەوێ بیبە!، ئەو ئینسانە بە چاوی ڕاستەقینەوە تەماشا دەکات، بەڵێ ئەو مەلائیکەتە دەڵێ: ئەوە من تەنها هاتووم بۆ تاقیکردنەوەتان، ئەوە ئەتۆ خۆت و نیعمەتەکانت بەردەوام بێ بەلاّم ئەو دوانەی تر وەکو خۆیان لێبێتەوە، خوای پەروەردگار وای کرد کە ئەو کوێرە خوا چاوی ساغی دایەوەو بەو نازو نیعمەتەی شادکرد بەلاّم ئەوانیتر وەکو خۆی لێکردنەوە ماڵیشی لێ سەندنەوەو توشی نەخۆشیشی کردنەوە!.

ئەوە فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ کە ئینسان ئەگەر نازو نیعمەت بەچاوی خۆی نەبینێ و تەماشای خۆی نەکات، شوکر نەکات لەسەر نیعمەتەکانی خوای پەروەردگار خوا دەستەلاّتی هەیە لە دونیاشدا لێمان بسێنێتەوە بەرلەوەی لە قیامەتدا موحاسەبەمان بکات.

بەڵێ خۆشەویستەکانم: چاوی کوێر ئەو چاوەیە کە بە بینینی مسوڵمان و سەرکەوتنی نارەحەت بێ، وە بە موقەددەساتی ئیسلام نارەحەت بێ، چاوی بە مسوڵمان هەڵنەیەت!، چاوی بە حەق هەڵنەیەت!، ئەو چاوە کوێرەو لە قیامەتدا بەکوێری حەشری دەکرێت، بۆیە ئینسانی مسوڵمان دەبێ بە بینینی مسوڵمانان بگەشێتەوە، وە بەبینینی سوننەتی پێغەمبەرﷺ دڵخۆش بێت، کە ئەبینێ کەسێك ڕاستی دەڵێت زۆر دڵی پێ خۆش بێت، کە ئەبینێ کەسێك نوێژدەکات دڵی پێ خۆش بێت، کە ئەبینێ مسوڵمانێك لە خۆشیدایە یان دەوڵەمەند دەبێ دڵی پێ خۆش بێت، بە پێچەوانەوە دیارە ئەوچاوە کوێرە!.

بەڵێ خۆشەویستانم، ئەی ئەو گوێ یەی کە کوێرە!، ئەو گوێچکەیە کوێرە وەختێ کە گوێی لە قورئان دەبێ یان وەختێ کە گوێی لە حەق دەبێت پێی نارەحەت دەبێ!، وەختێ کە ئامۆژگارییەکی دەکرێت پێی نارەحەت دەبێ، خوا ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُ اتَّقِ اللَّهَ أَخَذَتْهُ الْعِزَّةُ بِالإِثْمِ فَحَسْبُهُ جَهَنَّمُ وَلَبِئْسَ الْمِهَادُ﴾ (٢٠٦) البقرة، واتە: ئەوکەسە ئەهلی نیفاقەو دووڕووە کە کاتێك پێی دەگوترێ لەخوا بترسەو پارێزی لێ بکە خۆیەزل دەگرێ!. هەرکەسێك ئامۆژگاری

کرا پێی ناخۆش بوو، قسەی حەقی پێ گوترا پێی ناخۆش بوو ئەوا یەکێك لە صیفاتی نیفاقی تێدایە کە خۆبەزلزانینە (خوا بمانپارێزێت).

برای بەڕێزم: هەر مسولمانێك ئامۆژگاریت بکات پێت خۆش بێت! وەلاهی لە گەورەترین نیعمەتی خوا کە بە تۆ ببەخشرێ لە دونیا ئامۆژگاری خێروچاکەیە!، مالی دونیا ڕاستە نیعمەتی خوایە بەلام نیعمەتی گەورە نی یە، یەکێك لە گەورەترین نیعمەتەکان ئەوەیە لە دونیادا کەسێك ئامۆژگاری چاکەت بکات ئەوە نیعمەتێکی گەورەی بەتۆ داوە!، ڕێگای بەهەشتێت نیشان بدات ئەوە لە گەورەترینی نیعمەتەکانە! ئیمانت لەدلدا بچەسپێنێ و قسەیەکی خێرت بۆ بکات جا بتناسێت یان نەتناسێ ئەوە باشترین چاکەی لەگەل تۆ کردووە!، خوای گەورە هیدایەتی داوە لەسەر دەستی ئەو نیعمەتێکی گەورە بەتۆ ببەخشرێ چونکە ڕێگای بەهەشتی نیشانداوی، ئەگەر لە حەرامێکت دوورخاتەوە نیعمەتی باشی لەگەل تۆ کردووە، چونکە تۆش ئەگەر ئەو نیعمەتە گەورەیە قەبول نەکەی بێ وەفاو سپلەی، جاهیل و نەفامی!، لەبەرئەوە ئەو نیعمەتە گەورەیە قەبول بکە خۆ ئەگەر قەبولی نەکەی و خۆبەزل بگری یەکێك لە صیفاتی نیفاقت تێدایە، لەبەرئەوە پێت خۆش بێت هەرکەسێك ئامۆژگاریت بکات، وە هەرکەسێك ئامۆژگاریت بکات لەسەر چاوی خۆتی دابنێ و بلێ زۆر مەمنون، زۆر سوپاست دەکەم مادام لەبەر خاتری خواتە خوا خێرت بنوسێت!، وە ئەو کەسەش کە ئامۆژگاری دەکات بەڕاستی دەبێ زۆر دلی بەوە خۆش بێت کە ئامۆژگاری مسولمانێکی کردووە...، پێغەمبەر ﷺ بە ئیمامی عەلیی دەفەرموێت: (لَـئِن يَهدِيَ اللّهُ بِهُداكَ رَجُلاً واحِداً خيرٌ لَكَ من حمر النَّعم)[١٦١] واتە: ئەگەر خوای گەورە لەسەر دەستی تۆ کەسێك مسولمان بکات، تۆ بکاتە هۆکاری ئەوەی لە حەرامێکی بگێڕێتەوە، بۆتۆ لە دونیاو لە هەرچی تێیدایە باشترە!، جا بەڕاستی

---

[١٦١] حلية الأولياء (الطبعة الرابعة- دار الكتاب العربي)/ علي بن أبي طالب، جزء ١ ، صفحة ٦٢

نیعمەتی گەورە ئەوەیە كە ئینسان بەهرەمەند بێت لە ئاموٚژگاری خەڵك وە گوێ لە ئاموٚژگاری خەڵك بگرێت و خوٚبەگەورەزانین(تكبُر)ی نەبێت كە ئەگەر ماموٚستایەك ڕێگای ئاموٚژگاری پێ نیشان بدات.

لە كوٚتاییدا دەڵێم: با ئێمە دڵمان بە نووری ئیسلام و قورئان زیاتر ڕوٚشنا بكەینەوە، هەتا گوێ لە قورئان بگرین زیاتر ئیمانمان زیاد دەكات، هەتا هاتوچوٚی مزگەوت بكەین ئیمانمان زیاد دەكات و دڵمان زیاتر بە نووری ئیسلام دەدرەوشێتەوە، بە ئەندازەی هاتوچوٚكردنی جومعەو جەماعەت و گوێ گرتن لە وتاری جومعە، گوێگرتن لە وتاری ماموٚستایان، نزیكبوونەوە لە مەجلیسی ماموٚستایان و پیاوچاكان ئینسان ئیمانی زیاد دەبێت و دڵی مطمئن دەبێت، وە ئینسان لە كوێریی دڵ دەپارێزرێت، ئینجا هەتا گوێبگرین لە قورئان ئەو گوێیەمان زیاتر وادەكات بەهوٚی دڵەوە كە بەیەكەوە پەیوەستن و پەیوەندییان پێكەوە هەیە بتوانن چاكە بكەن و فەرمان بە چاكە بكەن، چونكە ئەگەر دڵ ئیمانی تێدا چەسپا وچاك بوو ئەوكاتە دەستیش باش دەبێت، قاچ و زمان و چاویش باش دەبن: وە بە چاوەكانیشمان عیبرەت وەربگرین لە دەوروبەری خوٚمان ئینسان كە تەماشای مەخلوقاتی خوا دەكات ئیمانی پێ زیاد دەبێ بەهوٚی چاوەوە!، تەماشاكردنێكی ورد بە چاو پاشان بیركردنەوەیەكی چاك بە مێشك و، پاشان بڕیاردان بە دڵ ئیمان زیاد دەكات!، ئەوكاتە هەموو ئەندامەكانمان سەلامەت دەبن و هەموو ئەندامەكانمان لەخێر كاردەكەن و خوٚیان لە گوناهان دەپارێزن.

جا لە خوای پەروەردگار داواكارین و دەپاڕێینەوەو دەڵێین: یاڕەببی خوایە ئیمانمان لەدڵدا زیاتر بچەسپێنی، ئیمانمان زیاتر لەدڵدا جوٚش بدەی، خوایە خوٚشەویستی خوٚت و خوٚشەویستی پێغەمبەرەكەت و دینەكەت زیاتر لەدڵماندا بچەسپێنی، خوایە هەرچی كەتوٚ پێت ناخوٚشە لەدڵمان بیبەیە دەرەوە، یاڕەببی خوایە هیدایەتمان بدەی بوٚئەوەی بەزمان و دەست و گوێچكەمان ، بە دەست و

قاچمان چاکە بکەین یا رب العالَمین، خوایە شیفای نەخۆشیەکانمان بهێنی، خوایە لە مردووەکانمان خۆش بی، خوایە هیدایەتی هەموولایەکمان بدەی، خوایە خۆمان و میللەتەکەمان لەژێر ئالاّو سێبەری ئیسلام بحەسێنیەوە، یارەببی خوایە خۆمان و میللەتەکەمان لە دەردو بەلاّو نەهامەتی ئەو زەمانە بپارێزی، یارەببی خوایە هەموو مسوڵمانانی دونیا لە دەردو دەردەسەری بپارێزی، ڕزگاریان بکەی لەدەستی زوڵم و ستەم یا رب العالَمین، خوایە لە مردووەکانمان خۆش بی، خوایە هیدایەتی گەنجەکانمان بدەی، خوایە دوعای پیرەکانمان قەبوڵ بکەی، یارەبی خوایە لە مردووەکانمان خۆش بی، خوایە شیفای نەخۆشیەکانمان بهێنی، خوایە بە مسوڵمانی بمانژیێنی و بە مسوڵمانی بمانمرێنی.

ئامیـــن

أقول قولي هذا وأستغفر الله لي ولكم ولسائر المسلمين أجمعين،

وبعد أعوذ بالله من الشيطان الرجيم

{رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ} أمين.

## سوپاس و پێزانین

جێی خۆیەتی سوپاسێکی گەرمی هەموو ئەو کەسانە بکەم کە هاریکارو یارمەتیدەرم بوون بۆ بەجێگەیاندنی ئەم کارو پرۆژەیە ئەگەر بە سەرنج و پێشنیارێکیش بێ، بەتایبەت سوپاسی جەنابی مامۆستا علی باپیر و مامۆستا حەسەن بابەکر دەکەم کە ئەرکی پێداچونەوە و ڕێڕوونییان گرتە ئەستۆ.

وەهەروەها دەستخۆشی لە کاك موسلیم ی بەرام و کاك سەلاحەدینی پوورزام دەکەم کە ئەرك و ماندوبوونی باشیان کێشا لە تایپکردنی وتارەکان، وەهەروەها مامۆستا شاخەوان کە دیزاینی ناوەوەی کتێبەکەی جێبەجێ کرد، خوای کارزان (سبحانه وتعالى) پاداشتی بەخێری هەموان بداتەوە.

ئامادەکار

شەهید مامۆستا عبداللە قەسری لە چەند وێنەیەك دا



کوڵبژێرێک لە وتارەکانی شەهید مامۆستا عبداللە قەسرێ



## گوڵبژێرێک لە وێنەکانی شەهید مامۆستا عبداللە قەسرێ



## پەراوێز


شەهید مامۆستا (عبداللە قەسرێ)

# شەهید مامۆستا عبداللە قەسری لە چەند دێڕێکدا:

- ناوی (عبدالله رسول أحمد)ە،لە ساڵی 1968 لە گوندی (ناوخان)ی دۆڵی (باڵەییان)ی سەر بە پارێزگای (هەولێر) لە دایك بووە .

- زۆربەی زانستە شەرعییەکانی لای مامۆستایانی دەوروبەری هەولێر تەواو کردوە و وتاربێژێکی لێهاتوو بووە .

- لە ساڵی 1990 تێکەڵ بە کاری سیاسی ئیسلامیی بووە و لە بزووتنەوەی ئیسلامیی پێشوو ماوەیەك بەرپرسی مەڵبەندی هەولێر و دواتر بەرپرسی مەڵبەندی ڕانیە بووە .

- لە ساڵی 1998 بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە کۆلێژی شەریعەی دهۆك بە دەستهێناوە .

- لە کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستاندا ئەندامی مەکتەبی سیاسی بووە و ڕۆڵی بەرچاوی هەبووە .

- لە 1ی محرمی 1424ی کۆچی بەرامبەر 4/3/2003ی زایینی خۆی و چوار لە پاسەوانەکانی لە بازگەی (تاسلوجە)ی سلێمانی شەهید کرا.

چاپخانەی ڕۆژهەلات/هەولێر